# سیاسەتی شەرعی

## بۆ چاککردنی بەرپرسان وخەڵکی

السِّيَاسَةُ الشَّرْعِيَّة فِي إِصْلَاحِ الرَّاعِي وَالرَّعِيَّة


نوسینی پێشەوا وشێخی ئیسلام

ئیبن تەیمییە رحمه الله

وەرگێڕانی

عثمان أحمد حاتم



چاپی دووەم

المحرم ١٤٤٢ك

# سیاسەتی شەرعی

## بۆ چاکگردنی بەرپرسان وخەڵکی

السِّيَاسَةُ الشَّرْعِيَّة فِي إِصْلَاحِ الرَّاعِي وَالرَّعِيَّة


نوسینی پێشەوا وشێخی ئیسلام

ئیبن تەیمییە رحمە اللّٰه

وەرگێڕانی

عثمان أحمد حاتم



چاپی دووەم

المحرم ١٤٤٢ك

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی چاپی یەکەم

إِنَّ الْحَمْدَ لِلَّهِ ، نَحْمَدهُ وَنَسْتَعِينهُ وَنَسْتَغْفِرهُ ، وَنَعُوذُ بِاَللَّهِ مِنْ شُرُور أَنْفُسنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا مَنْ يَهْدِهِ اللَّه فَلَا مُضِلّ لَهُ ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلَا هَادِي لَهُ وَأَشْهَد أَنْ لَا إِلَه إِلَّا اللَّه وَحْده لَا شَرِيك لَهُ ، وَأَشْهَد أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْده وَرَسُوله.

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾(آلِ عِمْرَانَ).

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾ ﴾(النِّسَاءِ).

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَـٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ (الأَحْزَابِ).

أَمَّا بَعْد : فإنّ أصْدَقَ الحَديثِ كتابُ اللَّهِ ، وخَيرَ الهَدي هَدْيُ محمَّدٍ ﷺ وشرَّ الأمُورِ مُحْدَثاتُها ، وكلَّ مُحْدَثَةٍ بدعةٌ ، وكلَّ بدعةٍ ضَلالَةٌ ، وكلَّ ضَلالَةٍ فِي النَّارِ ؛ وبعد :

سياسەت هونەری بەڕێوەبردنی ئیش وكاری خەڵك وڕاپەڕاندنی ئەرك وبەجێ هێنانی ماف وپاراستنی سنورەكانە ، سیاسەتی شەرعیش هەموو ئەو مانایانە لـە خۆ دەگرێت بە مەرجی ملكەچ كردن وگونجاندنی شتە دونیایی وتازەكانی سەردەم بۆ ڕێنماییەكانی شەریعەت نەك بە پێچەوانەوە ، چونكە لـە ئاینی ئیسلامدا هەموو بوارەكانی ژیان گرنگیان پێدراوە ، بواری پەرستش وبەڕێوەبردن وچۆنییەتی هەڵسوكەوت كردن لـەگەڵ خەڵك ، وپەیوەندی خەڵك بەحكومەت وحكومەت بەخەڵك وپەیوەندیە نێو دەوڵـەتیەكان ...هتد.

لـە كۆندا سیاسەت بە مانای باش بەڕێوەبردنی خەڵك وڕەچاوكردنی دادپەروەری بووە ، بەڵام ئێستا سیاسەت لای زۆربەی خەڵك مانای درۆ وفێڵ وبەجێ نەهێنانی پەیمانە ، لـەوانەیە بە كەسێكی زۆر درۆزن وفێڵزان بوترێت سیاسەتمەدار ، لـەبەر ئەوەشە زۆربەی پیاوچاكان دوورەپەرێزن لـە سیاسەت .

وشەی سیاسەت لـە قورئانی پیرۆزدا نەهاتووە ، بەڵام لـە فەرموودەی پێغەمبەری خودادا ﷺ هاتووە : لـە ئەبوهرەیرەوە رضي الله عنه دەڵێت : پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ((كانَتْ بَنُو إسْرائِيلَ تَسُوسُهُمُ الأنْبِياءُ ، كُلَّما هَلَكَ نَبِيٌّ خَلَفَهُ نَبِيٌّ ، وإنَّه لا نَبِيَّ بَعْدِي ، وَسَتَكُونُ خُلَفاءُ فَتَكْثُرُ، قالوا: فَما تَأْمُرُنا ؟ قالَ : أَفُوا بِبَيْعَةِ الأوَّلِ ، فالأوَّلِ ، وَأَعْطُوهُمْ حَقَّهُمْ ، فإنَّ اللَّهَ سائِلُهُمْ عَمّا اسْتَرْعاهُمْ))[1] .

---

١. رواه البخاري (٣٤٥٥) ، ومسلم (١٨٤٢) .

واته : نەوەکانی ئیسرائیل پێغەمبەران ﷺ سیاسەتمەدارییان بۆ دەکردن ، هەرکاتێك پێغەمبەرێك وەفاتی بکردایە ، پێغەمبەرێکی تر جێگەی دەگرتەوە ، ولە دوای من پێغەمبەر نایەت بەڵام جێنیشینێکی زۆر دێت ، وتیان : بەچی فەرمانمان پێدەکەیت ؟ فەرمووی : دەست بە بەڵێنی یەکەمەوە بگرن ، ومافیان بدەن ، چونکە خودا پرسیاری مافی خەڵکیان لێدەکات.

وبە بۆچوونی هەندێك لە زمانزانان ئەو وشەیە بە عەرەبی کراوە (معرب) ، دەڵێن سیاسەت (سەیسا) : وشەیەکی لێکدراوە لە دوو وشە پێکهاتووە ، یەکەمیان فارسییە وئەوی تریان تورکییە (سە) ، واتە : (سێ) ، و(یسا) بەتورکی مەغۆلی ، واتە : (ڕێکخستن) ، وهەردووکیان پێکەوە (سێ ڕێکخەرەکە) .

وهەندێکی تریان دەڵێن : وشەیەکی عەرەبیە ولە چاوگی (ساس)ەوە وەرگیراوە (ساس الناس يسوسهم سياسه) ، ولە (جمهرة اللغة)دا (ابن دريد) دەڵێت : (وسست القوم أسوسهم سياسة) ، و(الجوهري) لە (الصحاح)دا لەمادەی (س و س) دەڵێت : (سُست الرعية سياسةً ، وسُوِّسَ الرجل أمورَ الناس) ، و(ابن منظور) لە (لسان العرب)دا دەڵێت : (وساس الأمر سياسةً : قام به ، ... وسوَّسه القومُ : جعلوه يَسُوسَهم) ، وخاوەنی (القاموس) دەڵێت : (وسُستُ الرعيةَ : أمرها ونهيتها) .

خودای پەروەردگار ڕەحمی بە ئوممەتی ئیسلام کردووە بە ناردنی قورئان وپێغەمبەرەکەی ﷺ کە هەرچی ئیش وکاری دونیایە فێری کردوون ، ولەسەر ڕووناکی بەجێی هێشتوون ، جولەکەکان بە سەلمانی فارسییان رضي الله عنه وت : ((لقد عَلَّمَكم نبيُّكم كُلَّ شَيءٍ حتى الخِراءةَ ؟! قال : أجَلْ ، لقد نهانا ﷺ أن نستقبِلَ

القِبلةَ بغائطٍ أو بَولٍ ، وألّا نستنجيَ باليَمينِ ، وألّا يستنجيَ أحَدُنا بأقَلَّ من ثلاثةِ أحجارٍ، أو نستنجيَ برجيعٍ أو عَظمٍ))[٢].

واته : پێغەمبەرەکەتان هەموو شتێکی فێرکردوون هەتا ئادابی چوونە سەرئاویش ؟ وتی : بەڵێ پێغەمبەری خودا ﷺ یاساغی (نەهی) ئەوەی لێکردووین کەڕوو لە ڕووگە (قیبلە) بکەین لەکاتی چوونە سەرئاو ، وبەدەستی ڕاست خۆمان پاك بکەینەوە ، وخۆمان بە کەمتر لە سێ بەرد پاك بکەینەوە ، وبە ئێسقان وشیاکەی (پاشەڕۆی) گیانلەبەر خۆمان پاك بکەینەوە .

وبە بەردەوامی دوژمنانی ئیسلام ـ ئەوانەی خودای پەروەردگار ڕووناکی چاوەکانی هەڵگرتوون لە بیباوەڕان وهاوبەش بڕیاردەران وئەوانی پاشکۆی دوژمنانی ئیسلامن ـ گومان دروست دەکەن ، لە پێویستی تێکۆشان لە پێناوی خودا ، یان دەڵێن : ئاین بەکەڵکی سیاسەت وبەڕێوەبردنی ئیش وکاری دەوڵەت وخەڵك نایەت ، ئەوانەش کە داکۆکی وبەرگری لە ئیسلام دەکەن وهەوڵی پوچەڵ کردنەوەی گومانی بێبڕواکان وپاشکۆکانیان دەدەن زۆر کەمن ، لەوانەیە کەسێکی دڵ گەرم بیەوێت بەرگری لە ئیسلام بکات لە ڕۆژنامە ودەستگاکانی ڕاگەیاندن کە هیچ زانستی شەرعی نازانێت ، بەوەش خراپ دەکات لە بری کاری باش لەوانەشە نکولی شتێکی ئاشکرا وڕوون بکات لە ئاین وببێتە مایەی دەرچوونی لە ئاین ، ئیسلام لەوە بەرز وبڵندترە کە پێویستی بە بەرگری ئەو جۆرە کەسانە هەبێت کە لە ڕۆژهەلاّت ناسەکان دەترسن وئەو شتانەش کە عەقڵیان بە باشی نەزانێت وازی لێ دەهێنن وهەندێك جار نکولیشی لێدەکەن .

---

٢. رواه أبوداود(٧) ، وصححه الألباني في صحيح سنن أبي داود(١/٣).

وئەو بۆچوونە بێباوەڕییەی کە دەڵێت : ئاین دەبێت لە سیاسەت جیا بکرێتەوە ، زۆربەی کاربەدەستانی وڵاتانی موسڵمان کە نەزانن بە بنەماکانی شەریعەت لاساییان دەکەنەوە ودەیلێینەوە بەبێ شارەزا بوون بە ناواخن وناوەڕۆکی ، ئەو بۆچوونە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لە ئەورووپاوە سەریهەڵداوە ، ولەبەر ئەوەی کلێسا دەستی نابووە بینەقاقای ژیان وڕێگای هەموو پێشکەوتن وگۆڕانێکی بەرەو باشتری لێگرتبوون ، تەواو بە پێچەوانەی ڕۆڵی مزگەوت وزانایان لە ئاینی ئیسلام دا کە هەموو کات پێشەوا وسەرمەشقی هەموو پێشکەوتن وئاسودەییەکی ژیانی خەڵك بوون .

هەندێك خەڵك ئەوانەی قورئان ناخوێننەوە ، یان لە ماناکەی تێناگەن واگومان دەبەن کە لە قورئاندا هیچ ئایەتێکی سیاسی "بە مانا کۆنەکەی" نییە ، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەموو ئەو ئایەتانەی کەباسی بوژانەی ژیانی خەڵك وبەهێزی ولاوازی دەکەن ودیاردە کۆمەڵایەتیەکان دیاری دەکەن مانای سیاسەت وبەڕێوەبردنی ئیش وکاری خەڵکی تێدایە.

ولەبەر کەمی سەرچاوە لەسەر ئەم بابەتە بەزمانی کوردی بە ئەرکێکی شەرعی سەرشانی خۆمم زانی ئەم کتێبەی شێخی ئیسلام ئیبن تیمیە ﵀ کە کۆمەڵێك ڕستەی کۆکراوەی پڕمانایە وەرگێڕم ، بەهیوای ئەوەی توانیبێتم خزمەتێك بە ئاینەکەم بکەم .

وەرگێڕ

عثمان أحمد حاتم

٤/جمادی الأولی /١٤٢٩ك

٢٠٠٨/٦/٧

# نووسەر لە چەند دێڕێکدا

ناوی ئەحمەدی کوڕی عەبدول حەلیمی کوڕی عەبدول سەلامی کوڕی باوکی قاسمی (خضر)ی نومەیری ، حەڕانی ، دیمەشقی ، حەنبەلی ، باوکی عەباسی تقی دین کوڕی تیمیەیە ، پێشەوا وشێخی ئیسلامە .

لە حەڕانی باکوری خۆرهەلاتی (تورکیا)ی ئێستا لە دایك بووە ، باوکی بردوویەتی بۆ دیمەشق لەوێ پێگەیشتووە وناوبانگی دەرکردووە ، بانگهێشت کراوە بچێت بۆ میسر بۆ فەتوادان لەوێ بووە بە موفتی بەڵام کۆمەڵێك خەڵك ئیرەییان (حەسادەتیان) پێبردووە لەبەر ئەوە تووشی بەندیخانەیان کردووە ودووریان خستەوە بۆ ئەسکەندەرییە دواتر ئازادکراوە ، ئیدی لەساڵی (٧١٢ك) گەشتی دیمەشقی کردووە ، لەوێش دیسان لەساڵی (٧٢٠ك) چەندجارێك بەندیان کردووە تا لە گرتووخانەی قەلاَی دیمەشق کۆچی دوایی کردووە ، ئەوکات زۆربەی دانیشتوانی شار دوای تەرمەکەی کەوتن بۆ گۆڕستان بەگریان ونزاو وپاڕانەوە .

زۆر گەڕاوە بەدوای هونەرەکانی دانایی ، وبانگەوازکارێکی چاکساز بووە لە ئایندا وقورئانی پیرۆزی لەبەرکردووە ، ودەستێکی بالاَی هەبووە لە ڕاڤەی قورئان وفیقھ وزانستەکانی زمانەوانی ، ولە هەموو زانستەکان بە پلەی (اجتهاد) گەیشتووە ، ویەکێك بووە لە کەڵە پیاوانی ڕاڤەی قورئان وبنچینەکان (الأصول) ، وزمان پاراو بووە وزمان وخامەکەی لەیەکەوە نزیك بوون ، فەتوای داوە ووانەی وتووەتەوە لە کاتێکدا کە تەمەنی لە بیست ساڵ کەمتر بووە .

نووسراوەکانی زیاترە لە (٣٠٠) بەرگ هەندێکیان بە نموونە ناودەبەین :

درء التعارض بين النقل والعقل .

الفرقان بين أولياء الرحمن وأولياء الشيطان .

السياسة الشرعية في إصلاح الراعي والرعية .

مجموعة الفتاوى .

## بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

## پێشەكی نوسەر

سوپاس وستایش بۆ خودا كە پێغەمبەرانی ناردووە بە بەڵگەی ڕوون وئاشكرا ، وبەرنامە وپێوەری دادپەروەری لەگەڵدا ناردوون ، بۆ ئەوەی خەڵكی دادپەروەرانە بەڕێوەببەن ، وئاسنی ناردووەتە خوارەوە وەكو چەكێكی دوولایەن كە سوود وقازانجی ژیانی لێدەكرێت لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانرێت ببێتە مایەی ئازاردانی خەڵك ، بۆ ئەوەی پەروەردگار خەڵكی تاقیبكاتەوە كە كێ خودا وپێغەمبەرەكەی ﷺ سەردەخات ، وپێویستی بە خەڵك نییە چونكە بەڕاستی خودا بە توانا وبەهێزە ، وپێغەمبەرانی كۆتایی پێ هێناوە بە محمد ﷺ كە ناردوویەتی بە چاوساغ وڕێ نیشاندەر بۆ ئاینی ڕاست ودروست ، وپاڵپشتی كردووە بە بەڵگەی ڕوون وبەهێز ، كە كۆكەرەوەی مانای زانست وقەڵەم وبەڵگە وڕێ نیشاندانە ، ودیسان مانای توانایی وشمشێرە بۆ سەرخستنی ، گەواهی دەدەم كە هیچ پەرستراوێك نییە جگە لە خودا ، گەواهییەكی پاك وبێگەرد پاكتر لە گەوهەری بێخەوش ، وگەواهی دەدەم كە محمد ﷺ بەندە ونێردراوی خودایە درود وسەلامی بێ سنور لەسەر پێغەمبەر ودۆست ویاران وخزم وكەسی ، گەواهیەك كە خاوەنەكەی لەپەنایدا ئارام بگرێت وئاسوودە بێت.

دوایی دەڵێم : ئەم كتێبە كورتەیەك لە سیاسەتی ئیلاهی ونیشانەكانی پێغەمبەرایەتی تێدا كۆكراوەتەوە ، كاربەدەستان وخەڵكیش پێویستیان پێ دەبێت ، هەر كەسێك هەست بكات كە خودا ئامۆژگاری لەسەر پێویست كردووە بۆ كاربەدەستان وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ لە صەحیحی مسلم وئەوانی تردا دەفەرموێت : ((إنَّ اللهَ يرضى لكم

ثلاثًا ويسخَطُ ثلاثًا : يرضى لكم أنْ تعبُدوه ولا تُشرِكوا به شيئًا وأنْ تعتصموا بحبلِ اللهِ جميعًا وأنْ تُناصِحوا مَن ولّاه اللهُ أمرَكم ))[٣] .

واته : خودا سێ شتی پێ ڕازییە بۆتان : بیپەرستن وهیچ هاوەڵی بۆ بڕیار نەدەن ، وهەمووتان دەست بە بەرنامە وئاینی خوداوە بگرن وجیاوازی مەكەن ، وئامۆژگاری ئەو كەسانە بكەن كە خودا دەیانكات بە كاربەدەست بەسەرتانەوە.

ئەم پەرتووكە پشتی بە دوو ئایەتی قورئانی پیرۆز بەستووە ، خودا دەفەرموێت : ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا ٥٨ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ٥٩﴾(النِّسَاء).

واته : خودا فەرمانتان پێدەكات كە ڕاسپاردەكانتان بە باشی بدەنەوە دەستی خاوەنەكانی ، وكاتێك دادوەریتان كرد لەنێوان خەڵك فەرمان بە دادپەروەری بكەن خودا بەشتی باش ئامۆژگاریتان دەكات ، بە ڕاستی خودا بیسەر وبینەرە ، ئەی ئەو كەسانەی كە باوەڕتان هێناوە گوێڕایەڵی خودا وگوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ وكاربەدەستانبن ، ئەگەر لەشتێكدا ناكۆك بوون بۆلای خودا وپێغەمبەرەكەی ﷺ بگەڕێنەوە كە ـ قورئان وسوننەتی صەحیحە ـ ئەگەر ئێوە باوەڕتان بە خودا وڕۆژی دوایی هەیە ، ئەوە باشترین چارەسەرە بۆ ئێوە .

---

٣. رواه مسلم (١٧١٥) .

زانایان دەڵێن : ئایەتی یەکەم بۆ کاربەدەستان دابەزیوە ، پێویستە لە سەریان ئەو ئەرکانەی پێیان سپێردراوە بە باشی ڕای پەڕێنن ، وکاتێك بوونە دادوەر لە نێوان خەڵك پێویستە لەسەریان دادپەروەرانە دادوەری بکەن ، وئایەتی دووەم : بۆ خەڵك دابەزیوە پێویستی کردووە لە سەریان گوێڕایەڵی کاربەدەستانبن لە جەنگ وفەرمانەکانی بەڕێوەبردنی وڵات ، مەگەر فەرمان بە سەرپێچی خودا بکەن ئەو کاتە گوێڕایەڵی ناکرێن ، چونکە گوێڕایەڵی دروستکراو ناکرێت لە سەرپێچی دروستکار ، ئەگەر لە شتێك ناکۆك بوون دەگەڕێنەوە بۆ لای خودا وپێغەمبەر ﷺ لەبەر ئەوە گوێڕایەڵی کاربەدەستان گوێڕایەڵی خودا وپێغەمبەرە ﷺ ، خودا دەفەرموێت : ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِۚ ۝٢﴾(المَائِدَة) .

واتە : هاوکاری یەکبن لەکاری باش ، بەڵام هاوکاری یەك مەبن لەکاری خراپ ودژایەتی یەکتر .

ئایەتی یەکەم پێویستی کردووە لە سەر بەرپرسان بە باشی ئەرکەکانیان بەڕێوەبەرن ودادپەروەرانە دادوەری خەڵك بکەن ، ئایەتی دووەمیش لەسەر خەڵکی پێویست کردووە هاوکار وگوێڕایەڵی کاربەدەستانبن لە فەرمانی خودا وپێغەمبەر ﷺ ، ئەم دوو شتەش کۆکەرەوەی سیاسەتی دادپەروەرانە وکاربەدەستی چاکن .

## بەشی ڕاپەڕاندنی ئەرکەکان دوو جۆرە[٤]

ڕاپەڕاندنی ئەرکەکان دوو جۆرە ، یەکەمیان : هۆی دابەزینی ئایەتەکە ئەوە بوو کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ مەککەی ڕزگار کرد کلیلەکانی کەعبەی لە کوڕەکانی شەیبە وەرگرتەوە ، عەباسی مامی داوای لێکرد ئاودان بە حاجیان ودەرگاوانی کەعبەیشی بداتێ ، خودای پەروەردگار ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە : ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا ۝٥٨﴾(النِّسَاء) ، ئیدی کلیلەکانی کەعبە درانەوە دەستی کوڕەکانی شەیبەوە ، لەبەر ئەوەشە کە پێویستە لەسەر کاربەدەستی موسڵمانان باشترین کەسی بەردەست هەڵبژێرێت بۆ ڕاپەڕاندنی ئیش وکارەکان ، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (( من ولي من أمر المسلمين شيئاً ، فولى رجلاً وهو يجد من هو أصلح للمسلمين منه فقد خان الله ورسوله ، وفي رواية : من ولى رجلاً على عصابة ، وهو يجد في تلك العصابة من هو أرضى منه ، فقد خان الله ورسوله وخان المؤمنين ))[٥] .

واتە : ئەگەر کەسێك لە ئیشێکی موسڵماناندا بوو بە کاربەدەست ، ئەویش کەسێکی کردە بەرپرسی خۆی ، لەوکەسە باشتر هەبوو ئەوە ناپاکی (الخيانة) لەگەڵ خودا وپێغەمبەردا ﷺ کردووە ، ولە ڕیوایەتێکدا : ئەگەر کەسێك بکات بە کاربەدەست بە سەر کۆمەڵێك خەڵکەوە ، وبزانێت لەو خەڵکانە کەسی شیاوتر هەیە ، ئەوە ناپاکی لەگەڵ خودا وپێغەمبەر ﷺ وباوەڕدارانیش دا کردووە .

---

٤. ئەو ناونیشانانە لە دەقی نوسینەکەی شیخ الإسلامەوە وەرمگرتووە بۆ زیاتر تێگەیشتن .(وەرگێڕ).

٥. رواه الحاكم في صحيحه ، وضعفه الألباني في (ضعيف الجامع)(٥٤٠١) .

هەندێك دەڵێن : ئەوە وتەی عومەرە ﷺ بەكوڕەكەی وتووە ، وئەویش لێوەی گێڕاوەتەوە ، وعومەری كوڕی خەتاب ﷺ دەڵێت : (من ولي من أمر المسلمن شيئاً فولى رجلاً لمودةٍ أو قرابةٍ بينهما ، فقد خان الله ورسوله والمسلمين) .

واتە : كەسێك بوو بە كاربەدەست لە ئیش وكاری موسڵمانان ، ئەویش كەسێكی لەبەر خۆشەویستی یان خزمایەتی كردە بەرپرس ئەوە ناپاكی لەگەڵ خودا وپێغەمبەر ﷺ وموسڵماناندا كردووە .

پێویستە لەسەر كاربەدەست تێبكۆشێ وهەوڵبدات ولێبكۆڵێتەوە بۆ ئەوەی كەسی شایستە وشیاو پەیدا بكات كە فەرمانبەری بۆ بكەن لە شارەكان ودادوەران وئەفسەرانی سوپا وڕاوێژكاران ونووسەران وباج ودەرامەتی دەوڵەت وپارەی خێر ، پێویستە هەموو ئەوانە شیاوترین كەسانێكبن كە لە تواناداا بێت پەیدا بكرێن ، ئەمەش هەموو بوارەكانی ژیان دەگرێتەوە لە نوێژ وبانگدان وقورئان خوێندن وخەزنەداری وپاسەوانانی سنور ومامۆستایان وڕێ نیشاندەرانی حاجیان وئاسنگەران ودەرگاوانانی قەڵای شار وهۆزناس وبازاڕناس وئەنجومەنی گوند ... هتد .

نابێت بەرپرسیارێتی بە كەسانێك بسپێردرێت كە خۆیان داوای بكەن ، وپێویستە ئەو داواكردنە ببێتە ڕێگری ئەوەی كە ئەو كەسە بەرپرسیارێتی بدرێتە دەست ، لە فەرموودەیەكی صەحیحدا هاتووە : كۆمەڵە خەڵكێك هاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وداوای كاربەدەستییان كرد ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ((إنا لا نولي أمرنا هذا من طلبه))[٦].

واتە : ئێمە كەسێك ناكەینە كاربەدەست خۆی داوای بكات .

---

٦. أخرجه البخاري (٦٩٣٢).

وبە عبدالرحمانی کوڕی سەمورەی فەرموو : (( يا عبدالرحمن ، لا تسأل الإمارة ، فإنك أن أعطيتها من غير مسألة أعنت عليها ، وإن أعطيتها عن مسألة وكلت إليها ))[7].

واتە : ئەی عبدالرحمان داوای کاربەدەستی مەکە ، ئەگەر کاربەدەستیت پێسپێردرا بەبێ ئەوەی خۆت داوای بکەی خودا یارمەتیت دەدات لەسەری ، بەڵام ئەگەر خۆت داوات کرد ئەوە تۆ بەو کارە دەسپێردرێیت .

وهەروەها دەفەرمویێت : ((من طلب القضاء واستعان عليه وكّل إليه ، ومن لم يطلب القضاء ولم يستعن عـــليه ، أنزل الله إليه ملكاً يســـدده))[8].

واتە : هەر کەسێك داوای دادوەری بکات وپشتی پێ ببەستێت ئەوە بەو کارە دەسپێردرێت ، وهەر کەسێك خۆی داوای دادوەری نەکات وپشتی پێ نەبەستێت ، خودا فریشتەیەکی بۆ دەنێرێتە خوارەوە ویارمەتی دەدات .

ئەگەر کاربەدەستان کەسی شیاویان هەڵنەبژارد لەبەر خزمایەتی یان دۆستایەتی یان هاوڕێیەتی یان هاوڵاتی بوون یان هاو مەزهەب بوون یان لەبەر نەتەوە ( عەرەب ، فارس ، تورك ، ڕۆم ) یان لەبەر بەرتیل وەرگرتن یان لەبەر قازانجێك یان لەبەر کینەیەك کە لەدڵیدا هەیە بەرامبەر بەو کەسەی شیاوترە یان دوژمنایەتی نێوانیان یان لەبەر هەر هۆکارێکی تر ، ئەوە ناپاکی لەگەڵ خودا وپێغەمبەر ﷺ وباوەڕداراندا کردووە ، وبەر ئەو یاساغیە دەکەوێت کە خودای پەروەردگار دەفەرموێت : ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَخُونُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓا۟ أَمَـٰنَـٰتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٧﴾ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَأَوْلَـٰدُكُمْ فِتْنَةٌ وَأَنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿٢٨﴾﴾(الأنفال) .

---

٧. أخرجه البخاري (٦٦٢٢) ، و مسلم (١٦٥٢).

٨. رواه أبوداود (٣٥٧٨) ، والترمذي (١٣٢٣) ، وابن ماجه (٢٣٠٩) ، وضعفه الألباني في (ضعيف الجامع)(٥٦٨٨).

واتە : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ناپاکی لەگەڵ خودا وپێغەمبەر ﷺ مەکەن ، وناپاکی لەو شتانە مەکەن کە پێتان سپێردراوە ، لە کاتێکدا دەزانن ئەو ناپاکییە حەرام ونەشیاوە ، وبزانن کە ماڵ ومنداڵەکانتان بەڵان (فیتنەن) وخودا پاداشتی زۆر گەورەی لایە.

چونکە مرۆڤ لەبەر خۆشەویستی کوڕەکەی ، یان ئازادکراوەکەی (عتیقە) ، لەوانەیە هەندێ ئیش وکاریان پێ بسپێرێت کە شایستەی نەبن ، ئەوەش ناپاکییە لە بەرپرسیارییەتی ، ودەبێتە کارایەکی یاریدەدەر بۆ کۆکردنەوەی ماڵ وسامان وپاراستنی ، بەوەش ڕازی دەبێت دیاریەك یان هەر شتێك کە شایانی ئەو نەبێت وەریبگرێت ، وهەریەك لە فەرمانبەرەکانی لایەنگری بکەن وخۆشیانی بوێت ، ئەوەش ناپاکییە لە خودا وپێغەمبەر ﷺ وبەرپرسیاریەتیەکەی .

هەر بەرپرسێك کارەکانی بەباشی ڕاپەڕێنێت وپێچەوانەی حەز وئارەزووی ڕەفتار بکات خودا دەیپارێزێت وجێگیری دەکات ودوای خۆیشی ماڵ وسامانی دەپارێزێت ، وئەو کەسەی فەرمانبەری حەز وئارەزووەکانی بکات خودا ڕیسوای دەکات وسزای دەدات ، وبە پێچەوانەی ویستی خودا ماڵی بە فیڕۆ دەدات وکەسوکاریشی ڕیسواو بێ ڕێز دەکات ، لەو باسەشدا بەسەرهاتی باو هەیە دەگێڕنەوە : یەکێك لە جێنیشینە عەباسییەکان پرسیاری لە زانایەك کرد شتێکی بۆ بگێڕێتەوە کە خۆی بینیبێتی زاناکە وتی : گەیشتمە خزمەتی عومەری کوڕی عبدالعزیز "لە سەرە مەرگدا بوو" پێیان وت : ئەی کاربەدەستی موسڵمانان بۆچی دەمی منداڵەکانت گرتووەتەوە لەو ماڵ وسامانە وبە هەژاری ونەدارییی بەجێیان دەهێڵیت ؟ وتی : با منداڵەکانم بێنە ژوورەوە بۆ لام ، زیاتر لە دە کوڕی هەبوو هیچ کامیان نەگەیشتبووە تەمەنی هەرزەکاری ، هاتنە ژوورەوە کاتێك بینییانی دەستی بە گریان کرد ووتی : کوڕەکانم سوێند بەخودا هیچم لێ قەدەغە نەکردوون مافی ئێوە بێت ، وبە هیچ شێوەیەك مافی خەڵك بە ئێوە نادەم ، ئێوە لە

یەکێك لەم دوو جۆرە خەڵكە بەدەر نین : یان پیاوی چاکن خوداش پیاو چاکانی خۆش دەوێت ویارمەتیان دەدات ، ویان پیاوی خراپن ، لە دوای خۆم هیچ بەجێ ناهێڵم یارمەتیدەرتان بێت بۆ سەرپێچی فەرمانەکانی خودا هەستن بڕۆن ، زاناکە دەڵێت : لە منداڵەکانیم بینی ئەوەندە دەوڵەمەند بوو بوو سەد ئەسپی بەخشی لە ڕێگای خودا بۆ ئەوەی پێیان بجەنگن لە پێناوی خودا .

دەڵێم : ئەوە لە کاتێکدا بوو کە خەلیفەی موسڵمانان بوو لەو پەڕی ڕۆژهەڵاتەوە وڵاتی تورك هەتا ئەو پەڕی ڕۆژئاوا لە وڵاتی ئەندەلوس ، ودوورگەی قوبرس وشام وپایتەختەکانی وەك ترسوس هەتا خوارووی یەمەن لەژێر دەسەڵاتیدا بوون ، هەریەکە لە منداڵەکانی شتێکی زۆر کەمیان لە میراتی باوکیان بەرکەوت دەڵێن : لە بیست درهەمی زیو کەمتر بوو ، وخەلیفەش هەبوو منداڵەکانی کاتێك میراتەکەیان دابەش کرد هەریەکە شەش سەد هەزار دیناری زێڕیان بەرکەوت ! ، بەڵام دواتر لەو منداڵانە لێیان بێ ماڵ وسامان بوو لەبەر دەست نەچوونی دەرۆزەیان (سواڵ) دەکرد ! لەم باسەدا چیرۆك وبەسەرهاتی زۆر هەن کەپەند وئامۆژگارین بۆ ئەو کەسانەی کە ژیرن .

سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بەڵگەیە کە کاربەدەستی ئەمانەتە وپێویستە لەشوێنی خۆیدا دابنرێت وبدرێتە دەستی کەسانی شایستە وەك چۆن بە ئەبوذەر رضي الله عنه دەفەرموێت : ((إنها أمانة ، وإنها يوم القيامة خزيٌ وندامة إلا من أخذ بحقها ، وأدى عليه فيها))[٩] .

واتە : کاربەدەستی ئەمانەتە ولە ڕۆژی دوایی ڕیسوایی وپەشیمانییە ، مەگەر کەسێك مافی بدات وئەوەی لەسەرییەتی بە باشی ڕایپەڕێنێت .

---

٩. رواه مسلم (١٨٢٥).

وبوخاری لە صەحیحەکەیدا لە ئەبوهرەیرەوە ﵁ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی : (( إذا ضيعت الأمانة ، فأنتظر الساعة ، قيل يارسول الله وما إضاعتها ؟ قال : إذا وسد الأمر إلى غير أهله فأنتظر الساعة ))[١٠] .

واتە : ئەگەر ئەمانەت لە ناوچوو چاوەڕوانی ڕۆژی دوایی بکە ، وترا : چۆن لە ناودەچێت ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ؟ فەرمووی : ئەگەر کار درایە دەستی کەسانی ناشایستە ، ئەوا چاوەڕوانی ڕۆژی دوایی بکە .

وموسڵمانان کۆڕان لەسەر ئەم مانایە ، کە پەروەردەکاری هەتیو وکاربەدەستی وەقفەکان وبریکاران ، پێویستە بە باشترین شێوە کارەکانیان بە ئەنجام بگەیەنن وەك چۆن خودای پەروەردگار دەفەرموێت : ﴿وَلَا تَقْرَبُواْ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِىَ أَحْسَنُ ﴿٣٤﴾﴾(الإِسْرَاء) .

واتە : نزیکی ماڵی هەتیو مەکەونەوە مەگەر بتانەوێت باشتریان بۆ بکەن بەوەی کە بیپارێزن وزیاتری بکەن ، وبۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکاری بێنن .

خودای پەروەردگار نەیفەرموو نزیکی ماڵی هەتیو مەکەونەوە بە شێوەیەك نەبێت کە باشە ، چونکە کاربەدەست چاودێری خەڵکە وەك شوانی مەڕ وماڵات ، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : (( كلكم راعٍ وكلكم مسؤول عن رعيته ، فالإمام  الذي على الناس راعٍ ، وهو مسؤول عن رعيته ، والمراة راعية في بيت زوجها وهي مسؤولة عن رعيتها ، والولد راعٍ في مال أبيه وهو مسؤول عن رعيته ، والعبد راعٍ في مال سيده وهو مسؤول عن رعيته ، ألا فكلكم راعٍ وكلكم مسؤول عن رعيته ))[١١] .

---

١٠. رواه البخاري (٥٩).

١١. رواه البخاري (٢٥٥٤)، ومسلم(١٨٢٩).

واتە : هەمووتان بەرپرسن لەو شتانەی لە ژێردەستاندایە ، کاربەدەست بەرپرسە لەو خەڵکانەی کە فەرمان ڕەواییان دەکات ، وئافرەت بەرپرسە لە ماڵی مێردەکەی ، وکوڕ بەرپرسە لە ماڵی باوکی ، وبەندە بەرپرسە لە ماڵی گەورەکەی ، بەو شێوەیە هەمووتان بەرپرسن .

وپێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : (( ما من راعٍ يسترعيه الله رعية ، يموت يوم يموت ، وهو غاش لها ، إلا حرم الله عليه الجنة ))[١٢].

واتە : هەر کەسێك خودای پەروەردگار کردی بە کاربەدەست ، ڕۆژێك بمرێت کە گزی (غەش) لە خەڵك کردبێت ، ئیللا خودا بەهەشتی لە سەر قەدەغە دەکات .

ئەبو مسلمی خەوەلانی چوو بۆ لای معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان رضي الله عنهما پێی وت : سڵاوت لێ بێت ئەی کرێکار ، پێیان وت : بڵێ سڵاوت لێ بێت ئەی فەرمان ڕەوای موسڵمانان ، سێ جار پێیان وت : وا بڵێ ، بەڵام هەر وتەکەی خۆی دووبارە دەکردەوە ، معاویە وتی : لە ئەبومسلم گەڕێن خۆی باش دەزانێ چی دەڵێت ، وتی : تۆ کرێکاری خودا سبحانه وتعالى بەکارت دێنێ بۆ ئەوەی چاودێری ئەو خەڵکە بکەیت ، ئەگەر تۆ نەخۆشیەکانیان چارەسەر بکەیت ودەرمانی بکەیت ، هەموویان باش بپارێزیت ، ئەوا خاوەنەکەیان پاداشتی باشت دەداتەوە ، بەڵام ئەگەر بە پێچەوانەوە بوویت ئەوا سزات دەدات .

ئەوەش بەڵگە نەویستە ، چونکە خەڵکی بەندەی خودان وکاربەدەستانیش فەرمانبەرداری خودان لەسەر بەندەکانی ، وبریکاری بەندەکانن ، نموونەی دوو هاوەڵ (شريك) مانای کاربەدەستی وبریکاریان تێدایە ، هەر یەکێك لەوان کەسێکی بەجێگیر بەکارهێنا ، وکەسی باشتر هەبوو بۆ بازرگانی وموڵك وماڵیان ، یان کاڵایەکی بەنرخێك

---

١٢. رواه البخاري(٧١٥١) ، ومسلم(١٤٢).

فرۆشت وبزانێت لەو پارەیە زیاتر دەکات ئەوە ناپاکی لە هاوەڵەکەی کردووە ، بەتایبەت ئەگەر ئەو کەسەی شتەکەی بە هەرزانتر پێ دەفرۆشێت لە نێوانیاندا خزمایەتی یان دۆستایەتی یان هاورێیتیەك هەبێت ، ئەوکات هاوەڵەکەی ڕقی لێ هەڵدەگرێت وبە خراپ ناوی دەبات وواگومان دەبات کە ناپاکی لەگەڵدا کردووە ولایەنگری وڕووپامایی بۆ خزم وناسیاوەکەی خۆی کردووە .

## بەشی هەڵبژاردنی باشترین

ئەگەر زانرا پێویستە شیاوترین کەس کە هەبێت بەکار بهێنرێت ، بەڵام هەندێ جار شیاوترین کەس بەردەست نییە بۆ ئەو کاربەدەستییە ، ئەگەر وابوو ئەوا هەر یەکە بەگوێرەی توانا وشارەزای هەڵدەبژێردرێت ، گەر کاربەدەست بەو شێوەیە ڕەفتاری کرد دوای گەڕان وماندوو بوون ئەوە مافی کارەکەی داوە وبە باشی ڕاپەڕاندووە ، وئەوەی لەسەر بووە بە ئەنجامی گەیاندووە ، وچووەتە ڕیزی کاربەدەستانی دادپەروەر وچاکەکار لە لای خودا ، چونکە خودای گەورە دەفەرموێت : ﴿فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ مَا ٱسْتَطَعْتُمْ ﴿١٦﴾﴾(التَّغَابُن).

واتە : لە خودا بترسن بە گوێرەی تواناتان .

ودەفەرموێت : ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ۚ ﴿٢٨٦﴾﴾(البَقَرَة) .

واتە : خودا داوای کارێك ناکات لە توانادا نەبێت .

ولە جیهاد وتێکۆشاندا دەفەرموێت : ﴿فَقَـٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفْسَكَ ۚ وَحَرِّضِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ ﴿٨٤﴾﴾(النِّسَاء) .

واتە : تێبکۆشە لەپێناوی خودا ، تەنها بەرپرسی خودی خۆتی وهانی باوەڕدارانیش بدە.

و﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ ۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهْتَدَيْتُمْ ۚ ﴿١٠٥﴾﴾(المَائِدَة)[13].

---

١٣. ولە فەرموودەیەکی صەحیحدا هاتووە ئەبوبەکری صدیق رضي الله عنه لەسەرمینبەرەکەی پێغەمبەری خودا ﷺ وتاری دەخوێند فەرمووی : ((يا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّكُمْ تَقْرَءُونَ هَذِهِ الْآيَةَ وتضعونها في غير موضعها : ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ ۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهْتَدَيْتُمْ ۚ ﴿١٠٥﴾﴾(المَائِدَة) ، وَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ : إِنَّ النَّاسَ إِذَا رَأَوْا المنكر فلم يغيروه أَوْشَكَ أَنْ يَعُمَّهُمْ اللَّهُ بِعِقَابٍ مِنْ عنده )) رواه أبوداود(٤٣٣٨) ، والترمذي(٢١٦٨) ، وابن ماجه (٤٠٠٥) ، وصححه الألباني في (صحيح الجامع)(١٩٧٣).

واتە : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ، تەنها بەرپرسی خودی خۆتانن ، زیانتان پێ ناگەیەنێت کەسێکی گومڕا ئەگەر ئێوە هیدایەتتان وەرگرتبێت .

هەر کاربەدەستێك فەرمانەکانی بە گوێرەی توانا ڕاپەڕاند ئەوە هیدایەتی وەرگرتووە ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : (( إذا أمرتكم بأمرٍ فأتوا منه ما أستطعتم ))[١٤].

واتە : ئەگەر فەرمانم پێکردن بەکارێك پێی هەستن بەگوێرەی توانا .

بەڵام ئەگەر سستی کرد وتەمبەڵی نواند وناپاکی کرد دەبێت سزا بدرێت ، ودەبێت کەسی شیاو لە شوێنی شیاو دابنرێت ، چونکە کاربەدەستی دوو پایەی هەیە : هێز ودەستپاکی ، وەك خودای پەروەردگار دەفەرموێت : ﴿إِنَّ خَيْرَ مَنِ ٱسْتَـْٔجَرْتَ ٱلْقَوِىُّ ٱلْأَمِينُ ﴿٢٦﴾﴾(القَصَص) .

واتە : بەڕاستی باشترین کەس بۆ بەکرێگرتن کەسی بەهێز ودەست پاکە .

وپادشای میسر بە یوسف عليه السلام دەڵێت : ﴿إِنَّكَ ٱلْيَوْمَ لَدَيْنَا مَكِينٌ أَمِينٌ ﴿٥٤﴾﴾(يُوسُف).

واتە : تۆ ئەمڕۆ لای ئێمە بەڕێز وبەتوانا ودەستپاکی .

وپەروەردگار لە وەسفی جبریل دا عليه السلام دەفەرموێت : ﴿إِنَّهُۥ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ ﴿١٩﴾ ذِى قُوَّةٍ عِندَ ذِى ٱلْعَرْشِ مَكِينٍ ﴿٢٠﴾ مُّطَاعٍ ثَمَّ أَمِينٍ ﴿٢١﴾﴾(التَّكْوِير) .

---

١٤. رواه البخاري (٧٢٨٨) ، ومسلم (١٣٣٧).

واتە : ئەو قورئانە فریشتەیەكی ڕەوشت بەرز گەیاندوویەتی ، زۆر بە توانا وبەرێزە ونزیكە لە پەروەردگاری خاوەنی عەرش ، وخاوەن پلە وپایەیەكی بەرزە وگوێڕایەڵی دەكرێت لە لایەن فریشتەكانی ترەوە وئەمینە .

هێز لە بەرپرسیاریەتیەكەوە بۆ یەكێكی تر جیاوازە ، هێز لە شەڕدا بوێریی وپسپۆریە لە جەنگ وفێڵی شەڕە ، چونكە شەڕ فێڵە وتوانای بەكارهێنانی كەرەستەكانی جەنگە وەك : تیرهاوێشتن وشمشێر لێدان وسوارچاكی وهەڵكشان وداكشان ، وەك چۆن خودای گەورە دەفەرموێت :﴿ وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ ٱلْخَيْلِ ﴿٦٠﴾﴾(الأنفال) .

واتە : هەرچی لە تواناتاندا هەیە خۆتان سازبدەن وئەسپەكانتان ئامادە بكەن دوژمنەكانی خودا وخۆتانی پێ بترسێنن .

وپێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : ((ارموا واركبوا ، وإن ترموا أحب إليَّ من أن تركبوا))[١٥] ، و((من تعلم الرمي ثم نسيه فليس منا))[١٦] ، وفي رواية : ((فهي نعمة جحدها))[١٧] .

واتە : بهاوێژن وسوار چاكبن ، بهاوێژن پێم خۆشترە لەوەی سوار چاك بن ، وئەوەی هاوێشتن فێربێت ودوایی لە بیری بكات لە ئێمە نییە ؛ ولە ڕیوایەتێكی تردا : ئەوە نكوڵی نیعمەتێكی كردووە .

---

١٥. رواه الترمذي (١٦٣٧) ، وأبوداود (٢٥١٣) ، والنسائي (٣٥٧٨) ، وابن ماجه (٢٨١١) ، وضعفه الألباني في (ضعيف الجامع) (٧٨٤).

١٦. رواه مسلم (١٩١٩).

١٧. رواه الطبراني في الصغير(٥٤٣) ، وقال الألباني في (صحيح الترغيب)(١٢٩٤) : صحيح لغيره .

ولیهاتوویی له دادوەری خەڵك دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دادەی كە قورئان وسوننەت بەڵگەن لەسەری ، وبە توانا بوون لە ڕاپەڕاندنی بڕیارەكان .

وئەمانەت دەگەڕێتەوە بۆ لە خودا ترسان ، ونەفرۆشتن ونەگۆڕینەوەی ئایەتەكانی خودا بەشتانێكی كەم بەها ، ونەترسان لە خەڵك ، ئەم سێ سیفەتە خودا دایناوە لەسەر كاربەدەستان لەو فەرموودەی كە دەفەرمویێت : ﴿فَلَا تَخۡشَوُاْ ٱلنَّاسَ وَٱخۡشَوۡنِ وَلَا تَشۡتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنٗا قَلِيلٗاۚ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ٤٤﴾(المَائِدَة) .

واتە : لە خەڵك مەترسن ، لە من بترسن ، وئایەتەكانم بە شتی كەم بەها مەفرۆشن ومەگۆڕنەوە ، ئەوانەی فەرمانڕەوایی بەوە ناكەن كە خودا دایبەزاندووە بێباوەڕن .

لەبەر ئەوەیە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی : (( القضاة ثلاثة : قاضيان في النار وقاضٍ في الجنة ، فرجل علم الحق وقضى بخلافه فهو في النار ، ورجل قضى بين الناس على جهلٍ فهو في النار ، ورجل علم الحق وقضى به ، فهو في الجنة ))[١٨].

واتە : دادوەران سێ جۆرن : دووانیان دۆزەخی وئەویتریان بەهەشتییە ، پیاوێك ڕاستی زانی وبە پێچەوانەیەوە فەرمانی كرد ئەوە لە ئاگردایە ، وپیاوێك بە نەزانی لە نێوان خەڵكدا دادوەری كرد ئەویش لە ئاگردایە ، وپیاوێك ڕاستی زانی وفەرمانی پێكرد ئەوە بەهەشتییە.

دادوەر (القاضي) ناوێكە بۆ هەر كەسێك دادوەری لە نێوان دوو كەسدا بكات وبڕیار بدات لە نێوانیان ، جا ئەو كەسە جێنیشین (خەلیفە) بێت یان فەرمانڕەوا یان جێگر یان كاربەدەست ، یان دانرابێت كە شەرع پیادە بكات ، هەتا ئەو كەسانەی خۆش نوسینی منداڵان ناوبژی دەكەن دەگرێتەوە ئەگەر سەرپشك كران وئەو ئەركەیان پێ سپێدرا، بەو شێوەیە هاوەڵانی پێغەمبەری خودا ﷺ باسی دادوەریان كردووە ، ئەوەش ڕوون وئاشكرایە .

---

١٨. رواه أبوداود(٣٥٧٣) ، والترمذي (١٣٢٢) ، وابن ماجه(٢٣١٥) ، وصححه الألباني في (صحيح الجامع)(٤٤٤٣).

## بەشی کەمی کۆبوونەوەی ئەمانەت وهێز لای خەڵك

کۆبوونەوەی هێز وئەمانەت لای خەڵك کەمە ، بۆیە عومەری کوڕی خەتاب رضي الله عنه دەڵێت : ( اللهم أشكو إليك جلد الفاجر ، وعجز الثقة ) .

واتە : پەروەردگار لای تۆ سکاڵای بەهێزی تاوانبار وبێ هێزی وبێ توانایی باوەڕ پێکراوان دەکەم .

پێویستە لە هەموو کاتێکدا شیاوترین کەس ڕابسپێردرێت بە گوێرەی توانا ، ئەگەر دوو کەس هەبوون یەکێکیان ئەمانەت پارێز وئەویتریان بەهێز بوو ، ئەوا کامیان بۆ ئەو ئەرکە سوودی زیاتر وزیانی کەمتر بوو هەڵدەبژێردرێت .

بۆ نموونە لە سەرکردایەتی جەنگدا پیاوی بەهێز وپاڵەوان "ئەگەر چی تاوانیشی هەبێت" باشترە لە پیاوێکی لاواز و بێ توانا "ئەگەرچی ئەمانەت پارێزیش بێت" .

پرسیاریان کرد لە ئیمامی ئەحمەد ، دوو پیاو هەردووکیان کاربەدەست بوون لە جەنگدا یەکێکیان بەهێز وتاوانبار بوو ، ئەوی تریان بێ هێز وپیاوچاك بوو لەگەڵ کامیاندا بجەنگین باشە ؟ وتی : کابرای تاوانباری بەهێز ، هێز وتواناکەی بۆ موسڵمانانە وتاوانبارییەکەی بۆ خۆیەتی ، بەڵام پیاوە چاکە بێ هێزەکە ، چاکیەکەی بۆ خۆیەتی وبێ هێزییەکەی بۆ موسڵمانانە ، لەبەر ئەوە لەگەڵ پیاوە تاوانبارە بە هێزەکەدا بجەنگن ، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت : ((إن الله يؤيد هذا الدين برجل فاجر))[19]، وروی:((بأقوامٍ لاخلاق لهم))[20].

---

١٩. رواه البخاري (٣٠٦٢) ، ومسلم (١١١) .

٢٠. رواه النسائي في السنن الكبرى (٥/٤٥) ، وأحمد في المسند(١٩٩٤١) ، وصححه الألباني في (صحيح الجامع)(١٨٦٦).

واتە : خودا ئەم ئاینە سەر دەخات بە پیاوێکی تاوانبار ، وگێڕدراوەتەوە : بەگەلانێك کە هیچ ئاکار ورەوشتێکی باشیان نییە .

بەڵام ئەگەر کەسی بەهێز نەبوو بۆ بەرپرسیێتی لە جەنگدا باشتر وایە کەسێکی لە خودا ترس بکرێتە بەرپرس .

لەبەر ئەوە پێغەمبەری خودا ﷺ لەو کاتەوە کە خالد موسڵمان بوو بەکاری دەهێنا بۆ سەرکردەی جەنگ ، وفەرمووی : (( إن خالداً سيفٌ سله الله على المشركين ))[21].

واتە : خالد شمشێرێکە خودا هەڵی کێشاوە لەسەر هاوەڵ بڕیاردەران .

لەگەڵ ئەوەشدا خالد هەندێ جار کاری وای دەکرد کە پێغەمبەری خودا ﷺ پێی ناخۆش بوو ، هەتا جارێك هەستا ودەستەکانی بۆ ئاسمان بەرزکردەوە وفەرمووی : ((اللهم إني أبرأ إليك مما فعل خالد))[22].

واتە : پەروەردگار من بەریم لەوەی کە خالد کردوویەتی .

کاتێك کەناردی بۆ (جذيمة) لێی کوشتن ، ومالّ وسامانی بە شێوەیەکی گومان لێکراو بردن کە دروست نەبوو بیبات ، وهەندێك هاوەڵ کە لەگەڵیدا بوون ڕێگری ئەو کارەیان لێکرد ، دواتر پێغەمبەر ﷺ ئاشتی کردنەوە ومالّ وسامانەکەی بۆ گەڕاندنەوە ، لەگەڵ ئەو کردەوانەشی هێشتا بۆ سەرکردەی جەنگ هەڵی دەبژارد ، چونکە لەو ئیشەدا لە هەموو کەسێکی تر باشتر بوو ، ئەو کارانەش کە دەیکرد پاساو ولێکدانەوەی خۆی بۆ هەبوو .

---

21. رواه البخاري (٣٧٥٧) .

22. رواه البخاري(٧١٨٩) .

وئەبوذەر ﵁ لە خالد شایانتر بوو لە ئەمانەت وڕاستگۆییدا ، لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو : (( يا أبا ذر إني أراك ضعيفاً ، وإني أحب لك ما أحب لنفسي ، لا تأمرن على اثنين ، ولا تولين مال يتيمٍ ))[23].

واتە : ئەی ئەبوذەر من تۆ لاواز وبێ هێز دەبینم ، ئەوەی بۆ خۆم پێم خۆشە بۆ تۆش پێم خۆشە ، مەبە فەرمانڕەوا ودەم سپی دووکەس ،ماڵی هەتیویش مەگرە ئەستۆ.

بە باشی نەزانیوە ئەبوذەر ﵁ ببێتە کاربەدەست وفەرمانڕەوا ، چونکە لاواز دەیبینی لەگەڵ ئەوەشدا دەفەرموێت : ((ما أظلت الخضراء ، ولا أقلت الغبراء ، أصدق لهجةً من أبي ذر))[24].

واتە : لە ژێر سایەی ئاسمان ولەسەر ڕووی زەوی کەس لە ئەبوذەر ڕاستگۆتر نییە .

لەبەر ئەوە پێغەمبەری خودا ﷺ جارێك عەمری کوڕی عاصی ﵁ کرد بەکاربەدەست لە شەڕی (ذات السلاسل) ، لەبەر دڵنەوایی کردنی خزمەکانی ، هەر چەند لەو باشتریش هەبوو ، وئوسامەی کوڕی زەیدی کردە کاربەدەست بۆ تۆڵە کردنەوەی باوکی لە ڕۆمەکان ، هەروەها کەسێکی بەکار دەهێنا لەبەر مەبەست وقازانجێکی چاوەڕوان کراو ، لەوانەشە لەگەڵ ئەو کەسەدا کەسی باشتر هەبوو‌بێت لە زانست وباوەڕدا .

وهەروەها ئەبوبەکری جێنیشینی دیسان خالدی بەکار هێنا لە جەنگی دژی هەڵگەڕاوەکان ، ولە ڕزگارکردنی عێراق وشامیشدا ، هەرچەند کەمتەرخەمی لێدەر

---

٢٣. رواه مسلم(١٨٢٦) .

٢٤. رواه الترمذي(٣٨٠١) ، وابن ماجه(١٥٦) ، وصححه الألباني في (صحيح الجامع)(٥٥٣٧).

دەکەوت کە پاساو ولـێکدانەوەی تایبەتی خۆی هەبوو ، هەندێك جار وایان دەگێڕایەوە کە لـەبەر ئارەزوو وادەکات[٢٥] ، بەڵام هەر لـەسەر کار لای نەدەبرد ، سەرزەنشتی دەکرد ووای بەباش دەزانی کە مانەوەی لـە کەنارگیرکردنی قازانجی زیاترە ، وکەسی تر نەبوو وەکو ئەو جەنگەکان بەڕێوە ببات ، ئەگەر کاربەدەستی گەورە بە سروشت نەرمونیان بوو پێویستە فەرمانبەرەکەی سروشتی توند بێت ، وبە پێچەوانەشەوە ئەگەر کار بەدەستی گەورە بە سروشت توند بوو پێویستە سروشتی فەرمانبەرەکەی نەرمونیان بێت بۆ ئەوەی کارەکان بە باشی بەڕێوە بچن وڕاست ڕاوەستن ، بۆیە ئەبوبەکر مانەوەی خالـدی پێ باش بوو بەڵام عومەر لابردنی ودانانی ئەبوعوبەیدەی لـە شوێنی پێ باش بوو ، چونکە خالـد توند بوو وەکو عومەر وئەبو عوبەیدەش نەرمونیان بوو وەکو ئەبوبەکر ، بۆیە واباش بوو هەریەکەیان ئەوەی کە پێیان باش بوو بە فەرمانبەری خۆیان هەڵـبژێرن بۆ ئەوەی فەرمانەکان بە دادگەرانە بەڕێوە بچن ، بەوەش دەبنە جێنیشینی پێغەمبەر ﷺ کە دادپەروەر بوو ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : (( أنا نبي الرحمة ))[٢٦].

واتە : من پێغەمبەری ڕەحمەت وبەزەییم .

و(( أنا نبي الملحمة ))[٢٧].

ومن پێغەمبەری داستان ونەبەردیم .

---

٢٥. بە هیچ شێوەیەك هاوەڵە بەڕێزەکانی پەیامبەری خودا ﷺ کاروبار وبەرپرسیارێتی گشتییان بۆ حەز وئارەزوو وبەرژەوەندی تایبەت بە کارنەهێناوە ، بەڵام دەکرێت ئیجتیهاد ولێکدانەوەی هەڵە ڕوویدا بێت .

٢٦. رواه مسلم (٢٣٥٥) .

٢٧. رواه أحمد(١٩١٢٤) ، وابن حبان في صحيحه (٦٣١٤) ، والطبراني ، وصححه الألباني في (صحيح الجامع)(١٤٧٣).

ودەفەرموێت : (( أنا الضحوك القتّال ))[28].

واتە : من دەم بە پێکەنینی جەنگاوەرم .

وئوممەتەکەشی ئوممەتێکی دادوەرە ، خودا لەباسیاندا دەفەرموێت : ﴿أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ۝٢٩﴾(الفَتْح) .

واتە : توندن لەگەڵ بێباوەڕان ولەگەڵ خۆیاندا بە بەزەیین .

ودەفەرموێت : ﴿أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ۝٥٤﴾(المَائِدَة) .

واتە : لەگەڵ بڕواداراندا بێ فیز وسەرکزن ، وبە هێز وتوندن لەگەڵ بێبڕواکان .

بۆیە کاتێك ئەبو بەکر وعومەر رضي الله عنهما بوونە جێنیشین پێکەوە وێنەی فەرمانڕەوایەکی تەواو بوون ، وداد ئەوە بوو کە لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ هەندێك جار لایەنگری نەرمونیانی یەکێکیانی دەکرد و هەندێك جار لایەنگری توندی ئەوی تر ، تا لە ئاستیاندا دەفەرموێت : (( اقتدوا بالذين من بعدي أبي بكر وعمر ))[29].

---

٢٨. ذكره ابن كثير في سورة التوبة في تفسيره قوله تعالى : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَٰتِلُوا۟ ٱلَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ ٱلْكُفَّارِ وَلْيَجِدُوا۟ فِيكُمْ غِلْظَةً ۚ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ ۝١٢٣﴾(التَّوْبَة) ، ولم يذكر له سنداً ، ورواه أبونعيم في دلايل النبوة من طريق ابن لهيعة عن أبي الاسود عن عروة بن الزبير ، وجاء في (سبل الهدى والرشاد) (٤٨٣/١) : ((أنا الضحوك القتال)) ، قال : روى ابن فارس عن ابن عباس قال : اسم النبي ﷺ في التوراة : (( الضحوك القتال )) ، ذكر سند ابن فارس السيوطي في كتابه (الرياض الأنيقة)(٢٠٢) قال : قال ابن فارس : حدثنا سعيد بن محمد بن نصر حدثنا بكر بن سهل الدمياطي ، حدثنا عبد العزيز بن سعيد عن موسى بن عبد الرحمن عن ابن جريج عن عطاء عن ابن عباس قال : (اسمه في التوراة : أحمد الضحوك القتال) .

٢٩. رواه الترمذي (٣٦٦٣) ، وابن ماجه(٩٧) ، وصححه الألباني في (صحيح الجامع)(١١٤٢) .

واته : شوێنی ئەو دووانەی دوای من بکەون ئەبوبەکر وعومەر رضي الله عنهما .

لە ئەبوبەکرەوە رضي الله عنه لە شەڕی دژی هەڵگەڕاوەکان بەجەرگییەکی وا دەرکەوت ، کە لە عومەر رضي الله عنه وهیچ هاوەڵێکی تر دەرنەکەوت ، ئەگەر فەرمانڕەوایی پێویستی بە پیاوی زۆر دەستپاك بوو پێویستە ئەمانەت پارێزێك پێش بخرێت بۆ پارێزگاری لە ماڵ وهاوشێوەکانی ، بەڵام ئەگەر بۆ بەدەستهێنانی ماڵ وپارێزگاری کردنی بوو پێویستە کەسێکی بە هێزی تیادا بکرێت بە کاربەدەست بۆ کۆکردنەوە ودەرهێنانی ولە هەمان کاتدا ئەمینداریش بێت وبیپارێزێت بە پسپۆری وئەمانەت پارێزییەکەی ، هەروەها کاربەدەستی جەنگ ، ئەگەر کاربەدەستی گەورە فەرمانی دا بەڕاوێژکاری کەسانی زانا ولە خوداترس ئەوا دوو سوودی کۆکردووەتەوە ، وهەروەها لە هەموو ئیش وکارێکدا ئەگەر زانرا کارەکە بەیەك کەس بەڕێوە ناچێت دەتوانرێت کارەکە بە زیاتر لە کەسێك بسپێردرێت ، ولەم بارەشدا باشترینەکە دەست ڕۆیشتووتر دەکرێت .

ولە ناوبژیوانی ودادوەری ، زاناترین ودونیا نەویستترین ولێهاتووترین پێش دەخرێت ، ئەگەر یەکێك زانا بوو وئەویتر دونیا نەویست ، ئەگەر پرسەکە "ڕوون ودیار بوو ترسی تێکەڵاوبوونی ئارەزووی لێدەکرا" دونیا نەویستەکە پێش دەخرێت ، بەڵام ئەگەر پرسەکە "نادیار بوو وترسی لێ تێك چوونی لێدەکرا" زاناکە پێش دەخرێت ، لە فەرمودەیەکدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : (( إن الله يحب البصر النافذ عند ورود الشبهات ، ويحب العقل الكامل عند حلول الشبهات ))[٣٠].

---

٣٠. رواه القضاعي في مسند الشهاب (١٠٨٠) ، وأبونعيم في حلية الاولياء(١٩٩/٦) ، والبيهقي في (الزهد الكبير)(ص/٣٤٦) ، أورده الحافظ ابن حجر في كتابه (المطالب العالية) ونبه عليها أنها موضوعة كلها ، وقال الألباني في (الأحاديث الضعيفة)(ص١٣) : ومما يحسن التنبيه عليه أن كل ما ورد في فضل العقل من الأحاديث لا يصح منها شيء وهي تدور بين الضعيف و الموضوع وقد تتبعت ما أورده منها أبو بكر بن أبي الدنيا في كتابه (العقل وفضله) فوجدتها كما ذكرت لا يصح منها شيء .

واتە : لە کاتی هەبوونی گوماندا خودا بینەری وردکاری پێخۆشە ، ولە کاتی هەبوونی ئارەزووەکان دا خودا ژیرێکی تەواوی پێخۆشە .

وئەم دووانە پێش دەخرێن بەسەر لێهاتوودا ، ئەگەر دادوەر پشتگیری تەواوی لێکرا لە لایەن کاربەدەستی جەنگەوە یان لەلایەن کاربەدەستی گەورەوە .

ولێهاتوو پێش دەخرێت ئەگەر دادوەری پێویستی بەتوانایی ولێهاتوویی هەبوو ، چونکە لەم کاتەدا بەهێزی پێویست ترە لە زانست ودونیا نەویستی ، دادوەری ڕەها (مطلق) پێویستە زانا ودادپەروەر وبەتواناش بێت ، وهەروەها هەموو کاربەدەستێکی موسڵمانان ، ئەگەر هەریەکە لەو خەسڵەتانەی نەبێت کەموکورتی لە کارەکەیدا دەردەکەوێت .

لێهاتوویی یان بەهێز وترساندن دەبێت یان بە چاکە ویستی دەبێت ، ولە ڕاستیدا هەردووکیان پێویستە ، پرسیار لە زانایەك کراوە : ئەگەر کەست دەست نەکەوت ببێتە دادوەر ، جگە لە کەسێکی زانای تاوانبار ونەزانێکی لە خودا ترس ، کامیان پێش دەخرێت ؟ لە وەڵامدا وتی : ئەگەر پێویستی بە ئاین زیاتر بوو بە هۆی زۆری خراپەوە ، لە خودا ترسەکە پێش دەخرێت ، وئەگەر پێویستی بە زانست زیاتر بوو لەبەر دیار نەبوونی فەرمانەکان زاناکە پێش دەخرێت ، زۆربەی زانایان لە خودا ترس پێش دەخەن ، چونکە پێشەوایان کۆڕان لەسەر ئەوەی کەسێك ببێتە کاربەدەست پێویستە دادوەر بێت وخاوەن بەڵێن بێت ، وجیاوازن لە مەرجی زانست ، ئایە پێویستە موجتهدبێت ؟ یان دروستە لاساییکەرەوە (مقلد) بێت ؟ یان پێویستە شیاوترین کەسی بەردەست بەکاربهێنرێت ؟ زانایان سێ بۆچوونیان هەیە ، ئێرە شوێنی درێژە پێدانی نییە ، لەگەڵ ئەوەی کە دروستە کەسی نەشیاو کاربگرێتە دەست لەبەر پێویستیەك ، ئەگەر لەو

باشتر نەبوو ، لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە هەوڵی چاککردنی ژیانی خەڵکی بدرێت ، هەتا خەڵکی ئەوەی کە پێویستیانە بە دەستی بهێنن ، لە کاربەدەستان وفەرمانڕەواکان .

وەك چۆن کەسێکی قەرزار کە ناتوانێت قەرزەکەی بداتەوە پێویستە هەوڵی دانەوەی بدات ، ئەگەرچی لەو کاتەدا تەنها ئەوەی لە توانایدایە داوای لیّ دەکرێت ، وهەروەها خۆ ئامادەکردن بۆ تێکۆشان پێویستی بەهێز کۆکردنەوە وئامادەکردنی ئەسپ وسوارییەکان هەیە ، بەڵام لەسەر کەسێك کە نەتوانێت پێویست نییە ، چونکە هەرشتێك فەرمانێك تەواو بکات ئەو شتە پێویست دەبێت ، بەپێچەوانەی حەج وهاوشێوەکانی ، لەبەر ئەوەی ئەم فەرمانە بە خۆی نەبێت تەواو نابێت .

# بەشی ناسینی باشترین

گرنگترین شت لەم بەشە ناسینی باشترینە ، ئەوەش بە زانینی مەبەستی کاربەدەستی دەبێت ، وناسینی ڕێگای مەبەست ، ئەگەر مەبەستەکان وهۆیەکانی زانران فەرمانەکە بە باشی بەڕێوە دەچێت ، بەڵام لە بەرئەوەی زۆربەی پادشاکان مەبەستیان دونیایە نەك ئاین ، کەسانێك پێش دەخەن کە یارمەتیدەریان بێت بۆ ئەو مەبەستانە ، وهەرکەسێك داوای سەرۆکایەتی بۆ خودی خۆی بکات ، حەز دەکات کەسانێك ببنە کاربەدەستی کە هاوکاری سەرۆکایەتییەکەی بکەن ، وسوننەت وایە ئەو کەسەی نوێژی هەینی ونوێژی بەکۆمەڵ بۆ موسڵمانان دەکات ووتاریان بۆ دەخوێنێت ، هەر ئەوانیش پێشەوای جەنگ وکاربەدەستی سوپابن ، لەبەر ئەوە کاتێك پێغەمبەر ﷺ ئەبوبەکری لە نوێژدا پێش خست موسڵمانان هەڵیان بژارد بۆ کاربەدەستی جەنگ وهەموو ئیش وکارەکانیان .

پێغەمبەر ﷺ ئەگەر کەسێکی بکردایەتە کاربەدەستی جەنگ ، هەر ئەو پێش نوێژی بۆ دەکردن ، وکەسێکی بکردایەتە جێگر بەسەر شارێکەوە ، وەك چۆن عتابی کوڕی ئوسیدی بەکارهێنا لەسەر مەککە ، وعثمانی کوڕی ئەبوالعاص لەسەر تائیف ، وعەلی وموعاذ و ئەبوموسی لەسەر یەمەن ، وعەمری کوڕی حەزم لەسەر نەجران ، هەر ئەوان پێش نوێژی خەڵك وسنورە شەرعیەکانیان جێبەجێ وپیادە دەکرد (إقامة الحد) وشتەکانی تر ، کە سەرکردەکانی جەنگ پێی هەڵدەستان ، وجێنشینەکانی دوای خۆی وپادشا ئومەویەکان وهەندێك لە عەباسیەکان هەروایان دەکرد ، لەبەر ئەوە گرنگترین ئیشەکانی ئاین نوێژ وجیهاد وتێکۆشانە ، لەبەر ئەوەشە زۆربەی فەرموودەکانی پێغەمبەری خودا ﷺ لەبارەی نوێژ وجیهاد وتێکۆشانەوەیە ، وکاتێك سەردانی

نەخۆشێکی بکردایە دەیفەرموو : ((اللهم أشف عبدك ، يشهد لك صلاةً ، وينكأ لك عدواً))[٣١].

واتە : پەروەردگار بەندەکەت چارەسەر بکە بۆ ئەوەی نوێژت بۆ بکات وبەڵا وشکست بەسەر دوژمنەکانتا بهێنێت .

وکاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ موعاذی نارد بۆ یەمەن پێی فەرموو: (( يا معاذ إن أهم أمرك عندي الصلاة ))[٣٢].

واتە : ئەی موعاذ گرنگترین کاری تۆ لای من نوێژە .

وعومەری کوڕی خەتاب رضي الله عنه بۆ کاربەدەستەکانی دەنووسی : (گرنگترین کارەکانی ئێوە لای من نوێژە ، ئەوەی نوێژەکانی بپارێزێت ئاینی پارێزراو دەبێت ، وئەوەی لە دەستیان بدات ئەوە کارەکانی تری زۆر بەئاسانی لە دەست دەدات) ، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : (( الصلاة عماد الدين ))[٣٣].

واتە : نوێژ کۆڵەکەی ئاینە .

ئەگەر فەرمانبەر پارێزگاری لە کۆڵەکەی ئاینەکەی کرد ، ئەوە نوێژ دووری دەخاتەوە لە کار وقسەی خراپ ، ونوێژ پاڵنەری خەڵکە بۆ ئەنجامدانی کارە باشەکانی تر ، وەك خودای پەروەردگار دەفەرموێت : ﴿وَٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى ٱلۡخَٰشِعِينَ ۝٤٥﴾(البَقَرَة) .

---

٣١. رواه ابوداود(٣١٠٧) ، وحسنه الألباني في (صحيح الجامع)(٤٦٦).

٣٢. ضعفه الألباني في (مشكاة المصابيح )(١٢٩/١) ، موقوفاً عن عمر بن الخطاب رضي الله عنه .

٣٣. رواه الديلمي (٢٥٥/٢) ، وضعفه الألباني في (ضعيف الجامع)(٣٥٦٦،١٧٠) ، و(الضعيفة)(٢٧٦/٨).

واته : پەنا ببەنە بەر ئارامگرتن ونوێژ ، بەڕاستی نوێژ شتێکی ئاسان نییە وگەورەیە لای کەسە ملکەچەکان نەبێت بۆ فەرمانی خودا .

ودەفەرموێت : ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسْتَعِينُواْ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴿١٥٣﴾﴾(البَقَرَة).

واته : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە پەنا ببەنە بەر ئارامگرتن ونوێژ بەڕاستی خودا لەگەڵ ئارامگراندایە .

وبە بەندە وپێغەمبەرەکەی ﷺ دەفەرموێت : ﴿وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصْطَبِرْ عَلَيْهَا ۖ لَا نَسْـَٔلُكَ رِزْقًا ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكَ ۗ وَٱلْعَـٰقِبَةُ لِلتَّقْوَىٰ ﴿١٣٢﴾﴾(طه).

واته : فەرمان بەکەس وکارت بکە بە نوێژ وخۆیشت ئارام بگرە لەسەر ئەنجامدانی بەو شێوەیەی فەرمانت پێکراوە ، داوای ڕۆزیت لێ ناکەین ئێمە ڕۆزیت دەدەین وپاشەڕۆژیش بۆ پارێزکارانە .

وپەروەردگار دەفەرموێت : ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ مَآ أُرِيدُ مِنْهُم مِّن رِّزْقٍ وَمَآ أُرِيدُ أَن يُطْعِمُونِ ﴿٥٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلْقُوَّةِ ٱلْمَتِينُ ﴿٥٨﴾﴾ (الذَّارِيَاتِ) .

واته : من مرۆڤ وجنم دروست نەکردووە بۆ پەرستنم نەبێت ، ڕۆزیم لێیان ناوێت ونامەوێت نان بدەن ، پەروەردگار ڕۆزی دەرە وخاوەنی توانا وهێزی پتەوە .

مەبەستی لەکاربەدەستی : چاك کردنی ئاینی خەڵکە هەرکاتێك لە دەستیان چوو ئەوا دۆڕانێکی ئاشکرا دۆڕاون ، هیچ خۆشی وئاسودەییەکی دونیا سوودیان پێناگەیەنێت ، وئاین بە دوو شت لە ئیش وکاری دونیا پیادە دەکرێت : دابەش کردنی ماڵ لە نێوان شایستەکان ، وسزادانی دەست درێژیکاران ، ئەوەی دەست درێژیکار نەبێت ئاین ودونیای باش دەبێت ، لەبەر ئەوە عومەری کوڕی خەتاب رضي الله عنه دەڵێت : (من فەرمانبەرەکانم ناردووە بۆ ئێوە ، بۆ ئەوەی فێری کتێبی خودا وسوننەتی پێغەمبەرتان ﷺ بکەن ، وئەو شتانە دابەش بکەن بەسەرتاندا کە لە جەنگدا دەستتان دەکەوێت) ، بەڵام لەبەر ئەوەی کاربەدەستان گۆڕاون لەلایەك وخەڵکیش لەلایەکی تر ، کارەکان پێچەوانە بوونەتەوە ، ئەگەر کاربەدەست هەوڵی چاك کردنی ئاین ودونیای خەڵکی دا بە گوێرەی توانا ، ئەو کەسە باشترین کەسی سەردەمەکەیەتی ، وباشترین تێکۆشەری ڕێگای خودایە ، گێڕدراوەتەوە : (( يوم من إمام عادل ، خيرٌ من عبادة ستين سنة ))[٣٤].

واتە : ڕۆژێکی دادوەرانە لە کاربەدەستێك ، باشترە لە خودا پەرستی شەست ساڵ .

ولە موسنەدی ئیمامی ئەحمەد دا هاتووە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : (( أحب الخلق الى الله إمام عادل ، وأبغضهم إليه إمامٌ جائر ))[٣٥].

واتە : خۆشەویسترین کەس لای خودا کاربەدەستێکی دادپەروەرە ، وبێزراوترینیان کاربەدەستێکی ستەمکارە .

---

٣٤. رواه الطبراني في المعجم الكبير(١١/٣٣٧) ، والبيهقي في شعب الايمان (٧٣٧٩) ، وضعفه الألباني في (ضعيف الترغيب)(١٣١٧).

٣٥. رواه الترمذي (١٣٢٩) ، وضعفه الألباني في (ضعيف الجامع)(١٣٦٣).

ولە هەردوو صەحیحەکەدا لە ئەبوهورەیرە ڕیوایەت کراوە : پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (( سبعة يظلهم الله في ظله يوم لا ظل إلا ظله ، إمامٌ عادل ، وشاب نشأ في طاعة الله ، ورجلُ قلبه معلق بالمساجد إذا خرج منه حتى يعود إليه ، ورجلان تحابا في الله ، إجتمعا على ذلك وتفرقا عليه ، ورجل ذكر خالياً ففاضت عيناه ، ورجل دعته إمرأة ذات منصب وجمالٍ فقال : إني أخاف الله رب العالمين ، ورجل تصدق بصدقةٍ فأخفاها ، حتى لا تعلم شماله ما تنفق يمنه ))(٣٦).

واتە : حەوت کەس خودا دەیانخاتە ژێر سێبەری عەرشی خۆیەوە لە ڕۆژێکدا هیچ سێبەرێك نییە جگە لە سێبەری عەرشی ئەو نەبێت ، کاربەدەستێکی دادپەروەر ، وگەنجێك لە گوێڕایەڵی خودا دا پێگەیشتبێت ، وپیاوێك دڵی وابەستەی مزگەوت بێت کاتێك لێی دەردەچێت هەتاکو دەگەڕێتەوە بۆی ، ودووکەس یەکتریان لەبەر خودا خۆش بوێت ، لەسەر ئەوە کۆببنەوە ولەسەر ئەوەش جیاببنەوە ، وکەسێك بەتەنها یادی خودا بکات وچاوەکانی فرمێسك بڕێژن ، وپیاوێك ئافرەتێکی خاوەن دەسەڵات ودەوڵەمەند وجوان بانگی بکات بۆ کاری خراپ بڵێ من لە خودا دەترسم ، وکەسێك ماڵێك ببەخشێت وبیشارێتەوە ، دەستی چەپی نەزانێت بەدەستی ڕاستی چی بەخشیوە .

ولە صەحیحی مسلم لە عیاضی کوڕی حمارەوە هاتووە : پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (( أهل الجنة ثلاث : ذوسلطان مقسط ، ورجلٌ رحيم رقيق القلب بكل ذي قربى ومسلمٍ ، ورجلٌ غنيٌ عفيف متصدق ))(٣٧).

واتە : خەڵکی بەهەشت سێ جۆرە کەسن : خاوەن دەسەڵاتێکی دادپەروەر ، وپیاوێکی میهرەبانی دڵ ناسك بەهەموو خزم وموسڵمانێك ، وپیاوێکی دەوڵەمەندی دەستپاکی چاکەکار .

---

٣٦. رواه البخاري(٦٦٠) ، ومسلم(١٠٣١).

٣٧. رواه مسلم (٢٨٦٥).

ولە سونەنەکاندا لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ ڕیوایەتیان کردووە دەفەرموێت : ((الساعي على الصدقة بالحق كالمجاهد في سبل الله))[٣٨].

واتە : ئەو کەسەی هەوڵی کۆکردنەوەی ماڵی خێر دەدات بە باشی ورەوایەتی وەکو تێکۆشەری ڕێگای خودایە .

وخودای پەروەردگار کاتێك فەرمان بە تێکۆشان دەکات دەفەرموێت : ﴿وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِۚ ۝٣٩﴾(الأنفَال) .

واتە : بجەنگن لە گەڵیان هەتاکو هاوەڵ بڕیاردان نەمێنێت وئاین وپەرستش تەنها بۆ خودا بکرێت .

بە پێغەمبەری خودا ﷺ وترا : ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ کەسێك دەجەنگێت لەبەر بەجەرگی یان لەبەر دەمارگیری یان لەبەر ڕووپامایی کام لەوانە لە ڕێگای خودایە ؟ فەرمووی : (( من قاتل لتكون كلمة الله هي العليا فهو في سبيل الله ))[٣٩].

واتە : هەرکەس بجەنگێت بۆ ئەوەی وشەی خودا بەرز وبڵند بێت ئەوە لە ڕێگای خودایە.

مەبەست ئەوەیە ئاین هەمووی بۆ خودا بێت ، وشەی خودا بەرز وبڵند بێت ، و(كلمة الله) ناوێکی کۆکەرەوەیە بۆ هەموو ئەو وشانەی کە قورئان لە خۆی گرتوون ،

---

٣٨. رواه أبوداود (٢٩٣٦) ، والترمذي(٦٤٥) ، وابن ماجه (١٨٠٩) ، وقال الألباني في (صحيح الترغيب)(٧٧٣) : حسن صحيح.

٣٩. رواه البخاري (١٣٢) ، ومسلم (١٩٠٤).

وهەروەها خودای پەروەردگار دەفەرمویت : ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ ۝٢٥﴾(الحَدِيد) .

واتە : ئێمە پێغەمبەرانمان ناردووە بە بەڵگەی ڕوون وئاشکرا وبەواندا کتێب وپێوەری دادپەروەریمان ناردووە ، بۆ ئەوەی خەڵکی بەداد بەڕێوەبەرن .

واتە : مەبەست لە ناردنی پێغەمبەران ودابەزینی کتێبەکان بۆ ئەوەیە خەڵك دادوەرانە بەڕێوە ببرێن ، لە مافەکانی خودا ومافی خەڵکیش .

دوای ئەوەش خودا دەفەرمویت : ﴿وَأَنزَلْنَا ٱلْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥ وَرُسُلَهُۥ بِٱلْغَيْبِ ۝٢٥﴾(الحَدِيد).

واتە : ئاسنمان ناردووەتە خوارەوە بۆ سزادانی ئەو کەسانەی ڕێگرن لە ڕێگای ڕاست ، وبۆ سود وقازانجی خەڵکی ، بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە کە کێ مەبەستی سەرخستنی خودا وپێغەمبەرەکەیەتی ﷺ بە پەنهان .

ئەوەی لە قورئان دەربچێت دەهێنرێتەوە سەر بنچینە ڕاستەکەی ، لەبەر ئەوەشە بەڕێوەچوونی ئاین بە قورئان وشمشێرە .

ولە جابری کوڕی عبداللەوە رضي الله عنهما دەگێڕنەوە دەڵێت : پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردین بەمە "واتە : بە شمشێر" بدەین لە هەرکەسێك پشت لەمە دەکات "واتە : قورئان".

ئەگەر ئەوە مەبەستەکە بوو پشت بە شیاوترین کەس بۆ ئەو مەبەستە دەبەسترێت ، وسەیری ئەو دوو کەسە دەکرێت ، کامیان نزیکتر بوو لەو کارە دەکرێت بەکار

بەدەست ، بۆ نموونە ئەگەر کارەکە تەنها پێش نوێژی بوو ، ئەو کەسە پێش دەخرێت کە پێغەمبەر ﷺ پێشی خستووە وەك دەفەرموێت : (( يؤم القوم أقرؤهم لكتاب الله ، فإن كانوا في القراءة سواء فأعلمهم بالسنة ، فإن كانوا في السنة سواء فأقدمهم هجرة ، فإن كانوا في الهجرة سواء فاقدمهم سنناً ، ولا يؤمن الرجل الجل في سلطانه ، ولا يجلس في بيته على تكرمته إلا بإذنه ))[٤٠].

واتە : کەسێك پێش نوێژی کۆمەڵێك دەکات کە لە هەموویان زیاتر قورئانی لەبەر بێت ، ئەگەر لە قورئان لەبەر کردن وەك یەك بوون کامیان زاناتر بوو بە سوننەت ، ئەگەر لە سوننەتیش وەك یەك بوون کێ زووتر کۆچی کردبێت ، ئەگەر لەوەشدا وەك یەك بوون کێ لە تەمەندا گەورەتر بوو پێش دەخرێت ، وهیچ کەسێك پێش نوێژی کەسێك نەکات لە ماڵی خۆیدا ، ودانەنیشێت لە شوێنی تایبەتی خاوەن ماڵەکەدا بە ڕوخسەتی ئەو نەبێت .

ئەگەر دوو پیاو وەك یەك لێهاتوو بوون ، ونەزانرا کامیان باشترە ، تیروپشك دەکرێت لە نێوانیان ، وەك چۆن سەعدی کوڕی ئەبووەقاص تیروپشکی کرد لە نێوان خەڵکدا لە ڕۆژی قادسیە ، کاتێك لەسەر بانگدان دەمەقاڵەیان بوو ، بەکارکردن بەو فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێت : (( لو يعلم الناس ما في النداء والصف الأول ، ثم لم يجدوا إلا أن يستهموا عليه لاستهموا ))[٤١].

واتە : ئەگەر خەڵکی بزانن چ پاداشتێك لە ڕیزی یەکەم وبانگداندا هەیە ، ئینجا ئەوەیان دەست نەکەوێت بە تیروپشك نەبێت ئەوا تیروپشکیان بۆ دەکرد .

ئەگەر پێشخستن بە فەرمانی خودا بوو بە ئاشکرا ، یان بەکردەوە "بەتیروپشك کاتێك شاراوە بوو" ئەوە کاربەدەست ئەو ئەمانەتەی کە لەسەرییەتی لە فەرمانڕەوایەتی دا لە جێگەی خۆی دایناوە .

---

٤٠. رواه مسلم (٦٧٣).

٤١. رواه البخاري(٦١٥) ، ومسلم(٤٣٧).

## بەشی سامان وداهات

بابەتی دووەم لە کاربەدەستی وئەمانەت : بریتییە لە سامان وداهات ، وەك پەروەردگار لەسەر قەرز دەفەرمویێت : ﴿فَإِنۡ أَمِنَ بَعۡضُكُم بَعۡضٗا فَلۡيُؤَدِّ ٱلَّذِى ٱؤۡتُمِنَ أَمَٰنَتَهُۥ وَلۡيَتَّقِ ٱللَّهَ رَبَّهُۥۗ ﴿٢٨٣﴾﴾(البَقَرَة) .

واتە : ئەگەر ئەو کەسەی قەرز دەکات وئەوەش قەرزی لێدەرێت متمانە هەبوو لە نێوانیاندا ، با ئەو کەسەی ئەمانەتەکەی پێدراوە بیداتەوە ولە خودا بترسێت وپارێزکاربێت.

وهەروەها کاڵا وقەرزی گشتی وتایبەت لەم بابەتەیە بۆ نموونە گەڕانەوەی ئەمانەت ، ومالّی هاوەڵ (شريك) ، ومالّی بریکار ، ومالّی کەسێك کە پارەیەکت بداتیّ ئیش وکاری پێبکەیت ، ومالّی ئەو کەسەی دەبێتە سەرپەرشتیار بەسەرییەوە لە مالّی هەتیو ومالّی خێر وچاکە وهاوشێوەکانی ، ودانەوەی قەرزی فرۆشراو ، وبارمتەی لەبری قەرز وەرگیراو ، ومارەیی ئافرەت ، وکرێی ئەو شتانەی کە سودیان لیّ وەردەگیرێت ..هتد .

خودا دەفەرمویێت : ﴿۞إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ خُلِقَ هَلُوعًا ﴿١٩﴾ إِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ جَزُوعٗا ﴿٢٠﴾ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلۡخَيۡرُ مَنُوعًا ﴿٢١﴾ إِلَّا ٱلۡمُصَلِّينَ ﴿٢٢﴾ ٱلَّذِينَ هُمۡ عَلَىٰ صَلَاتِهِمۡ دَآئِمُونَ ﴿٢٣﴾ وَٱلَّذِينَ فِيٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ حَقّٞ مَّعۡلُومٞ ﴿٢٤﴾ لِّلسَّآئِلِ وَٱلۡمَحۡرُومِ ﴿٢٥﴾ ﴾ هەتاکو ئەوەی کە دەفەرمویێت : ﴿وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِأَمَٰنَٰتِهِمۡ وَعَهۡدِهِمۡ رَٰعُونَ ﴿٣٢﴾﴾(المَعَارِج) .

واتە : بەڕاستی مرۆڤی بێباوەڕ بەشێوەیەك دروست کراوە کە خراپەی تووش بوو بێزار ودڵتەنگ دەبێت ، وئەگەر تووشی خێر وچاکە بوو ڕژدی دەکات ، ئەو کەسانە نەبێت کە نوێژ دەکەن ولەسەری بەردەوامن وزەکاتی مالّ وسامانەکەیان دەردەکەن

ودەیدەن بەو کەسانەی داوایان لێ دەکەن لەبەر نەبوونی وئەوانەش کەبێ ماڵ وسامانن ... هەتا ... ئەو کەسانەش پارێزگاری ئەمانەتەکانیان دەکەن وبەڵێنەکانیان دەپارێزن .

وپەروەردگار دەفەرموێت : ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ لِتَحۡكُمَ بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُۚ وَلَا تَكُن لِّلۡخَآئِنِينَ خَصِيمٗا ١٠٥﴾(النِّسَاءِ).

واتە : ئێمە قورئانمان بۆ دابەزاندوویت بە حەق بۆ ئەوەی دادوەری بکەیت لە نێوان خەڵك بەوەی کە خودا فێری کردوویت ، وبەهیچ شێوەیەك پشتگیری ناپاکان مەکە .

وپێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : (( أدِّ الأمانة إلى من ائتمنك ، ولا تخن من خانك ))[٤٢].

واتە : ئەمانەت بدەوە دەستی ئەو کەسەی لای داناویت ، وناپاکی مەکە لەگەڵ کەسێك کە ناپاکیت لێدەکات .

وديسان پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : (( المؤمن من أمنه المسلون على دمائهم وأموالهم ، والمسلم من سلم المسلمون من لسانه ويده ، والمهاجر من هجر ماهى الله عنه ، والمجاهد من جاهد نفسه في ذات الله ))[٤٣].

واتە : باوەڕدار کەسێکە کە موسڵمانان ئەمینبن لێی لە خوێن وماڵیان ، وموسڵمان دەبێت موسڵمانان لەدەم ودەستی پارێزراوبن ، وکۆچکەر کەسێکە کە دوور بکەوێتەوە لەوەی خودا پێی ناخۆشە ، وتێکۆشەر کەسێکە تەنها لەبەر خودا تێبکۆشێت .

---

٤٢. ورواه أبوداود(٣٥٣٥) ، والترمذي(١٢٦٤) ، وصححه الألباني في (صحيح الجامع)(٢٤٠).

٤٣. قوله : (( المؤمن من أمنه المسلون على دمائهم وأموالهم )) رواه الترمذي(٢٦٢٧) ،والنسائي(٤٩٩٥) ، وصححه الألباني في صحيح الجامع(٦٧١٠) ، قوله : (( المسلم من سلم المسلمون من لسانه ويده ، والمهاجر من هجر ماهى الله عنه )) رواه البخاري(١٠) واللفظ له ، ومسلم(٤٠) ، وقوله : (( المجاهد من جاهد نفسه في ذات الله )) صححه الألباني في (صحيح الجامع)(٦٦٧٩) دون قوله : ((في ذات الله)).

ئەو فەرموودەیە صەحیحە وبەشێکی لە هەردوو صەحیحەکەدا هاتووە وبەشەکەی تری لە سوننەنی الترمذی هاتووە ، وپێغەمبەری خودا ﷺ دیسان دەفەرمویێت : (( من أخذ أموال الناس يريد أداءها أداها الله عنه ، ومن أخذها يريد إتلافها أتلفه الله ))[٤٤].

واتە : هەر کەسێك ماڵی خەڵکی ببات وبیەوێت بیداتەوە خودا دانەوەی بۆ ئاسان دەکات ، وهەرکەسێك بیەوێت بە فیڕۆی بدات خودا لە ناوی دەبات .

ئەگەر خودا پێویستی کردبێ ئەو ڕاسپاردانەی کە بەئاسایی دەبرێن بەباشی بدرێنەوە ، بۆ ئەوە سەرنجمان ڕادەکێشێت کە داگیرکراو ودزی وناپاکی وهەر ستەمێکی تر پێویستترە بگەڕێندرێنەوە بۆ خاوەنەکانیان ، وهەروەها شتە خوازراوەکان (استعارە) ، وپێغەمبەری خودا ﷺ لە وتاری حەجی ماڵ ئاواییدا فەرمووی : (( العارية مؤداة ، والمنحة مردودة ، والدين مقضي ، والزعيم غارم ، إن الله قد أعطى كل ذي حق حقه ، فلا وصية لوارث))[٤٥].

واتە : ئەو شتەی دەخوازرێت (استعارە) دەبێت بدرێتەوە ، وئەو شتەی بۆ ماوەیەکی کاتی دەبرێت وسودی لێوەردەگیرێت دەبێت بگەڕێنرێتەوە ، وقەرز دەدرێتەوە ، وئەو کەسەش دەبێتە بریکاری قەرزارێك بەرپرسە وقەرزارە هەتاکو قەرزارەکە قەرزی خاوەنەکەی دەداتەوە ، بەڕاستی خودا مافی هەموو خاوەن مافێکی داوە ، ومیراتگران وەسیەتیان بۆ ناکرێت .

---

٤٤. رواه البخاري(٢٣٨٧).

٤٥. رواه أبوداود(٣٥٦٥) ، والترمذي(٢١٢٠) ، وابن ماجه(٢٣٩٨، ٢٧١٣) ، وصححه الألباني في (صحيح أبي داود).

ئەم بەشە کاربەدەستان وخەڵکیش دەگرێتەوە ، هەریەکە لەوان پێویستە ئەو ئەرك ومافانەی لەسەریانە بە باشی ڕاپەڕێنن ، لەسەر خاوەن دەسەڵات وکاربەدەستەکانی لە ماڵ بەخشیندا پێویستە مافی هەموو خاوەن مافێك بدەن ، وخەزنەدارەکانی وەك سەرۆك دیوان پێویستە ئەوەی لەسەریانە بەرامبەر بەکاربەدەست بە باشی ڕاپەڕێنن ، ولەسەر خەڵك پێویستە ئەو مافانەی لەسەریانە بەجێیان بهێنن ، وبۆ خەڵك نییە داوای سامان وپارەیەك بکەن لە کاربەدەستان کە شایەنی نەبن ، ئەگەرنا لەو چینە خەڵکە دەبن کە خودا پێیان دەفەرموێت : ﴿وَمِنْهُم مَّن يَلْمِزُكَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ فَإِنْ أُعْطُواْ مِنْهَا رَضُواْ وَإِن لَّمْ يُعْطَوْاْ مِنْهَآ إِذَا هُمْ يَسْخَطُونَ ۝٥٨ وَلَوْ أَنَّهُمْ رَضُواْ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَقَالُواْ حَسْبُنَا ٱللَّهُ سَيُؤْتِينَا ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَرَسُولُهُۥٓ إِنَّآ إِلَى ٱللَّهِ رَٰغِبُونَ ۝٥٩﴾(التَّوْبَة) .

واتە : هەیانە ڕەخنە وگازندەت لێدەگرێت لەبەر ماڵی خێر وچاکە ئەگەر بەشیان بدرێت ڕازی دەبن ، وئەگەر پێیان نەدرێت تورە وناڕازی دەبن ، بەڵام ئەگەر ئەوان ڕازی بوونایە بەوەی کە خودا وپێغەمبەرەکەی ﷺ پێیداون وبیانگوتایە خودامان بەسە خودا و پێغەمبەری خودا ﷺ لەچاکە بەشمان دەدەن ، ئێمە بۆ لای خودا دەگەڕێینەوە .

دوای ئەوە پەروەردگار ڕوونی دەکاتەوە کە ئەو ماڵە بۆ کێیە : ﴿۞إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلْفُقَرَآءِ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱلْعَٰمِلِينَ عَلَيْهَا وَٱلْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَٱلْغَٰرِمِينَ وَفِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِۖ فَرِيضَةً مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ۝٦٠﴾(التَّوْبَة) .

واتە : ماڵی خێر تەنها بۆ هەژار ودەست کورت وئەوکەسانەی ئیشی لەسەر دەکەن وئەوانەی دڵنەوایی دەکرێن وبەندە وقەرزار وتێکۆشەری ڕێگای خودا وڕێبوارە ، خودا وای پێویست کردووە ، وخودا زانا ودانای کارلەجێیە.

ئەوانەی مافی کاربەدەستان بەسەریانەوەیە پێویستە بە ئەنجامی بگەیەنن ، ئەگەرچی کاربەدەستەکە ستەمکاریش بێت ، وەك چۆن پێغەمبەری خودا ﷺ کاتێك باسی ستەمی کاربەدەستان دەکات دەفەرموێت : ((أدوا إليهم الذي لهم ، فإن الله سائلهم عما إسترعاهم))[٤٦].

واتە : ئەوەی مافی ئەوانە لەسەرتانە بە ئەنجامی بگەیەنن ، خوداش پرسیاری ئەو مافانەی خەڵکیان لێ دەکات کە لە ئەستۆیانە .

ولە هەردوو صەحیحەکەدا لە ئەبوهورەیرەوە رضي الله عنه ریوایەتیان کردووە ، پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : (( كانت بنو إسرائيل تسوسهم الأنبياء ، كلما هلك نبي خلفه نبي ، وإنه لانبي بعدي وسيكون خلفاء كثيرون ، قالوا فما تأمرنا ؟ فقال : أوفوا ببيعة الأول فالأول ، ثم أعطوهم حقهم فإن الله سائلهم عما إسترعاهم ))[٤٧].

واتە : نەوەکانی ئیسرائیل پێغەمبەران سیاسەتمەدارییان بۆ دەکردن ، هەرکاتێك پێغەمبەرێك وەفاتی بکردایەت ، پێغەمبەرێکی تر جێگەی دەگرتەوە ، ولە دوای من پێغەمبەر نایەت بەڵام جێنیشینێکی زۆر دێت ، وتیان : بەچی فەرمانمان پێدەکەیت ؟ فەرمووی : دەست بە بەڵێنی یەکەمەوە بگرن ، ومافیان بدەن ، چونکە خودا پرسیاری مافی خەڵکیان لێدەکات.

ودیسان لە هەردوو صەحیحەکەدا هاتووە لە ئیبن مەسعودەوە رضي الله عنه پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : (( إنكم سترون بعدي ، أثرة وأموراً تنكرونها : قالوا فما تأمرنا به يارسول الله ؟ قال : أدوا إليهم حقهم وأسالوا الله حقكم ))[٤٨].

---

٤٦. رواه البخاري(٧٠٥٢) ، ومسلم(١٨٤٣).

٤٧.رواه البخاري(٣٤٥٥) ، ومسلم(١٨٤٢).

٤٨. رواه البخاري(٣٦٠٣) ، ومسلم(١٨٤٣).

واته : دوای من خۆ ویستی وكۆمەڵە كردەوەیەك دەبینن كە پێتان ناخۆش دەبێت ، وتیان : بەچی فەرمانمان پێدەكەی ئەی پێغەمبەری خودا ؟ فەرمووی : مافەكانی ئەوان بدەن ، وداوای مافی خۆتان لـە خودا بكەن .

وبۆ كاربەدەستان نییە ماڵ وسامان بەپێی حەز وئارەزووی خۆیان دابەش بكەن ، وەك چۆن خاوەن موڵك موڵكەكەی دابەش دەكات ، چونكە ئەوان ئەمیندار وجێگر وبریكارن نەك خاوەن موڵك ، وەك چۆن پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : (( إني والله لا أعطي أحداً ولا أمنع أحداً ، وإنما أنا قاسم أضع حيث أمرت ))[49].

واته : سوێند بە خودا من بەشی كەسێك نادەم ولـە كەسیش ناگرمەوە ، چونكە من تەنها دابەشكەرێكم چۆن فەرمانم پێكرا ئەوە دەكەم .

ولـە ئەبوهرەیرەشەوە رضي الله عنه فەرموودەیەكی نزیك لـەمە گێڕدراوەتەوە ، ئەوە پێغەمبەری خودای هەموو دروستكراوەكانە بەڕاشكاوی ڕایدەگەیەنێت كە پێدان وپێنەدانی سامان بە خواست وویست وهەڵبژاردنی خۆی نییە ، وەك چۆن خاوەن سامان ڕەوایە بۆی هەڵسوكەوت لـە سامانی خۆیدا بكات ، یان وەك پادشاكان هەركەسێكیان خۆش بوێت بەشی دەدەن ، وڕقیان لـەهەركەسێك بێت لـێی دەگرنەوە ، چونكە ئەو بەندەی خودایە سامان بە فەرمانی خودا دابەش دەكات ، وچۆن خودا فەرمانی پێبكات ئەوە دەكات .

پیاوێك بە عومەری كوڕی خەتابی رضي الله عنه وت : ئەی فەرمانڕەوای بڕواداران ، بۆچی كەمێك زیاتر لـە ماڵی خودا بۆ خۆت خەرج ناكەیت ، ئیمامی عومەر وتی : دەزانی نموونەی من وخەڵك چۆنە ؟! وەك كۆمەڵە خەڵكێك وایە لـە سەفەرێكدا پێكەوەبن

---

٤٩. رواه البخاري(٣١١٧).

وپارەیەك لە یەكتر كۆ بكەنەوە ، وبیدەنە دەستی یەكێكیان خەرجی بكات بۆیان ، ئایا دروستە ئەو كەسە برێك لەو پارە بۆ خۆی پاشەكەوت بكات ؟

وجارێك ماڵێكی زۆری پێنج یەكیان بۆ عومەر ﷺ هێنا وتی : خەڵكێكی دەستپاك ئەم ئەمانەتەیان گەیاندە دەستی ئەمانەت پارێزێك ، خەڵكێك كە لەوێ ئامادە بوون پێیان وت : تۆ ئەمانەتی خودات پاراستوە ، بۆیە خەڵكیش ئەمانەتەكانی تۆ دەپارێزن ، وئەگەر تۆ بەو ماڵەوە كەیف وسەفا وخۆش گوزەرانیت بەسەرەوە بكردایە ، ئەوانیش وایان دەكرد.

پێویستە بزانرێت كاربەدەستی وەك بازارێك وایە ، هەرچی لەو بازارەدا بەبرەوی بوو پێویستە كاربەدەستان بۆی بهێنن ، وەك عومەری كوڕی عبدالعزیز ﷺ دەڵێت : ئەگەر لای كاربەدەستان ڕاست گۆیی وچاكەكاری وداد پەروەری وئەمانەت پارێزی باو بوو ، توشی ئەوانە دەبن ، بەڵام ئەگەر درۆ وخراپەكاری وستەم وناپاكی باو بوو ، بێ گومان توشی ئەوانە دەبن ، وئەوەی لەسەر كاربەدەستان پێویستە ماڵ وسامان بەڕەوایی وەربگرن ، ولە كوێدا پێویست بوو خەرجی بكەن ، ولە ئەو كەسانەی نەگرنەوە كە شایستەین ، عەلی كوڕی ئەبوتالب ﷺ ئەگەر پێیان ڕابگەیاندایە كە یەكێك لە كاربەدەستەكانی ستەمی كردووە ، دەیگوت : پەروەردگار من فەرمانم پێ نەداون ستەم لە بەندەكانی تۆ بكەن ومافەكانی تۆ پێشێل بكەن .

# بەشی سەرچاوەکانی سامانی دەوڵەت

ماڵی دەوڵـەت ئەوەی لە قورئان وسوننەتدا هاتووە سیٚ جۆرە:

دەستکەوتەکانی جەنگ ، وماڵی خیٚر وچاکە ، وئەوەی بەبیٚ جەنگ لـە ماڵی دوژمنان دەستی بەسەر دا دەگیریٚت (الفيء) .

دەستکەوتەکانی جەنگ : بریتییە لـەو سامانەی کە لـە جەنگی دژی بیٚباوەڕاندا دەستی بەسەردا دەگیریٚت ، خودا لـە سورەتی ئەنفالـدا باسی کردووە ، کە لـە جەنگی بەدردا دابەزیوە وناوی ناوە (أنفال) چونکە ماڵـیٚکی زۆر بوو ، دەفەرمویٚت : ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ ۖ قُلِ ٱلْأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ ۖ ١﴾(الآنفَال) .

واتە : پرسیاریان لـیٚکردیت دەربارەی ئەنفال بلٚیٚ : ئەو ماڵە بۆ خودا وپیٚغەمبەرە ﷺ هەتا ئەوەی دەفەرمویٚت : ﴿وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَىْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ ٤١﴾(الأنفَال) .

واتە : بزانن ئەوەی لـە جەنگی بیٚباوەڕاندا دەستتان کەوتووە پیٚنج یەکی بۆ خودا وپیٚغەمبەر وخزمەکانییەتی ﷺ وبۆ هەتیو وهەژاران وریٚبوارانە .

هەر لـەو بارەیەوە دەفەرمویٚت : ﴿فَكُلُوا۟ مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلَـٰلًا طَيِّبًا ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ٦٩﴾(الأنفَال) .

واتە : ئەوەی لـە جەنگدا دەستتان کەوتووە پاك وحەلاڵـە بیخۆن ولـە خودا بترسن وپاریٚزکاربن چونکە خودا لـیٚبوردە وبەبەزەییە .

وله هەر دوو صەحیحەکەدا هاتووە لە جابری کوڕی عبداللەوە رضي الله عنهما دەڵێت : پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت : (( أعطيت خمساً لم يعطهن نبي قبلي ، نصرت بالرعب مسيرة الشهر ، وجعلت الارض لي مسجداً وطهوراً فأيما رجل من أمتي أدركته الصلاة فليصل ، وأحلت لي الغنائم ولم تحل لأأحد قبلي ، وأعطيت الشفاعة ، وكان النبي يبعث إلى قومه خاصة وبعثت إلى الناس عامة ))[٥٠].

واتە : پێنج شتم پێ بەخشراوە بە هیچ پێغەمبەرێکی پێش من نەبەخشراوە : دوژمنانم لە دووری یەك مانگ ڕێگا لێم دەترسن ، وزەویم بۆ کراوەتە مزگەوت وپاککەرەوە ، هەرکەس لە ئوممەتەکەم لە هەرشوێنێك کاتی نوێژ هات دەتوانێت نوێژبکات ، ودەست کەوتەکانی جەنگم بۆ حەڵاڵ کراوە ، وبۆ هیچ کەس پێش من حەڵاڵ نەبووە ، و(شفاعە)م پێبەخشراوە ، وهەموو پێغەمبەرانی پێش من تەنها بۆ گەلەکەی خۆیان دەنێردران ، من بۆ هەموو خەڵك نێردراوم .

وديسان دەفەرموێت : (( بعثت بالسيف بين يدي الساعة ، حتى يعبد الله وحدة لاشريك له ، وجعل رزقي تحت ظل رمحى ، وجعل الذل والصغار على من خالف أمري ، ومن تشبه بقومٍ فهو منهم ))[٥١].

واتە : نزیك لە دوارۆژ نێردراوم بە شمشێر وجەنگ دژی بێبڕواکان ، هەتا تەنها خودا بپەرسترێت وهاوەڵی بۆ بڕیار نەدرێت ، ورۆزیشم لە ژێر سایەی ڕمەکەمدایە ، سوك وڕیسوایی بۆ کەسانێکە کە پێچەوانەی فەرمانم دەکەن ، وهەرکەسێك خۆی بچوێنێت بەهەر گەلێك ئەوە لەوانە .

---

٥٠. رواه البخاري(٣٣٥) ، و مسلم(٥٢١).

٥١. رواه أحمد(٥٠٩٣) ، قال شيخ الإسلام : استشهد به البخاري ، وصححه الألباني في (صحيح الجامع)(٢٨٣١).

ئەوەی پێویستە لە دەستکەوتی جەنگ پێنج یەکە ، وئەو پێنج یەکە دابەش دەکرێت بەسەر ئەو کەسانەی کە خودا باسی کردوون لە ئایەتەکەی سەرەوە ، وئەو چوار بەشەکەی تری بەسەر ئەو جەنگاوەرانەدا دابەش دەکرێت کە بە دەستکەوتیان گرتووە ، عومەری کوڕی خەتاب ﵁ دەڵێت : دەستکەوتی جەنگ بۆ کەسانێکە کە ئامادەی ڕووبەڕوو بوونەوەکە بوون ، ئەوکەسانەی کە ئامادەبوون بۆ جەنگ ، جەنگابن یان نا ، بە یەکسانی لە نێوانیاندا دابەش دەکرێت ، فەزڵی کەس بەسەر کەسی تردا نادرێت ، نە لەبەر سەرۆکایەتی یان ڕەچەڵەك یان لەبەر چاکە وناوداری ، وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ وخەلیفەکانی دابەشیان دەکرد .

ولە صەحیحی بوخاری دا هاتووە کە سەعدی کوڕی ئەبووقاص ﵁ وای گومان برد کەبەشی خۆی لە سەربازەکانی زیاترە ، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو : (( هل تنصرون وترزقون إلا بضعافكم ))[٥٢].

واتە : ئایا ئێوە سەردەکەون وڕۆزی دەدرێن ئەگەر لاواز وسەربازەکانتان نەبێت ؟.

ولە موسنەدی ئەحمەد دا هاتووە سەعدی کوڕی ئەبووقاص ﵁ دەڵێ وتم : ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ : کەسێك کۆمەڵێك دەپارێزێت ، بەشەکەی ئەو وئەوانی تر وەك یەکە ؟ فەرمووی : (( ثكلتك ابن أم سعد ، وهل ترزقون وتنصرون إلا بضعافكم ))[٥٣].

واتە : لەباری دایکی سەعد بچوویتایە ، ئایا ئێوە سەردەکەون وڕۆزی دەدرێن ئەگەر لاواز وسەربازەکانتان نەبێت ؟.

---

٥٢. رواه البخاري(٢٨٩٦).

٥٣. رواه البخاري مختصراً(٢٧٦٨).

هەروەها دەستکەوتەکانی جەنگ دابەش دەکرا ، لە سەردەمی دەوڵەتی ئومەوی وعەباسیدا ، کاتێك موسڵمانان دەجەنگان لەگەڵ ڕۆم وتورك وبەربەر ، بەڵام کاربەدەستی گەورە دەتوانێت بۆ هاندان کەمێك زیاتر بدات بە هەندێك کەس ، بۆ نموونە بۆ تیپێك کە دزەیان کردبێتە ناو سوپای دوژمن ، یان بۆ کەسێك سەرکەوتبێت ودەرگای قەڵای مۆڵگەی دوژمنانی کردبێتەوە ، یان کەسێك پێشەوای دوژمنانی لەناو بردبێت کەبە هۆیەوە دوژمنان شکستیان هێنابێت ... هتد ، چونکە پێغەمبەر ﷺ وخەلیفەکانی وایان دەکرد .

لە سەرەتای جەنگدا ئەگەر تیپێك دەستکەوتیان هەبوایە چواریەکی ئەو دەستەکەوتە بۆ خۆیان دەبوو دوای دەرهێنانی پێنج یەکی ، بەڵام ئەگەر تیپێك دوای کۆتایی هاتنی جەنگ شوێنی سوپای دوژمن بکەوێت وزەفەریان پێببات وشتیان لێ بە دەستکەوت بگرێت ئەوە سێیەکی بۆ خۆیان دەبێت دوای دەرهێنانی پێنج یەکی ، ئەمە جیاوازە لە بەشی خۆیان ، وپشکێکی زیاترە ، هەندێك لە زانایان دەڵێن : ئەو زیادەیە لەو پێنج یەکەیە کە بۆ دەوڵەت دادەنرێت ، هەندێکی تریان دەڵێن : ئەو زیاتر پێدانە لە هەموو دەستکەوتەکەیە ، لەبەر ئەوەی فەزڵی جەنگاوەرێك بەسەر یەکێکی تردا نەدرێت ، بەڵام ئەوەی پەسەندە دروستە لەو چوار بەشە بێت کە تایبەتە بە جەنگاوەران ئەگەرچی ئەوە جیاوازیە لە نێوانیاندا ، بەڵام دەبێت لەبەر بەرژەوەندی ئاینی بێت نەك حەز وئارەزوو ، وەك چۆن پێغەمبەری خودا ﷺ چەند جارێك وای کردووە ، ئەوەش وتەی زانایانی شام وئەبوحەنیفە وئەحمەد وزانایانی تریشە ، ولەسەر ئەمە وتراوە کاربەدەست دەتوانێت چواریەك یان سێ یەك زیاتر بدات بە مەرج بێت یان بێ مەرج ، بۆ نموونە ئەگەر بڵێت : ئەوەی ئاسانکاریمان بۆ بکات بۆ چوونە ناو مۆڵگەی دوژمن ئەوەندە پاداشت دەدرێتەوە ، یان هەرکەسێك فلان کەسم بۆ لە ناوببات فلان شتی دەدەمێ ،

ودروست نییە لە سێیەکی دەستکەوت زیاتر بدرێت ، ودەبێت لەبەر مەرجێك زیاتر بدرێت ، لەمەدا دوو وتەی ئیمامی ئەحمەد وئەوانی تر هەیە ، وبە وتەیەکی صەحیح لە ئیمامی ئەحمەد گێڕدراوەتەوە ئەوەی شتێك بە دەستکەوت بگرێت بۆ خۆیەتی ، هەروەها لە پێغەمبەر ﷺ گێڕدراوەتەوە لە جەنگی بەدردا وایفەرمووە ، ئەگەر بەرژەوەندییەکی لەو کارەدا ببینایە .

ئەگەر کۆکردنەوەی دەستکەوتەکانی جەنگ ودابەشکردنی ئیشی فەرمانڕەوای موسڵمانان بێت ، دروست نییە کەس لەو دەستکەوتانە بەدزییەوە ببات : ﴿وَمَن يَغۡلُلۡ يَأۡتِ بِمَا غَلَّ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ ١٦١﴾(آلِ عِمۡرَان) .

واتە : ئەوەی دزی لە دەستکەوتی جەنگ بکات ، ئەوەی دزیوییەتی دەیهێنێت لە ڕۆژی دوایی .

چونکە ئەو کارە ناپاکییە ، وتالان کردن دروست نییە ، چونکە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی کردووە ئەو کارە نەکرێت ، ئەگەر فەرمانڕەوای موسڵمانان دەستکەوتی جەنگی کۆ نەکردەوە ودابەشی نەکرد ، وڕوخسەتی دا هەریەکە بەشی خۆی ببات ، ئەوا دروستە هەریەکە بەشی خۆی ببات بەبێ ستەم دوای جیا کردنەوەی پێنج یەکی ، وهەرچی ئاماژە بێت بۆ ڕوخسەت دان ئەوە بەمانای ڕوخسەتە ، بەڵام ئەگەر ڕوخسەتی نەدا ، یان ڕوخسەتێکی نادروستی دا ، ئەوکات دروستە ئەندازەی ئەوە ببات کە ئەگەر بەش بکرێت بەری دەکەوێت ، بەڵام دەبێت یەکسانی ڕەچاو بکات .

وئەوەی قەدەغەی بکات موسڵمانان دەستکەوتەکانی جەنگ کۆبکەنەوە ، وڕێگا بەکاربەدەست دەدات ئەوەی دەیەوێت وای لێبکات ، ئەوا ئەو دوو وتەی سەرەوە بەرەنگاریانە ، وئایینی خودا دادوەرە (وسط) : وداد وایە کە لە دابەشکردندا بۆ پیادە

بەشێك وبۆ سواری ئەسپی عەرەبی سێ بەش ، بەشێکی بۆ خاوەنەکەی ودوو بەش بۆ ئەسپەکەی ، بەو شێوەیە پێغەمبەری خودا ﷺ لە ساڵی خەیبەردا دابەشی کردووە ، هەندێك لە زانایان دەڵێن : بۆ جەنگاوەر دوو بەشە ، بەڵام ئەوەی سەرەوە سوننەتی صەحیح بەڵگەیە لەسەری ، چونکە ئەسپ پێویستی بە ئالیك وخواردن دەبێت وخاوەنەکەشی پێوەی خەریك دەبێت ، وقازانجی سواری زیاترە لە پیادە لە کاتی شەڕدا ، وهەندێك دەڵێن : ئەسپی عەرەبی ودووڕەگ بەیەکسانی بەش دەدرێن ، وهەندێکی تر دەڵێن : ئەسپی دوو ڕەگ یەك بەشی دەدرێتێ ، بەو شێوەیە گێڕدراوەتەوە لە پێغەمبەر ﷺ وهاوەڵانی رضي الله عنهم .

ئەسپی دووڕەگ بەو ئەسپانە دەڵێن : کە دایکیان نەبەتیە و(پێی دەڵێن : برزون) وهەندێك پێی دەڵێن : (تتری) ، ئەسپ بێت یان ماین و(الإکدیش) و(رمکە) و(حجر)یشی پێ دەڵێن ، پێشینان ئەسپیان بۆ جەنگ ئامادە دەکرد ، لەبەر بەهێزی وتیژڕەوی ، وبۆ بەسەرداداان ومانەوە وحجریان بەکاردەهێنا چونکە دەنگی نییە دوژمنان ئاگادار بکاتەوە لە کاتی خۆ حەشاردانندا ، وبۆ ڕێگا ماینیان بەکار دەهێنا چونکە بە ئارامە لە ڕێگادا .

ئەگەر دەستکەوتی جەنگ سامانێك بوو پێشتر هی موسڵمانان بوو لە موڵك و(عقار) یانماڵی گوازراوە ، وخاوەنەکەی پێش دابەشکردنی ناسییەوە ، ئەوە دەگەڕێنرێتەوە بۆی ، موسڵمانان کۆ دەنگن لەسەر ئەوە .

بەشەکانی دەستکەوتی جەنگ وحوکمەکانی ، وتە وبەڵگەیەکی زۆری لەسەرە ، موسڵمانان لەسەر هەندێکی کۆڕان ولەسەر هەندێکی تری ناکۆکن ، ئێرە شوێنی باسکردنی نییە ، لێرە تەنها کۆمەڵێك ڕستەی کۆکراوەم باسکردووە .

# بەشی ئەو کەسانەی سامانی زەکاتیان پێ دەدرێت

ماڵی زەکات بۆ ئەو کەسانەیە کە خودای پەروەردگار لە قورئاندا باسی کردوون ، لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ گێڕدراوەتەوە : پیاوێك داوای ماڵی زەکاتی لێکرد ، فەرمووی : (( إن الله لم يرض في الصدقة بقسم نبي ولا غيره ولكن جزأها ثمانية أجزاء ، فإن كنت من تلك الأجزاء أعطيتك ))[٥٤].

واتە : خودا لە ماڵی زەکات بە دابەشکردنی پێغەمبەر وکەسانی تریش ڕازی نابێت ، خودا بەسەر هەشت کۆمەڵدا بەشی کردووە ، ئەگەر تۆ یەکێك لەو کۆمەڵانەبیت بەشت دەدەم .

هەژار ودەست کورت مانای دەست نەچوون وناتەواوی پێداویستیەکانیان کۆیان دەکاتەوە ، زەکات بۆ دەوڵەمەند وکەسێکی بەهێز کە توانای ئیش وکاری هەبێت دروست نییە .

ئەو کەسانەی ئیشی لەسەردەکەن ئەوانەن کە کۆی دەکەنەوە ودەیپارێزن وتۆماری دەکەن ، وئەوانەی دڵنەوایی دەکرێن لە ئەو سامان ودەستکەوتانەدا باسی دەکەین "بەویستی خودا" کە بەبێ جەنگ بە دەست دێن ، وکۆیلە یارمەتی ئەوانەش دەگرێتەوە کە پەیمانیان واژۆ کردووە کە بە بەرامبەرێك ئازاد بکرێن ، وهەروەها بەهای ئازادی دیل دەگرێتەوە ئەمەش بەهێزترین وتەیە لەم باسەدا ، وقەرزاران ئەو کەسانەن پارەی خەڵکیان لەسەرە وناتوانن بیدەنەوە ، لە پارەی زەکات بۆیان دەدرێتەوە ئەگەرچی

٥٤. رواه أبوداود(١٦٣٠) ، وضعفه الألباني في (ضعيف الجامع)(١٦٤٢).

زۆریش بێت ، مەگەر لە سەرپێچی خودای پەروەردگاردا ئەو قەرزەیان هاتبێتە سەر ، ئەو کات زەکاتیان پێ نادرێت تاکو تەوبە دەکەن وپەشیمان دەبنەوە ، ولە رێگای خودا ئەو جەنگاوەرانەن کە ئەوەندە سامانیان نییە بەشی جەنگیان بکات ، ئەوەندەیان دەدرێتێ پێی بجەنگن ، یان هەموو پێداویستییەکانی جەنگ لە ئەسپ وچەك وتفاقی جەنگ وبژێوی وموووچەیان بۆ دابین دەکرێت ، وحەجیش لەرێگای خودایە وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ وای فەرمووە ، ورێبوار ئەو کەسەیە کە لە ولاتێکەوە بۆ ولاتێکی تر سەفەر بکات .

## بەشی دەستکەوتی بێ جەنگ

دەستکەوتی بێ جەنگ لە بنچینەدا خودا لە سورەتی الحشردا باسی کردووە ، کە لەجەنگی (بنو نضیر) دایبەزاندووە دوای جەنگی بەدر ، دەفەرمویت : ﴿وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنۡهُمۡ فَمَآ أَوۡجَفۡتُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ خَيۡلٖ وَلَا رِكَابٖ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ عَلَىٰ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٦ مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ كَيۡ لَا يَكُونَ دُولَةَۢ بَيۡنَ ٱلۡأَغۡنِيَآءِ مِنكُمۡۚ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمۡ عَنۡهُ فَٱنتَهُواْۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ٧ لِلۡفُقَرَآءِ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ وَأَمۡوَٰلِهِمۡ يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ٨ وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلۡإِيمَٰنَ مِن قَبۡلِهِمۡ يُحِبُّونَ مَنۡ هَاجَرَ إِلَيۡهِمۡ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمۡ حَاجَةٗ مِّمَّآ أُوتُواْ وَيُؤۡثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ وَلَوۡ كَانَ بِهِمۡ خَصَاصَةٞۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفۡسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ٩ وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٞ رَّحِيمٌ ١٠﴾(الحَشْر) .

واتە : ئەوەی خودا دەستی خستن لە سامانی (بنو نضیر) کە هیچ ماندوو نەبوون وسواریەکانتان ئامادە نەکرد ، بەڵکو خودا پێغەمبەرەکەی ﷺ سەر دەخات بە سەر هەرکەسدا بیەوێت ، وخودا بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایە ، ئەو سامانەی کە بەبێ جەنگ خودا دەستی پێغەمبەرەکەی دەخات ﷺ لە شار وگوندەکان بۆ خودا وپێغەمبەر

ﷺ وخزم وكەسی وهەتیو ودەستكورت ورێبوارانە ، بۆ ئەوەی ئەو سامانە هەمووی بۆ دەوڵەمەندەكان نەبێت وهەمووی لای ئەوان كۆ ببێتەوە ، ئەوەی كە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانتان پێدەكات وابكەن وئەوەی كە یاساغیتان لێ دەكات وازی لێ بهێنن ، ولە خودا بترسن بەڕاستی خودا سزای زۆر توندە ، ئەوماڵە بۆ كۆچكەرە هەژارەكانە كە لە ماڵ وولاتی خۆیان دەركراون ، وبەتەمای فەزڵ ورەزامەندی خودان ، وخودا وپێغەمبەرەكەی ﷺ سەردەخەن ئەوانە ڕاستگۆن ، وپشتیوانان پێش ئەوان كە حەزیان دەكرد ئەوان كۆچبكەن بۆ لایان ، وهیچ لە دڵناگرن لەبەر ئەوەی ئەو ماڵە بە برا كۆچەریەكانیان دراوە ، زیاتر لەوەش ئەوەی كە خۆیان پێیان خۆش بوو دەیان بەخشی بە ئەوان ، ئەوەی خۆی لە ڕژدی بپارێزێت ئەوە سەرفراز وبراوەیە ، ئەوانەش دوای ئەوان دێن لە تابعیەكان وموسڵمانان دەڵێن : پەروەردگارا لە ئێمە وئەو برایانەی پێش ئێمە مردوون خۆشبە ، ولە دەروونماندا كینە بەرامبەر هیچ باوەڕدارێك دروست مەكە تۆ بە سۆز وبەزەییت .

پەروەردگار باسی كۆچەران وپشتیوانان دەكات وئەوانەش لە دوای ئەوان دێن كە لەسەر ئەو خەسڵەتەبن دەیانگرێتەوە هەتا ڕۆژی دوایی ، وەك چۆن ئەو فەرموودەی خودا دەیانگرێتەوە كە فەرموویەتی : ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنۢ بَعۡدُ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ مَعَكُمۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ مِنكُمۡۚ ٧٥﴾(الآنفال).

واتە : ئەوانەی كە دواتر باوەڕیان هێناوە وكۆچیان كرد ولەگەڵتان تێكۆشاون ئەوانە لە ئێوەن .

ولەو ئایەتەی كە دەفەرموێت : ﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ ١٠٠﴾(التَّوۡبَةِ) .

واتە : ئەوانەی شوێنیان كەوتوون بە چاكە .

ولەو ئایەتەی : ﴿وَءَاخَرِينَ مِنۡهُمۡ لَمَّا يَلۡحَقُواْ بِهِمۡۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ۝٣﴾ (الجُمُعَة).

واتە : ئەوانەش لەوانن کە بە چاکە شوێنیان کەوتوون ئەگەرچی بە پێغەمبەری خودا ﷺ وهاوەڵانیشی نەگەیشتوون ، وپەروەردگار بەهێز ودانای کارلەجێیە .

ومانای ئەو فەرموودەی خودای پەروەردگار : ﴿فَمَآ أَوۡجَفۡتُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ خَيۡلٖ وَلَا رِكَابٖ ۝٦﴾(الحَشر).

واتە : ئێوە هیچ ئەسپ وحوشترێکتان نەجولاند وتاوتان نەدان .

لەبەر ئەوەشە فەقیهەکان دەڵێن : (الفيء) ئەو سامانەیە کە لە بێبڕواکان دەگیرێت بەبێ شەڕ وپێکدادان : لەبەر ئەوەی جوڵانی سواریەکان ، واتە : جەنگ ، وناونراوە دەستکەوت ، چونکە خودا دەستی موسڵمانانی دەخات ، واتە : لە بێبڕواکانی دەسێنێتەوە بۆیان ، چونکە لە بنچینەدا خودا سامانی دروست کردووە بۆ یارمەتیدانی بەندەکانی ، وبەندەکانیشی تەنها بۆ پەرستش دروست کردووە ، ئەو کەسانەی باوەڕیان بە خودا نییە جەنگ لەگەڵیان دروستە لەبەر ئەوەی خودا ناپەرستن ، وسامانیان کە پشتی پێنابەستن بۆ پەرستشی خودا ، بۆ بەندە باوەڕدارەکانیەتی کە دەیپەرستن ، وئەوانەی کە شایەنن بۆیان دەگەڕێنێتەوە ، وەك چۆن هەرکەسێك میراتی لێ داگیر بکرێت بۆی دەگەڕێنرێتەوە ئەگەرچی ئەو داگیرکردنە پێش وەرگرتنی میراتیەکەی بێت ، ئەمەش وەکو ئەو سەرانەیە کە لەسەر جولەکە وگاورەکان دادەنرێت ، یان وەك ئەو سامانەی کە لەگەڵ دوژمندا ئاگربەستی لەسەر دەکرێت ، یان بە دیاری بە فەرمانڕەوای موسڵمانان دەدرێت ، یان وەك ئەو پارەی کە لە وڵاتی گاور وهاوشێوەکانیان بە دیاری بۆی دێت هەمووی بۆ موسڵمانان دەگەڕێتەوە ، ودەیەك لە بازرگانی کاڵای جەنگ

وەردەگیرێت ولە بازرگانی (أهل الذمة)ش ئەگەر هاتن لە وڵاتی موسڵمانان بازرگانیان کرد ، بەو شێوەیەی کە عومەری کوڕی خەتاب ﷺ لێی وەردەگرتن .

وئەو ماڵەی لەوانەی کە پەیمان دەشکێنن کۆ دەکرێتەوە ، وئەو سەرانەی لە سەر زەوی وزاری بێبڕواکان دانراوە ، دوای ئەوەش دەبێتە موڵکی موسڵمانان ودەبێت بدرێتە خەزێنەی دەوڵەت ، هەموو ئەو سامانەی دەدرێتە دەوڵەت لە ژێر ڕاڤەی دەستکەوتی بێ جەنگدا جێی دەبێتەوە ، بۆ نموونە : ئەگەر موسڵمانێك مرد ومیراتگرێکی دیاری کراوی نەبوو ، یان ئەوەی بە ستەم داگیر دەکرێت ونازانرێت هی کێیە ، یان شتێکی خوازراو (مستعار) ، یان ئەمانەت کە ئەستەمە خاوەکانیان بدۆزرێتەوە ، وهەموو ئەو سامان وکالاَیانەی کە خاوەنەکانیان نادۆزرێتەوە لە موڵك وماڵی گوازراوە دەبێتە ماڵی دەوڵەت ، ولەبەر ئەوە خودا لە قورئاندا تەنها باسی سامانی کردووە کە بەبێ شەڕ دەگیرێن ، چونکە کەس نەبووە لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ ڕەچەڵەکی دیار نەبێت ، هەرکەس بمردایە میراتگری دیار بوو لەبەر ئاشکرای ڕەچەڵەکی هاوەڵانی ، وجارێك کابرایەك مرد میراتییەکەی درایە بە تەمەنترین پیاوی خێڵەکەی ، واتە : نزیکترین کەس لە باپیریەوە ، کۆمەڵێك لە زانایان ڕایان وایە ئیمامی ئەحمەد یەکێکە لەوان ، ویەکێکی تر مرد کەسی نەبوو بەندەیەك نەبێت کە ئازادی کردبوو میراتیەکەی دایە ، کۆمەڵێك لە هاوەڵانی ئەحمەد وادەڵێن ، ومیراتی کەسێکی بەکەسێکی خەڵکی گوندەکەی داوە ، پێغەمبەر ﷺ وخەلیفەکانی لە ماڵی میراتدا زۆر بەدوای ئەو کەسانەدا گەڕاون کە لەگەڵ مردووەکەدا خزمایەتیان هەبووە وەك باسمانکرد .

وهیچی لە موسڵمانان وەرنەدەگرت جگە لە زەکات ، وفەرمانی پێدەکردن کە تێبکۆشن لە پێناوی خودا بە سامان وگیانی خۆیان ، وهەروەها خوداش لە قورئاندا فەرمانی بەوە کردووە .

ئەو سامانەی کە وەردەگیرا ودابەش دەکرا ، فەرمانگەیەکی تایبەتی نەبوو لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ وهەروەها لە سەردەمی ئەبوبەکریشدا رضي الله عنه ، ئەو دەستکەوتانە بەگوێرەی پێویست دابەش دەکران ، بەڵام لە سەردەمی عومەردا رضي الله عنه سامان زۆر بوو وولات فراوانتر بوو وخەڵکیش زۆر بوون ، فەرمانگەیەکی بۆ پێدان ویارمەتیدانی جەنگاوەران وئەوانی تریش دانا ، بەڵام دیوانی سەربازی "لەو سەردەمە" فرە لایەن بوو ، ئەو دیوانە گرنگترین دیوانی موسڵمانان بوو .

وبۆ هەر شارێك بۆ باج ودەستکەوتەکانی دەوڵەت وئەو پارانەش وەردەگیران دیوانی تایبەتی هەبوو ، پێغەمبەر ﷺ وخەلیفەکانی چاودێری ولێپرسینەوەیان لەگەڵ ئەو فەرمانبەرانەیان دەکرد کە لەسەر سامانی زەکات ودەستکەوتەکانی دەوڵەت بوون .

کەواتە : سامان لەم سەردەمە وپێشتریش سێ جۆرە : جۆری یەکەم : کاربەدەستان مافی وەرگرتنیان هەیە بە بەڵگەی قورئان وسوننەت وکۆدەنگی موسڵمانان وەك باسمانکرد ، وجۆری دووەم : بە کۆرا حەرامە وەرگرتنی وەکو ئەو سەرانەی کە لە خەڵکی شارێك وەردەگیرێت لەبەر خوێنێك کە لە نێوانیاندا ڕژاوە لە بری ئەو حەددەی کە لەسەریانە ، یان ئەو پارەیەی کە بە زۆر لە خەڵك وەردەگیرێت ، وجۆری سێیەم : وەك ماڵی ئەو کەسانەی کە خزمیان هەیە ، ومیراتگر وبەش بۆ دیاری کراونین لە میرات ، ئەم جۆرەیان زانایان ناکۆکن لەسەری .

زۆر جار ستەم لە کاربەدەستان وخەڵکیش دەوەشێتەوە ، کاربەدەستان ماڵێك دەبەن کە حەڵاڵ نییە بیبەن ، وخەڵکیش ئەوەی لەسەریان پێویستە بەجێی ناهێنن ، وەك چۆن هەندێك جار سەرباز وجوتیار ستەم دەکەن ، وهەندێ خەڵك لە تێکۆشان وازدەهێنن ، وکاربەدەستان لەماڵی خودا بۆ خۆیان پاشەکەوت دەکەن وبەکاری دەهێنن کە بۆیان حەڵاڵ نییە ، وهەندێك سزا دەدەن لەسەر وەرگرتنی ماڵ ، وهەندێك جار ئەوەی حەڵاڵ

وپێویستە وازی لێدەهێنن وكاری حەرام ئەنجام دەدەن ، ولە بنچینەدا پێویستە ئەوەی ماڵێكی لەسەرە بیداتەوە ، وەك كەسێك بارمتەیەكی لایە یان پارەیەكی لایە ئیش وكاری پێوە دەكات یان سامانی هاوبەشەكەی بە دەستەوەیە ، یان بریكارە ، یان قەرزی لەسەرە ودەتوانێت بیداتەوە ، ئەگەر ئەو مافەی بەسەرییەوەیە نەیداتەوە جا ئەگەر پارە بێت یان هەرشتێكی تر ، وزانرا دەتوانێت بیداتەوە ، ئەوە شایەنی سزادانە تا ئەو مافەی كە لەسەرییەتی دەیداتەوە یان ڕێگا نیشان دەدات بۆ بەدەست هێنانەوەی ، وئەگەر پارەكە دۆزرایەوە ئەو كەسە لە بەندیخانە بوو لە پارەكەی مافی خاوەن مافەكان دەدرێتەوە ، وپێویست بە لێدانی ناكات ، بەڵام ئەگەر ئامادە نەبوو ڕێگا نیشان بدات بۆ دۆزینەوەی ومافەكان نەداتەوە ، دەتوانرێت سزا بدرێت هەتا مافەكان دەگەڕێنێتەوە ، وهەروەها هەر كەسێك دەستی ڕۆیشت وئەو زەكاتەی لەسەری پێویستە نەیدات سزا دەدرێت ، عومەری كوڕی شەرید لە باوكیەوە دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (( لَيّ الواجد يحل عرضه وعقوبته ))[55].

واتە : ئەو كەسەی توانای دانەوەی قەزری هەیە ونایداتەوە دروستە سكاڵای لێبكرێت وسزا بدرێت .

ودەفەرموێت : (( مطل الغني ظلم ))[56].

واتە : نەدانەوەی پارەی دەوڵەمەند لەكاتی دیاری كراودا ستەمە ، وستەم كاریش دەبێت سزا بدرێت وبەند بكرێت .

---

٥٥. رواه أبوداود(٣٦٢٨) ، والنسائي(٤٦٩٠) ، وابن ماجه(٢٤٢٧) ، وحسنه الألباني في (صحيح الجامع)(٥٤٨٧).

٥٦. رواه البخاري(٢٤٠٠) ، ومسلم(١٥٦٤).

ئەوەش هەمووان کۆدەنگن لەسەری : کە هەر کەسێك کارێکی ناڕەوا بکات ، یان ئەوەی پێویستە لەسەری ئەنجامی نەدات شایەنی سزادانە ، ئەگەر ئەو سزادانە لە شەریعەتدا دیاری نەکرابوو کاربەدەستان دەتوانن بە بۆچوونی خۆیان ئەو کارە بکەن ، بۆ نموونە : ئەوەی پارەی دەوڵەمەند ناداتەوە لە کاتی دیاری کراودا دەتوانرێت بەند بکرێت ، ئەگەر نکولی کرد دەتوانرێت لێی بدرێت ، تا ئەو مافەی لەسەرییەتی دەیداتەوە ، وهەموو فەقیهەکانی مەزهەبی مالکی وشافعی وحەنبەلی کۆدەنگن لەسەری وهیچ جیاوازییەك لەم بارەیەوە نازانم ، وبوخاری لە صەحیحەکەیدا لە ئبن عومەرەوە ﵄ دەگێڕێتەوە کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ پەیمانی لەگەڵ خەڵکی خەیبەردا بەست لە سەر زێڕ وزیو وچەك و تفاقی جەنگ پرسیاری کرد لە جولەکەیەك "سەعیەی مامی حیی کوڕی ئەحتەب بوو" لە گەوهەر وسامانی حویەی کوڕی ئەحتەب وتی : لە خەرجی جەنگدا تیاچوو ، فەرمووی : (( العهد قريب ، والمال أكثر من ذلك )) .

واتە : کاتێکی کەمە وماڵەکە لەوە زیاترە لەو کاتە کەمەدا خەرج کرابێت .

پێغەمبەری خودا ﷺ سەعیەی دایە دەستی زوبیر سزای دا ، وتی حویەیم بینی بە تورەکەیەکەوە لێرە دەگەڕا ، ڕۆیشتن گەڕان تورەکەیەکی لە چەرم دروست کراوی پڕ لە زێڕیان دۆزیەوە[٥٧] ، ئەو پیاوە (ذمي) بوو ، وذمیش دروست نییە سزا بدرێت لەبەر مافێك نەبێت ، وهەروەها هەر کەسێك شتێك بشارێتەوە کە پێویست بێت ئاشکرای بکات سزا دەدرێت لەبەر بە جێنەهێنانی ئەو مافەی کە لەسەرییەتی .

وئەو کاربەدەستانەی لە ماڵی موسڵمانان دەبەن بە ناڕەوا ، کاربەدەستی گەورە لێیان وەردەگرێتەوە ، وەکو ئەو دیاریانەی بە هۆی ئیش وکارەوە وەری دەگرن ، ئەبو

٥٧. رواه أبوداود (٣٠٠٦) ، وحسنه الألباني في (صحيح أبي داود).

سەعیدی خودری ﷛ دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی : ((هدايا العمال غلول))[٥٨].

واتە : دیاری کرێکاران بۆ کاربەدەستان وەك ئەو سامانەیە پێش دابەشکردنی دەستکەوتی جەنگ دەدزرێت.

وئیبراهیم الحربی لە کتێبی (الهدایا) لە ئیبن عباسی ﷠ گێڕاوەتەوە : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمویەتی : (( هدايا الأمراء غلول ))[٥٩].

واتە : ئەو دیاریانەی دەدرێت بەکاربەدەستان وەك ئەو ماڵەیە پێش دابەشکردنی دەستکەوتی جەنگ دەدزرێت .

ولە هەردوو صەحیحەکەدا لە ئەبو حمید الساعدی ﷛ گێڕدراوەتەوە دەڵێت : (( استعمل النبي ﷺ رجلاً من الأزد ، يقال له ابن اللتبية ، على الصدقة ، فلما قدم ، قال : هذا لكم ، وهذا أهدي إلي . فقال النبي ﷺ : (( ما بال الرجل نستعمله على العمل مما ولانا الله ؛ فيقول : هذا لكم ، وهذا أهدي إلي ؟ فهلا جلست في بيت أبيه ، أو بيت أمه ، فينظر أيهدى إليه أم لا ؟ والذي نفسي بيده لا يأخذ منه شيئاً ، إلا جاء به يوم القيامة يحمله على رقبته ؛ إن كان بعيراً له رغاء ، أو بقرة لها خوار ، أو شاة تيعر ، ثم رفع يديه حتى رأينا عفرتي إبطيه ؛ ثم قال : اللهم هل بلغت ؟ اللهم هل بلغت ؟ اللهم هل بلغت ؟ ثلاثا))[٦٠].

---

٥٨. رواه أحمد (٢٣٠٩٠) ، وصححه الألباني في (صحيح الجامع)(٧٠٢١) .

٥٩. رواه البيهقي(السنن الكبرى)(٢٠٩٧٨) ، وابن أبي شيبة(الصنف)(٢٢٨) ، والطبراني(المعجم الاوسط)(٤٩٦٩) ، قال الحافظ : إسناده ضعيف ، وذكره الهيثمي في مجمع الزوائد(١٥١/٤) وقال : (رواه الطبراني في الاوسط ، وفيه ثمان بن سعيد وهو ضعيف) (ص١٣٣).

٦٠. رواه البخاري(٢٥٩٧) ، ومسلم(١٨٣٢).

واته : پێغەمبەری خودا ﷺ پیاوێکی لە هۆزی ئەزد کرد بە کاربەدەست لە سامانی زەکات ناوی ئیبن لوتبیە بوو ، کاتێك گەڕایەوە وتی : ئەوە بۆ ئێوەیە وئەمەش بەدیاری بۆ من هێنراوە ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئەوە چییە ئێمە کەسێك دەکەینە کاربەدەست لەوەی کە خودا ئێمەی تێدا بەرپرسیار کردووە ، دەڵێت : ئەوە بۆ ئێوەیە وئەمەش بەدیاری بۆ من هێنراوە ! با ئەو کەسە لە ماڵی باوکی یان دایکی دابنیشێت سەیربکات بزانە کەس دیاری بۆ دەبات ، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە هەر شتێکی لێ ببات ڕۆژی دوایی دێت بەسەر گەردنیەوەیە ، ئەگەر حوشترێك بێت دەنگی حوشتری لێدێت ، ئەگەر مانگا بێت دەنگی مانگای لێدێت ، وئەگەر مەڕ بێت دەنگی مەڕی لێدێت ، دەستەکانی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە هەتا سپیایی ژێر باڵەکانیمان بینی وسێجار فەرمووی : خودایە من گەیاندم .

وهەروەها خاترگیری کاربەدەستان لە مامەڵە وکڕین وفرۆشتن وبەکرێدان وبازرگانی وکشتوکاڵ و ئاودێریدا ... هتد ، جۆرێکە لە دیاری کاربەدەستان .

لەبەر ئەوە عومەری کوڕی خەتاب ﷺ سامانی تایبەتی کاربەدەستە زۆر لە خودا ترس وخاوەن فەزڵەکانی "ئەوانەی کە گومانی ناپاکییان لێنەدەکرا" دەیکرد بە دوو بەشەوە ، بەشێکی بۆ دەوڵەت وئەویتری بۆ خۆیان ، چونکە لەوانەیە لەبەر دەسەڵاتەکەیان بە دیاری وخۆبردنە پێشەوە لەلایەن کەسانی ترەوە بۆیان برابێت ، چونکە عومەر ﷺ پێشەوا وکاربەدەستێکی دادپەروەر بوو هەموو داهاتەکانی دەوڵەت وکاربەدەستانی بەیەکسانی دابەش دەکرد ، بەڵام لەوەتەی کاربەدەستان وخەڵکیش گۆڕاون ، پێویستە لەسەر مرۆڤ ئەوەی فەرمانی پێکراوە بەگوێرەی توانا ڕای پەڕێنێت ، ووازبهێنێت لەوەی حەرام کراوە لەسەری ، وهەرشتێك کە خودا حەڵاڵی کردووە لەسەر خۆی حەرامی نەکات .

کۆمەڵێك خەڵك گیرۆدە دەبن بە دەستی هەندێك لە کاربەدەستان بەوەی دیاری وبەرتیلیان لێوەر ناگرن ، بۆ ئەوەی ڕووگیرنەبن کە مافە زەوت کراوەکانیان بۆ وەربگرنەوە ، ئەوەش وازهێنانە لەوەی کە خودا لەسەریان پێویستی کردووە لە ڕاپەڕاندنی ئیش وکاری خەڵك بەبێ بەرامبەر ، بەو کارەش کەسێکی تر کە کارەکەیان بۆ ڕادەپەڕێنێت بەرتیل ودیارییان لێوەردەگرێت ومافەکانیان بۆ دەگەڕێنێتەوە وستەمیان لەسەر لا دەبات ئەو خەڵکانە ئەمەیان پێباشترە لەوی تریان ، چونکە یەکەمیان دوارِۆژی خۆی لەبەر دونیای کەسانی تر دۆڕاندووە ئەوی تریشیان لەو دۆڕاوترە کە دیسان دوارِۆژی خۆی لەبەر دونیای کەسانی تر فرۆشتووە ، چونکە لە بنچینەدا دەبێت ئەوان مافە زەوتکراوەکان بگەڕێننەوە وستەمەکان لەسەر خەڵك لابەرن بە گوێرەی توانا ، چونکە ڕاپەڕاندنی ئیش وکاری خەڵك ناوکرۆکی کاری (مهمة) کاربەدەستانە .

شایانی باسە ئاگادار کردنەوەی کاربەدەستان لە پێداویستیەکانی خەڵك وڕێنمونی کردنیان بۆ چاکەی (مصلحة) خەڵك ودوورخستنەوەیان لە زیانی خەڵك بە شێوەیەکی نەرمونیان نەك بە زبر نووسین ، کە هەندێك لە نوسەران وئەدیبان وهاوشێوەکانیان بۆ مەبەستێك ئەو کارە دەکەن ، وەك لە فەرموودەی هندی کوڕی باوکی هالە رضي الله عنه هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ((أبلغوني حاجة من لا يستطيع إبلاغها ، فإنه من أبلغ ذا سلطان حاجة من لا يستطيع إبلاغها ثبت الله قدميه على الصراط يوم تزل الأقدام))[٦١].

واتە : ئیش وکاری کەسانێکم پێبگەیەنن کە خۆیان ناتوانن بیگەیەنن ، چونکە هەرکەسێك ئیش وکاری ئەو کەسە بگەیەنێت بەکاربەدەستێك ، خودا پێکانی جێگیر دەکات لەسەر پردی (صراط) لەو ڕۆژەی کە پێیەکان دەلەرزن ودەخلیسکێن .

---

٦١. رواه الطبراني في المعجم الكبير(١٥٧/٢٢) ، والبيهقي في شعب الإيمان (١٤٣٠) ، وضعفه الألباني في (الضعيفة)(١٥٩٤).

وئیمامی ئەحمەد وئەبوداود لە سوننەکەیدا لە ئەبوئومامەی الباهلییەوە رضي الله عنه دەگێڕنەوە : کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی : (( من شفع لأخيه شفاعة ، فأهدى له عليها هدية فقبلها ، فقد أتى باباً عظيماً من أبواب الربا ))[٦٢].

واتە : ئەو کەسەی کارێك بۆ برایەکی موسڵمانی ڕێك بخات وئاسانکاری بۆ بکات ، ولەبەر ئەو کارەی دیارییەك وەربگرێت ئەوا دەرگایەکی گەورەی لە دەرگاکانی سووی (ربا) لەسەر خۆی کردووەتەوە .

وئیبراهیم الحربی لە عبداللەی کوڕی مەسعودەوە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە دەڵێت : ( السحت أن يطلب الحاجة للرجل ، فتقضى له ، فيهدي إليه هدية ، فيقبلها ) .

واتە : ئەگەر کەسێك کارێك بۆ کەسێکی تر ڕاپەڕێنێت ، دیاری بداتیٚ لەبەر ئەو کارە ، حەرامە لێی وەری بگرێت .

وديسان لە مسروقەوە گێڕدراوەتەوە لە سەر مافێکی زەوتکراو قسەی لەگەڵ ئیبن زیاددا کرد وگەڕاندیەوە بۆ خاوەنەکەی ، ئەو کەسەی مافەکەی بۆ گەڕێنرایەوە ، بەندەیەکی بەدیاری بۆ مسروق هێنا ، ئەویش لێی وەرنەگرت ، وتی لە ئیبن مەسعودم بیستووە دەیوت : ( من رد عن مسلم مظلمة ، فرزأه عليها قليلاً أو كثيراً ، فهو سحت : فقلت : يا أبا عبدالرحمن ! ما كنا نرى السحت إلا الرشوة في الحكم ، قال : ذاك كفر ).

واتە : ئەوەی ستەمێك لە سەر موسڵمانێك لا ببات ، لە بەرامبەردا پارەیەك وەربگرێت کەم بێت یان زۆر لەسەر ئەو کارە ئەوە حەرامە ، وتم باوکی عبدالرحمن : ئێمە ماڵی حەرام (السحت) بەس ئەوەیە لامان کەسێك بەرتیل بدات بەکاربەدەستان ، فەرمووی : ئەوە کوفرە .

---

٦٢. رواه أبوداود(٣٥٤١) ، وصححه الألباني في (صحيح الترغيب)(٢٦٢٤).

ئەگەر کاربەدەست ویستی سامان لە فەرمانبەرەکانی کۆ بکاتەوە وتایبەتی بکات بە خۆی وخزم ودارودەستەکەی ، پێویستە هاوکاری هیچ یەکێك لەو جۆرە کەسانە نەکرێت ، چونکە هەریەکە لەوان ستەمکارە وەك دزێکە لە دزێکی تر دزی بکات ، یان ئەو دوو کۆمەڵەی کە لەسەر دەمارگیری وپلەوپایە دەجەنگن دەستکەوتی هەردوو لایان حەرامە ، وحەرامە هاوکاری ستەمکار بکرێت ، چونکە هاوکاری دوو جۆرە :

یەکەم : هاوکاری لەسەر خێر وچاکە ، وەك هاوکاری لە تێکۆشان وئەنجامدانی سزاکان (الحدود) ، ولە وەرگرتنەوەی ماف ودانەوەی بە خاوەنەکانی ، ئەمە خودا وپێغەمبەرەکەی ﷺ فەرمانیان پێکردووە ، هەریەکە خۆی لە بەرگری کردن لەو مافانە بدزێتەوە بە بیانوی ئەوەی بە هاوکاری ستەمکاران نەیەتە ئەژمار ، ئەوە کارێك کە لەسەر خودی ئەو کەسە پێویستە (فرض عین) بەجێی نەهێناوە ، یان پێویستییەکی کفایەی (فرض کفایة) وازلێهێناوە ، ئەگەر واگومان ببات ئەوە دونیا نەویستیە(الورع) ، وەك زۆر جار ئەو کەسانەی ترسنۆك وسەرنەکەوتوون کارەکەیان بە دونیا نەویستی ناوزەند دەکەن ، چونکە هەریەکە لەو کارانە خۆگرتنەوەی وخۆدزینەوەی لەوەی پێویستە لەسەریان تێدایە.

دووەم : هاوکاری کردن لەسەر خراپە وخراپەکاری ، وەك هاوکاری کردن لە کوشتنی کەسانی بێتاوان ، وداگیرکردنی سامانی حەلاڵی خەڵك ، یان لێدانی کەسێك کەشایەنی لێدان نەبێت ... هتد ، ئەمە خودا وپێغەمبەرەکەی ﷺ حەرامیان کردووە .

بەڵێ لە کاتێکدا ئەو سامانەی بە ستەم لە خەڵك وەرگیراوە ئەستەم بوو بگەڕێنرێنەوە بۆ خاوەنەکانیان ، وەك زۆربەیماڵەکانی دەوڵەت ، هاوکاری کردن بۆ خەرج کردنی ئەو سامانانە بۆ خێر وچاکەی موسڵمانان وپڕکردنەوەی کەم وکورتیەکانیان ، ودابین کردنی بژێوی جەنگاوەران... هتد ، هاوکاری کردن لەسەر

ئەم جۆرە کارانە هاوکاریە لەسەر خێر وچاکە ، پێویستە لەسەر کاربەدەستان لەو سامانانەی کە بە ستەم لە خەڵکیان وەرگرتووە "ئەگەر خاوەنەکانیان یان میراتگرەکانیان نەناسیەوە بۆ ئەوەی بۆیان بگەڕێننەوە" ئەوا کاربەدەست دەتوانێت ئەو پارەیە لە بەڕێوەبردنی ئیش وکاری موسڵماناندا خەرج بکات "بەڵام دەبێت لەسەر ئەو ستەمەی تەوبە بکات وپەشیمان ببێتەوە ئەگەر خۆی ئەو ستەمەی کردبوو" ئەوە ڕای زۆربەی زانایانە : وەك مالك وئەبوحەنیفە وئەحمەد ، ولە زیاتر لە هاوەڵێکەوە گێڕدراوەتەوە ، وبەڵگەی شەرعی لەسەرە ، وئەگەر یەکێك لە قەڵەم ڕەوەکانی ئەو کارەیان کردبوو ئەوا پێویستە هەر بەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵدا بکات ، وئەگەر کاربەدەست ئامادە نەبوو ئەوماڵەی کە بە ستەم وەرگیراوە بگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی ، دیسان هاوکاری کردن لە خەرج کردنی لە خێر وچاکەی خاوەنەکانی وموسڵمانان باشترە لەوەی ڕەها بکرێت وئەو پارەیە بە فیڕۆ بچێت ، چونکە شەریعەت پەیڕەوکردن وکارپێکردنی وەستاوە لەسەر ئەم ئایەتە پیرۆزەی خودا کە دەفەرموێت : ﴿فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ ١٦﴾(التَّغَابُن) .

واتە : خودا بپەرستن بە گوێرەی توانا .

وئەوەیش مانای ئەو فەرموودەیە کە دەفەرموێت : ﴿ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ ١٠٢﴾(آلِ عِمۡرَان) .

واتە : خودا ﷻ بپەرستن وپارێزکاربن بەو شێوەیەی شایستەی خودایە .

وئەو فەرموودەی پێغەمبەری خودا ﷺ کە دەفەرموێت : (( إذا أمرتكم بأمر فأتوا منه ما استطعتم ))[٦٣].

٦٣. رواه البخاري(٧٢٨٨) ، ومسلم(١٣٣٧).

واته : ئەگەر فەرمانم پێکردن بەشتێك ئەوا بەگوێرەی توانا پێی هەستن .

ولەبەر ئەوەی کارکردن بۆ چاکسازی وبەرژەوەندی موسڵمانان وپەککخستنی خراپە وکەمکردنەوەی پێویستییەکی شەرعی یە ، بەڵام ئەگەر لە کاتێکدا دوو بەرژەوەندی پێچەوانەی یەکتر بوون ئەوکات پێویستە کام بەرژەوەندیان قازانجی گشتی زیاتر بوو ئەوەیان پەیڕەو بکرێت ، وهەوڵ بدرێت ئەگەر دوو کاری خراپ هەبوو خراپترینەکەیان بەرژەوەندی موسڵمانانی لیٚ بپارێزرێت .

کەسێك هاوکارە لەسەر ستەم وخراپەکاری ، کە یارمەتی ستەمکار بدات لەسەر ستەمکردن ، نەك کەسێك هاوکاری ستەم لێکراو بکات وهەوڵی نەهێشتنی ئەو ستەمە بدات لەسەری ، ئەوکات دەبێتە بریکار ویارمەتیدەری ستەم لێکراو نەك ستەمکار ، نموونەی ئەوەش بریکاری هەتیو وماڵی وەقفە ، ئەگەر کاربەدەستێکی ستەمکار داوای پارەی لێکرد ، هەوڵیدا بەکەمترین بڕی پارە ئەو کاربەدەستە ڕازی بکات ئەوە چاکەی کردووە وچاکەکاران لەوە زیاتریان لەسەر نییە .

وهەروەها بریکار ودەڵاڵ ونوسەر وبێجگە لە ئەوانیش ، کە پشتیان پێدەبەسترێت لە مۆرکردنی پەیمان ووەرگرتنی پارە ودانەوەی ئەوەی پێویستە بیدەنەوە ، نابێت بریکاری ستەمکاران بکرێت لە وەرگرتنی ماڵ وسامانی ناڕەوا لە خەڵك .

هەروەها ئەگەر ستەمێك سەپێنرا بەسەر خەڵکی گوندێك یان شارێك یان لەسەر ڕێگەیەك یان لەبازاڕێکدا ، لەو کاتەدا ئەگەر کەسێکی چاکەکار بووە ناوبژیکار بۆ لابردن یان کەم کردنەوەی ئەو ستەمە بەگوێرەی توانا ، ئەو پارەش کە داواکراوە لێیان بیدەنە کاربەدەست بەدادگەرانە دابەشی کرد بەسەر خەڵکەکە هەریەکە بەگوێرەی توانای ماددی ، بەبیٚ ئەوەی بەرژەوەندی خۆی وکەسانی تری تێدا ڕەچاو بکات ،

وبەرتیل وەرنەگرێت بەڵكو تەنها ببێتە بریكار لە جێگەی ئەوان وئەوەی لێیان داواكراوە هەوڵ بدات بەكەمی بیداتە كاربەدەستان ، ئەوە كەسێكی چاكەكارە ، بەڵام زۆرجار ئەو كەسانەی بەو كارانەوە تێوە گلاون بریكاری ستەمكارانن وخۆویست وبەرتیل خۆر ولایەنگری خزم ودۆستانی خۆیان دەكەن ولە كەسێك كە ئارەزوویان بوو لێی وەردەگرن ، ئەو كات ئەوە یەكێكە لە ستەمكارە گەورەكان ، ولە نێو دارە تەرمی (تابوت) ئاگریندا زیندوو دەكرێنەوە بۆ لێپرسینەوەی ئەوان وهاوشێوەكانیان ویارمەتی دەرەكانیان ، دوایی فڕێ دەدرێنە ناو دۆزەخەوە .

# بەشی ڕێگاکانی خەرج کردنی پارەی دەوڵەت

لە خەرج کردنی پارەی دەوڵەتدا پێویستە لە گرنگترین شتەوە دەست پێبکرێت کە بەرژەوەندی گشتی موسڵمانانی تێدابێت ، وەك پارەدان بەکەسێك کە بەهۆیەوە موسڵمانان قازانجێکی گشتی بکەن .

بۆ نموونە جەنگاوەران کەسانی تێکۆشەر وکۆڵنەدەرن ئەوان شایستەترین کەسن بەو ماڵانەی کە بەبێ جەنگ دەست دەکەون ، شەرعناسان ناکۆکن لەسەر ئەوەی کە ئایا ئەو پارە تەنها تایبەتە بەوان یان هاوبەشە لە نێوان ئەوان وبەرژەوەندیە گشتییەکاندا ؟ بەلاّم هەموو داهاتەکانی دەوڵەت لە بەرژەوەندی موسڵماناندا خەرج ودابەش دەکرێت ، مەگەر بە بەڵگەیەك تایبەت کرابێت وەك ماڵی زەکات ودەستکەوتەکانی جەنگ .

وئەو کەسانەی کە شایەنی وەرگرتنی پارەن لەلایەن دەوڵەتەوە وەك کاربەدەستان ودادوەران وزانایان وئەو کەسانەی زەکات وداهات کۆ دەکەنەوە ودەیپارێزن ودابەشی دەکەن وئیمامی مزگەوتەکان وبانگدەران و... هتد .

وهەروەها داهاتی دەوڵەت خەرج دەکرێت لە بژێوی وکرێ دەستی خەڵك وپاراستنی سنورەکان بە ئەسپ وچەك وتفاقی جەنگی ، وئاوەدانکردنەوە ونۆژەنکردنەوەی هەرشوێنێك پێویستی بە ئاوەدانکردنەوە هەبوو ، ولە ڕێگاوبانی خەڵك وپرد و ئاوەڕۆکان ... هتد .

ولەو کەسانەی کە شایستەن : خاوەن پێداویستیەکانن ، چونکە شەرعناسان ناکۆکن لەوەی کە ئایا بێجگە لە ماڵی زەکاتیش هەر ئەوان پێش دەخرێن ، لەو ماڵانەی کە

بەبێ جەنگ دەستی بەسەردا دەگیرێت ، هەندێکیان دەڵێن : پێش دەخرێن ، وئەوانی تر دەڵێن : ئەوماڵەی کە بۆ ئیسلامە ئەوان بەشیان تێدا هەیە ، وەك چۆن میراتگر بەشی لە ماڵی میرات بەردەکەوێت ، ئەو ڕایەش پەسەندترە کە دەڵێت : پێش کەسانی تر دەخرێن ، چونکە پێغەمبەری خودا ﷺ کەسانی نەدار وبێدەرامەتی پێش دەخست ، وەك چۆن لەماڵی (بنو النضير)دا ئەوانی پێش خەڵکانی تر خست ، وعومەری کوڕی خەتاب رضي الله عنه دەڵێت : ( ليس أحد أحق بهذا المال من أحد ، إنما هو الرجل وسابقته ، والرجل وغناؤه ، والرجل وبلاؤه ، والرجل وحاجته ) .

واتە : کەس لەم ماڵەدا لەکەسی تر شایستەتر ولە پێشتر نییە ، بەڵکو بۆ ئەو کەسانەیە کە بەهۆی پێشڕەوی ئەوانەوە ئەو ماڵە بەدەست هاتووە ، وبۆ ئەو کەسەی کە بەهۆی لێهاتوییەوە موسڵمانان توشی خێر بوون ، وبۆ ئەو کەسەی کە توشی ئێش وئازار بووە ، وئەو کەسەی کە نەدارە .

عومەر رضي الله عنه کردیانی بە چوار تاقمەوە :

یەکەم : ئەوانەی کە پێشەنگ بوون ، وبە هۆی ئەوانەوە ئەو ماڵە بە دەست هاتووە.

دووەم : ئەو کەسەی کە هەوڵی بە دەست هێنانی قازانج دەدات بۆ موسڵمانان ، وەك کاربەدەستان وزانایان کە هەوڵی قازانج وخێری دونیا وقیامەتی موسڵمانان دەدەن.

سێیەم : ئەوانەی کە توشی ئێش وئازار دەبن وهەوڵی دوورخستنەوە ولابردنی نەهامەتی وزیان لەسەر موسڵمانان دەدەن ، وەك تێکۆشەرانی ڕێگای خودا لە سەربازان وچاوساغانی سوپا وئامۆژگاریکاران وهاوشێوەکانیان .

چوارەم : نەداران ودەستکورتان.

وئەگەر كەسێك لەوانە ئەو بەشەی پێیدرا بەخشی ووەری نەگرت ئەوە خودا دەوڵەمەندی دەكات ، ئەگەر نا ئەوەندەی دەدرێتێ كە بەشی بكات یان بە گوێرەی كارەكەی ، ئەگەر زانرا پێدانی ماڵ بەكەسێك لە ئیش وكاری خۆیدا خەرجی دەكات ئەوە بەگوێرەی پێداویستی خۆی لە ماڵی زەكات وماڵە گشتیەكانیش بەشی دەدرێت ، لەوە زیاتری ناكەوێت ، مەگەر بەشێوازێك كە هاوشێوەكانی زیاتریان بەركەوێت ، چونكە ئەویش هاوتای دەسكەوتەكانی جەنگ وماڵی میراتە .

ودروست نییە پێشەوا وكاربەدەست ماڵ وپارە بدات بەیەكێك بە ویست وئارەزووی خۆی ، لەبەر خزمایەتی نێوانیان ، یان خۆشەویستی ... هتد ، وهەروەها دروست نییە پارە بدرێت بۆ مەبەستێكی حەرام وەك پێدان بە نێرەموك ومنداڵی جوان ، كەسی ئازادبن یان كۆیلە ، وهەروەها بە شەرواڵ پیس وگۆرانی بێژ وگاڵتەجاڕ وهاوشێوەكانیان ،یان بەخشین بە فاڵچیەكان لە جادوباز وئەستێرەناس وهاوشێوەكانیان.

ودروستە بەڵكو پێویستە پارەدان بۆ دڵ ڕاگرتنی كەسانێك كە پێویستیان بەدڵنەوایی ودڵ ڕاگرتن هەیە ، ئەگەرچی ئەو كەسەی ئەو ماڵەی پێدەدرێت دروست نەبێت بۆی ، هەروەها خودای پەروەردگار پێدانی ماڵی بۆ دڵنەوایی كردن لە قورئاندا حەلاڵ كردووە ، وهەروەها پێغەمبەر ﷺ ماڵی بەشی ئەو كەسانەداوە كە دڵیان ڕاگیركراوە لەو ماڵانەی كە دەستی بەسەردا دەگیرا بەبێ جەنگ ... هتد .

بۆ نموونە : (الأقرعی كوڕی حابس)ی سەرۆكی (بنو تميم) و(عیینەی كوڕی محصن) سەرۆكی (بنو فزارة) و(زيد الخير الطائي) سەرۆكی (بنو نبهان) و(علقمەی كوڕی علاثة العامری) سەرۆكی (بنوكلاب) ، وپیاوماقوڵانی قورەیش ئەوانەی كە لە ئازاد كردنی مەككەدا ئازادكرابوون وەك : صفوانی كوڕی ئومیە ، وعیكرمەی كوڕی ئەبوجەهل ،

وئەبو سوفیانی کوڕی حەرب ، وسهیلی کوڕی عەمر ، حارثی کوڕی هیشام ، ئەمانە وزۆر خەڵکی تر پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵی دەوڵەت دڵی ڕاگیر دەکردن .

لە هەردوو صەحیحەکەدا لە ئەبو سەعیدی خدریەوە رضي الله عنه گێڕدراوەتەوە دەڵێت :
((بعث علي وهو باليمن بذهيبة في تربتها إلى رسول الله ﷺ فقسمها رسول الله ﷺ بين أربعة : الأقرع بن حابس الحنظلي ، وعيينة بن حصن الفزاري ، وعلقمة بن علاثة العامري ، سيد بني كلاب ، وزيد الخير الطائي ، سيد بني نبهان . قال : فغضبت قريش والأنصار ، فقالوا : يعطي صناديد نجد ويدعنا : فقال رسول ، ﷺ : إني إنما فعلت ذلك لتأليفهم ، فجاء رجل كث اللحية ، مشرف الوجنتين ، غائر العينين ، ناتِيء الجبين ، محلوق الرأس ، فقال : اتق الله يا محمد . فقال رسول الله ﷺ : فمن يتق الله إن عصيته ؟ أيأمنني على أهل الأرض ولا تأمنوني ؟! قال : ثم أدبر الرجل ، فاستأذن رجل من القوم في قتله ، ويرون أنه خالد بن الوليد ، فقال رسول الله ﷺ : إن من ضئضئ هذا قوماً يقرءون القرآن لا يجاوز حناجرهم ، يقتلون أهل الإسلام ويدعون أهل الأوثان يمرقون من الإسلام كما يمرق السهم من الرمية ، لئن أدركتهم لأقتلنهم قتل عاد ))[٦٤].

واتە : عەلی رضي الله عنه کاتێك لە یەمەن بوو پارچە خشڵێکی پاڵفتە نەکراوی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ نارد ، دابەشی کرد بەسەر چوار کەسدا : ئەقرعی کوڕی حابسی الحنظلی ، وعویینەی کوڕی حصنی فزاری ، وعەلقمەی کوڕی علاثە العامری سەرۆکی (بنو کلاب) ، وزیدالخیر الطائی سەرۆکی (بنو نبهان) ، ئەبو سەعید دەڵێت : قورەیش وپشتیوانەکان پێیان ناخۆش بوو تورە بوون ، وتیان : بەشی سەرۆك وپیاوماقوڵانی نەجد دەدات وبەشی ئێمە نادات ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : من ئەوەم کرد لەبەر دڵ ڕاگرتنیان ، پیاوێکی ڕیش پڕی دەم وچاو گۆشتنی چاو بە قوڵدا چووی نێو چاوان پانی

٦٤. رواه البخاري(٣٣٤٤) ، ومسلم(١٠٦٤).

سەرتاشراو وتی : ئەی محمد لە خودا بترسە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : کێ لە خودا دەترسێت ئەگەر من سەرپێچی بکەم ؟! دوایی کابرا پشتی هەڵکرد ورۆیشت ، کەسێك لەوانەی لەوێ دانیشتبوون ڕوخسەتی خواست بۆ ئەوەی بیکوژێت ، دەڵێن : خالیدی کوڕی وەلید بوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : لە نەوە وهاوشێوەی ئەم کەسە کەسانێك پەیدا دەبن قورئان دەخوێنن لە قوڕگیان ناچێتە خوارەوە ، لەگەڵ ئەهلی ئیسلامدا دەجەنگن وواز لە دژایەتی وجەنگانی بت پەرستان دەهێنن ، لە ئاین دەردەچن وەك چۆن تیر لە کەوانەکەی دەردەچێت ، ئەگەر پێیان بگەم لەگەڵیان دەجەنگم تا لە ناویان دەبەم وەك چۆن گەلی عاد لە ناوچوون .

وڕافعی کوڕی خدیج رضي الله عنه دەڵێت : (( أعطى رسول الله ﷺ أبا سوفيان بن حرب ، وصفوان بن أمية ، وعيينة بن حصن ، والأقرع بن حابس ، كل إنسان منهم مائة من الإِبل ، وأعطى عباس بن مرداس دون ذلك ، فقال عباس بن مرداس :

أتجعل نهبي ونهب العبيـــــد ... بين عيينة والأقــــــرع
وما كان حصن ولا حابس ... يفوقان مرداس في المجــمع
وما كنت دون امرئ منهما ... ومن يخفض اليوم لا يرفع

، قال : فأتم له رسول الله ﷺ مائة ))[٦٥].

واتە : پێغەمبەری خودا ﷺ سەد حوشتری دایە هەریەکە لە ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب وصفوانی کوڕی ئومیە وعویینەی کوڕی محصن ، بەڵام لە ئەوان کەمتری دایە عەباسی کوڕی مرداس ، عەباس وتی : بەشی من و(عبید) کە ناوی ئەسپەکەی بوو ، دەدەیتە عویینە وئەقرع ، نەحصن ونەحابسیش ، لە داستانەکەدا پێش من نەکەوتوون

٦٥. رواه مسلم(١٠٦٠).

وله هیچ شتێك لەوان دوا نەكەوتووم ، ئەو كەسەش ئەمڕۆ بەشی كەم پێدرا ئیدی بەشی زیاد نادەن ، دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ بەشەكەی ئەویشی كرد بە سەد .

ئەو كەسانەی دڵنەوایی دەكرێن دوو جۆرن : بێباوەڕ وموسڵمان ، بەشدانی بێباوەڕ لەبەر ئەوەیە بەو پێدانە چاوەڕوانی موسڵمان بوونی لێدەكرێت ، یان بۆ دوورخستنەوەی شەڕ وزیانیەتی لە موسڵمانان ئەگەر بەوە نەبێت ئەو زیانە دوور نەكەوێتەوە.

وموسڵمانیش بە پێدانی دیسان چاوەڕوانی چاكە وقوڵ بوونەوەی ئیسلامەتیەكەی لێدەكرێت ، یان بەهۆی ئەو پێبەخشینەوە هاوشێوەكانی موسڵمانبن ، یان لەبەر ئەوەی هەندێك كەس ئەو پێداویستیانەی دەوڵەت كە لەسەریانە بەجێی ناهێنێت لە ترسی ئەو كەسە نەبێت ، یان لەبەر ڕق چواندنی دوژمنان ، یان لەبەر بەرگری كردنی شەڕ وزیانی لەسەر موسڵمانان ، ئەگەر بەوە نەبێت بەرگری نەكرێت ، ئەم جۆرە بەخشینە ئەگەرچی لە ڕەواڵەتدا ، بەخشینە بە پیاوماقوڵ ودەسەڵاتداران ، بەبێ پێدانی بێ دەسەڵاتان ، كە وەك كردەوەی پادشاكانە ، بەڵام هەموو كردەوەیەك بە نییەتە ، ئەگەر بەو كارە مەبەستی ئاین وبەرژەوەندی موسڵمانان بوو ، ئەوە وەكو ئەو بەخشینانەی پێغەمبەری خوا ﷺ وخەلیفەكانییەتی ، بەڵام ئەگەر مەبەست لەو بەخشینانە پاراستنی دەسەڵات وگەندەڵی بوو ، ئەوە لە جۆری بەخشینەكانی فیرعەونە ، بەڵام كەسانی خاوەن ئاینی خراپ وتوندڕەوی وەك (ذوالخویصرة) كە ئەو بەخشینانەی پێغەمبەری خودای ﷺ پێباش نەبوو نارەزایی دەربڕی ، وهەروەها حزبەكەی كە (خوارج) بوون لە دەسەڵاتی علی رضي الله عنه دەرچوون ونارەزاییان دەربڕی ، ومەبەستیان لە كێشەی (تحكیم) ڕەوا نەبوو .

ئەو کەسانە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی بە جەنگ کردووە لە دژیان ، چونکە بۆچوونێکی توندڕەویان لە ئایندا هەیە ، کە نە بەکەڵکی دونیا ونە بەکەڵکی دوارۆژ دێن.

وزۆر جار دونیا نەویستی (الورع) بێمانا تێکەڵ دەبێت لەگەڵ ترسنۆکی ورژدی ، چونکە لە هەردوو بارەکەدا ئەو کارەی فەرمانی پێکراوە لایەنێکی بە جێنایەت ، بۆ نموونە : بە ترسان لەوەی توشی خراپە بێت ، واز دەهێنێت لە تێکۆشان وجیهاد ، ونەدانی بژێوی ماڵ ومنداڵی ، لە بەر ترس ورژدی ، وپێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : (( شر ما في المرء شح هالع وجبن خالع ))[٦٦].

واتە : خراپترین شت لە مرۆڤدا ئەوەیە : زۆر ڕژد و زۆر ترسنۆك بێت .

وهەندێ جار مرۆڤ واز لە کردەوەیەك دەهێنێت لەبەر گومان ، یان بەدونیا نەویست خۆی پیشان دەدات ، بەڵکو لوت بەرز وخۆ بەزلزانە ، وئەو فەرموودەی پێغەمبەری خودا ﷺ : (( إنما الأعمال بالنيات ))[٦٧].

واتە : هەموو کردەوەیەك بەنییەتە .

وتەیەکی کۆکەرەوەیە ، چونکە نییەت بۆ کردەوە وەك ڕوحە بۆ لاشە ، ئەگەر وانەبوایە ئەو کەسەی کڕنوش بۆ خودا دەبات ، لەگەڵ ئەو کەسەی کڕنوش بۆ خۆر ومانگ دەبات لە ڕەواڵەتدا هیچ جیاوازیەکیان نییە ، چونکە هەریەکە لەوان نێو چاوانی دەخاتە سەر زەوی ، بەڵام لە ناوەڕۆك وماهیەتدا کەسی یەکەم نزیکترین کەسە

٦٦. رواه أبو داود(٢٥١١) ، وصححه الألباني في (صحيح الجامع)(٣٧٠٩).

٦٧. رواه البخاري(١) ، ومسلم(١٩٠٧).

لە خوداوە ، وئەوانی تریش دوورترین کەسانن لە خوداوە ، وخودای پەروەردگار دەفەرموێت : ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡمَرۡحَمَةِ ۝١٧﴾(البَلَد) .

واتە : ئەو کەسانەی ئامۆژگاری یەکتر دەکەن بە ئارامگرتن وبە بەزەیی لە نێوانیاندا.

ولە ئەسەرێکدا هاتووە : (( أفضل الإيمان السماحة والصبر ))[٦٨].

واتە : باشترین باوەڕ لێبوردەی وئارامگرتنە .

بەڕێوەبردن وپارێزگاری کردنی خەڵك بە دەست کراوەیی وبەخشین وفریاکەوتنیان نەبێت بەڕێوە ناچێت ، کە ئەوەش چاونەترسی دەگەیەنێت ، وهەر کەسێك ئەو دوو سیفەتەی تێدا نەبێت "بەخشندەی ولێهاتوویی" دونیا ودوارۆژیشی بۆ چاك نابێت ، ولەبەر ئەوە هەر کەسێك پشت ئەستوور نەبێت بەو دوو سیفەتە خودا کاری لە دەست دەردێنێت وبە کەسانی تری دەسپێرێت ، خودا دەفەرموێت : ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَا لَكُمۡ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلۡتُمۡ إِلَى ٱلۡأَرۡضِۚ أَرَضِيتُم بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا مِنَ ٱلۡأٓخِرَةِۚ فَمَا مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ ۝٣٨ إِلَّا تَنفِرُواْ يُعَذِّبۡكُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا وَيَسۡتَبۡدِلۡ قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ وَلَا تَضُرُّوهُ شَيۡـٔٗاۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ۝٣٩﴾(التَّوْبَة).

واتە : ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ئەوە چیتانە ئەگەر پێتان بگوترێت : دەربچن بۆ جەنگان وتێکۆشان لەپێناوی ڕێگای خودا تەمبەڵی دەکەن وحەزتان لە مانەوەیە لەماڵەوە ؟! ئایا ئێوە ژیانی دونیاتان لە پاداشتی ڕۆژی دوایی پێ باشترە ؟ ئەوە بزانن خۆشییەکانی دونیا لە چاو پاداشتی ڕۆژی دوایی زۆر کەمە ، ئەگەر ئێوە دەرنەچن بۆ جەنگان وتێکۆشان لە پێناو خودا ئەوا دەتان گۆڕێت بە کۆمەڵێکی تر ، وهیچ زیان بە خودا ناگات لە کەمتەرخەمی ئێوە ، خودا توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە .

---

٦٨. رواه البخاري في التاريخ الكبير(٥/٢٥) ، والحاكم في المستدرك (٣/٧٢٥) ، وصححه الألباني في (صحيح الجامع)(١٠٩٧).

ودیسان خودا دەفەرموێت : ﴿هَٰٓأَنتُمۡ هَٰٓؤُلَآءِ تُدۡعَوۡنَ لِتُنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَمِنكُم مَّن يَبۡخَلُۖ وَمَن يَبۡخَلۡ فَإِنَّمَا يَبۡخَلُ عَن نَّفۡسِهِۦۚ وَٱللَّهُ ٱلۡغَنِيُّ وَأَنتُمُ ٱلۡفُقَرَآءُۚ وَإِن تَتَوَلَّوۡاْ يَسۡتَبۡدِلۡ قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓاْ أَمۡثَٰلَكُم ﴿٣٨﴾﴾(مُحَمَّد).

واتە : ئێوە بانگهێشت دەكرێن بۆ ئەوەی لە پێناوی خودا ببەخشن ، بەڵام هەندێك لە ئێوە ڕژدی دەكەن ، ئەوەی ڕژدی بكات زیانی بۆ خۆی هەیە ، چونكە خودا دەوڵەمەندە وئێوە هەژارن ، ئەگەر ئێوە پشت لە بەرنامەی خودا هەڵكەن خودا دەتان گۆڕێت بە گەلێكی تر وەك ئێوە نەبن ولە ئێوە باشتربن .

ودیسان دەفەرموێت : ﴿لَا يَسۡتَوِي مِنكُم مَّنۡ أَنفَقَ مِن قَبۡلِ ٱلۡفَتۡحِ وَقَٰتَلَۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَعۡظَمُ دَرَجَةً مِّنَ ٱلَّذِينَ أَنفَقُواْ مِنۢ بَعۡدُ وَقَٰتَلُواْۚ وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ ﴿١٠﴾﴾(الحَدِيد).

واتە : یەكسان نین ئەوانەی پێش ڕزگاركردنی مەككە لە ڕێگای خودا ماڵیان بەخشیوە وجەنگاون ، لەگەڵ ئەوانەی دوای ئەوە ئەو كارانەیان ئەنجام داوە ، ئەوان پلەیان بەرزترە ، وخودا بە هەمووان بەڵێنی باشی داوە .

لێرەدا كارەكەی بە بەخشینەوە بەستووە ، كە لە دەست لە گوشادیەوە سەرچاوە دەگرێت ، وتێكۆشان وجەنگان كە لە بەجەرگ بوونەوە سەرچاوە دەگرێت ، وهەروەها خودای پەروەردگار لە زۆر شوێندا دەفەرموێت : ﴿وَجَٰهِدُواْ بِأَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ ﴿٤١﴾﴾(التَّوۡبَة) .

واتە : تێبكۆشن لە پێناوی خودا بەماڵ ونەفستان .

وخودا ڕوونی دەکاتەوە کە ڕژدی یەکێکە لە تاوانە گەورەکان وەك دەفەرموێت :

﴿وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ هُوَ خَيْرًا لَّهُم ۖ بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ ۖ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا۟ بِهِۦ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۗ ﴿١٨٠﴾﴾(آلِ عِمْرَانَ) .

واتە : واگومان نەبەن ئەو کەسانەی ڕژدی دەکەن لەوەی خودا بە فەزڵی خۆی پێی بەخشیون ، کاری باش دەکەن بۆ خۆیان بەڵکو ئەوە خراپە بۆیان ، ئەوەی کە ڕژدییان تیادا کردووە لە ڕۆژی دواییدا لە گەردنیان دەئاڵێنن .

ودەفەرموێت ﴿وَٱلَّذِينَ يَكْنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلْفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣٤﴾﴾(التَّوْبَة) .

واتە : ئەو کەسانەی زێڕ وزیو کۆ دەکەنەوە زەکاتی لێ دەرناکەن وچاکەی پێ ئەنجام نادەن لەبەر خودا ، مژدەیان بدەرێ بە سزایەکی بە ئێش وئازار .

وهەروەها ترسنۆکی تاوانێکی گەورەیە ، خودا دەفەرموێت : ﴿وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُۥٓ إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ فَقَدْ بَآءَ بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأْوَىٰهُ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٦﴾﴾(الآنفَال) .

واتە : هەر کەسێك پشت لە دوژمنان بکات لە کاتی جەنگدا ، لەبەر پلان وهونەری جەنگ نەبێت یان بۆ یارمەتیدانی کۆمەڵێکی تر ، ئەوە تووشی توڕەیی خودا دەبێت ، وسەرئەنجامی دۆزەخ دەبێت کە خراپترین چارەنوسە .

ودەفەرموێت : ﴿وَيَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنَّهُمْ لَمِنكُمْ وَمَا هُم مِّنكُمْ وَلَـٰكِنَّهُمْ قَوْمٌ يَفْرَقُونَ ﴿٥٦﴾﴾(التَّوْبَة) .

واتە : سوێند دەخۆن کە لەگەڵ ئێوەدان ، بەڵام لەگەڵ ئێوەدانین ، ئەوانە کەسانێکی لەرزۆك وترسنۆکن .

لەم جۆرە بەڵگانە زۆرن لە قورئان وسوننەتدا ، ئەوەش شتێکە کە خەڵکی سەر زەوی لەسەری کۆڕان ، هەتا لە هەندێ پەندی میلیدا دەڵێن (نە چزوی هەیە ، نەخوان) و(نە سوارچاکە ونەوەك عەرەب دەست گوشادە) .

لێرەدا خەڵکی پۆلێن دەکرێن بۆ سێ کۆمەڵ : کۆمەڵێك حەزیان لە خۆبەزل زانین وتێکدانە لەسەر زەوی ، وگوێ نادەنە پاشەڕۆژ ، وا دەبینن کە دەسەڵات بە بەخشین نەبێت ناپارێزرێت ، وئەو بەخشینەش بە دەست نایەت بە دەرهێنانی پارە لە ڕێگای نادروست وچەوت ولارەوە نەبێت ، بەوەش دەبنە چەتەی بەخشندە ! ئەو جۆرە کەسانە دەڵێن : ناشێت کەسێك ببێتە کاربەدەست بەسەر خەڵکەوە وخۆی لێی نەخوات وبەشی کەسانی تریش نەدات ، چونکە ئەگەر کەسێکی خۆپارێز ودەستپاك بکرێتە کاربەدەست کە خۆی لێی نەخوات وبەشی کەسانی تریش نەدات کاربەدەستەکانی سەرووی لێی زویر دەبن ولەسەر کاری لادەبەن ، ولەوانەیە دەست درێژی بکەنە سەر ماڵ وگیانی ، چونکە ئەو کەسانە چاویان لە بەرژەوەندی دونیایانە ، دواڕۆژی خۆیان لەبیر بردووەتەوە ، چارەنووسی ئەو کەسانە ڕیسوایی وسەرشۆڕیە لە دونیا وقیامەتدا ، ئەگەر پەشیمان نەبنەوە ودڵسۆزانە ئیش بۆ دونیا ودواڕۆژی خۆیان نەکەن .

وکۆمەڵێك ترسی خودایان هەیە ، وئاین ڕێگری ئەوەیان لێدەکات کە ستەم لە خەڵك بکەن وکاری حەرام ئەنجام بدەن ، ئەمە باش وپێویستە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا باوەڕیان وایە سیاسەت وا دەخوازێت کە هەندێك جار کارێکی حەرام ئەنجام بدرێت ، لەبەر ئەوە بە یەکجاری واز لە سیاسەت دەهێنن ، لەوە دەچێت لەبەر ترس یان لە بەر ڕژدی وبێ سەلیقەیی بێت بەڵام وای وێنا دەکەن کە پشت بە ئاین بەستنە ، لەبەر ئەوە هەندێك جار واز لە کردارێکی پێویست (واجب) دەهێنن ، کە واز لێهێنانی زیانی زیاترە لە ئەنجامدانی هەندێك کاری حەرام ، یان تووشی ئەوە دەبن کە فەرمان بە ئەنجام

نەدانی کارێکی پێویست بکەن ، کە ئەو فەرمان کردنە لەوانەیە ڕێگرتن بێت لە بەرنامەی خودا ، یان لەوانەیە لێکدانەوەی هەڵەیان کردبێت ، یان باوەڕیان وابووبێت کە نکولی ئەو ئیشە بە جەنگان نەبێت فەراهەم نایەت ، بەوەش لەگەڵ موسڵمانان‌دا دەجەنگن ، وەك خەوارجەکان ، ئەو جۆرەکەسانە بە کەڵکی دونیا وئایینیش نایەن ، بەڵام هەندێك جار بۆ کۆمەڵێك ئیش وکاری تایبەتی ئاینی وهەندێك ئیش وکاری دونیایی بەکاردێن ، ولەوە دەچێت لەو بۆچوونە هەڵەیەیان پەشیمان ببنەوە وبەوەش پێویستە لە کەم وکورتیان ببوردرێت ، ولەوە دەچێت هەندێك جار لەو کەسانەبن کە هەرچی ئیش وکار دەکەن بەفیڕۆ دەچێت ، ئەوانەی کە کۆششی دونیایان لە گومڕاییدا بەسەر بردووە ، واگومان دەبەن کە کارێکی باش دەکەن ، ئەم کۆمەڵە لەو کەسانەن کە نە بۆ خۆیان ونە بۆ کەسانی تر هیچ بەرەوا نابینن ، وا دەروانننە خەڵك کە هەموو لە بێبڕوا وتاوانبار پێکهاتووە ، وباوەڕیان وایە بەخشین بۆ دڵنەوایی کردن جۆرێکە لە ستەم وبەخشینی نارەوا .

کۆمەڵی سێیەم : گەلی دادوەر ومام ناوەندن ، پەیڕەوانی ئاینی محمد ﷺ ، وخەلیفەکانی ، هەتاکو ڕۆژی دوایی ، ئەمانە پێیان وایە بەخشینی ماڵ وسود گەیاندن بەخەڵکی "ئەگەرچی سەرکردە ودەست ڕۆیشتووشبن" بەگوێرەی پێویست ، بۆ باشتربوونی حاڵی ئەو کەسە وسەپاندنی ئاین لەلای پێویستە ، وئەوە ئەو دونیایە کە ئاین ئیشی پێیەتی ، وخۆپاراستنە لەوەی کە مافی ئەو نییە بیبات ، بەوەش لە خودا ترسان وچاکەکاری لەیەك کاتدا بۆ خۆیان کۆدەکەنەوە : ﴿إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحۡسِنُونَ ١٢٨﴾(النّحل) .

واتە : خودا لەگەڵ پارێزکاران وچاکەکاراندایە .

بەوەش نەبێت سیاسەتی ئاینی تەواو نابێت ، وتەنها بەم ڕێگایەش دونیا وئاینی خەڵکی بەباشی بەڕێوە دەچێت .

ئەو کەسانە یارمەتی خەڵکی دەدەن بەوەی پێویستیانە ، وئەوەی حەڵاڵ ورەوا نەبێت نایخۆن ، ئەم جۆرە کەسانە پارەیان کەمتر پێویستە بۆ خەرجی ڕۆژانەیان لە کەسی یەکەم ، چونکە ئەو کەسەی خەریکی کۆ کردنەوەی سامانە چاوی خەڵکی لەسەرە ، بەڵام ئەو کەسەی دەستپاك ودونیا نەویستە بەرچاو نییە ، وئەم جۆرەیان ئاینی خەڵکی پێباش دەکرێت وەك لەوەی دووەم ، چونکە دەستپاکی لەگەڵ هێزدا ڕێز وپایەی ئاین بەهێز دەکات ، لە هەردوو صەحیحەکەدا لە ئەبوسوفیانی کوڕی حەربەوە ﷺ ڕیوایەتیان کردووە : (( أن هرقل ملك الروم سأله عن النبي ﷺ : بماذا يأمركم ؟ قال : يأمرنا بالصلاة والصدق والعفاف والصلة ))[69].

واتە : هیرەقلی پادشای ڕۆم پرسیاری پێغەمبەری ﷺ لێکرد : بەچی فەرمانتان پێدەکات ؟ وتی : فەرمانمان پێدەکات بەنوێژ وخێر وچاکە ودەستپاکی وبەجێهێنانی ئەرکی خزمایەتی .

ولە ئەسەرێکدا هاتووە : ( أن الله أوحى إلى إبراهيم الخليل عليه السلام : يا إبراهيم : أتدري لم اتخذتك خليلاً ؟ لأني رأيت العطاء أحب إليك من الأخذ )[70].

واتە : خودا ﷻ سروشی (الوحی) کرد بۆ ئیبراهیمی ﷺ خۆشەویستی خۆی پێی فەرموو : ئەی ئیبراهیم دەزانی بۆچی تۆم بە خۆشەویستی خۆم هەڵبژاردووە ؟ چونکە بەخشینت پێ خۆشترە لە وەرگرتن .

---

٦٩. رواه البخاري(٧) ، ومسلم(١٧٧٣).

٧٠. قال ابن عثيمين (رحمه الله) : ظاهر هذا الأثر أنه ليس بصحيح ، لأن إبراهيم اتخذه الله خليلاً لأنه قدم محبة الله على أشد محبة في الدنيا وهي ابنه .

ئەوەی کە لە ڕۆژی وبەخشیندا باسمان کرد کە بریتییە لە دەست گوشادی وسود گەیاندن بە خەڵك ، هاوشێوەی ئارامگرتن وتوڕەبوونە ، کە بریتییە لە بەجەرگی وخۆپاراستن لە شتی خراپ .

چونکە خەڵك سێ کۆمەڵن : کۆمەڵێك لەبەر ئارەزووی خۆیان ولەبەر خودا توڕە دەبن ، وکۆمەڵێك نەلەبەر ئارەزوو ونەلەبەر خودا توڕە نابن ، کۆمەڵی سێیەم (دادوەرن) لەبەر خودا توڕە دەبن نەك لەبەر ئارەزوویان ، وەك لە هەردوو صەحیحەکەوە لە عائیشەوە ﵂ ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت : (( ما ضرب رسول الله ﷺ بيده : خادما له ، ولا امرأة ، ولا دابة ، ولا شيئا قط ، إلا أن يجاهد في سبيل الله ، ولا نيل منه شيء فانتقم لنفسه قط ، إلا أن تنتهك حرمات الله ، فإذا انتهكت حرمات الله لم يقم لغضبه شيء حتى ينتقم لله ))[71].

واتە : پێغەمبەری خودا ﷺ هیچ کات بە دەستی لە خزمەتکار وئافرەت وگیانلەبەر وهیچ شتێکی تری نەداوە ، مەگەر لە کاتی تێکۆشان لە پێناوی خودا نەبێت ، وهەرشتێکی بەرامبەر کرابێت تۆڵەی لەبەر خۆی نەکردووەتەوە ، مەگەر سنورێکی خودا بەزێنرابێت ، ئەگەر سنورێکی خودا بە پێش چاویەوە ببەزێنرایە هیچ ڕێگری لێنەدەکرد تا لەبەر خودا توڕە ببێت .

وئەو کەسەی لەبەر ئارەزووی خۆی هەڵدەچێت نەك لەبەر خودا ، وبۆ خۆی پارە وسامان دەبات وبەشی کەسی تری لێنادات ، ئەمە دەتوانین بە کۆمەڵی چوارەم پۆلێنی بکەین ، کە خراپترین دروستکراوی خودایە ، بەکەڵکی ئاین ودونیاش نایەت ، شایەنی باسە پیاو چاکان خاوەن سیاسەتی تەواون ، ئەوانن کە هەڵدەستن بەوەی پێویستە

71. رواه مسلم (٢٣٢٨).

لەسەریان وئەوەی حەرامە وازی لێدەهێنن ، ودەبەخشن لەبەر ئەوەی حاڵی خەڵکی باشبێت ، وئەوەی بۆیان حەڵاڵ نەبێت وەری ناگرن ، ولەبەر خودا تورە دەبن کاتێك سنورێکی خودا ببەزێنرێت ، ولە مافەکانی خۆیان خۆشدەبن ، ئەوە ڕەوشتی پێغەمبەری خودایە ﷺ ، لە بەخشین وپێدان کە نموونەی بەرز وباڵا بووە لەو بوارەدا ، وهەتاکو لەو ڕەوشتانەوە نزیکتربن باشترە ، با موسڵمان هەوڵبدات لەو ڕەوشتە جوانانەوە نزیك بێتەوە ، ودوای ئەوە داوای لێبوردن لە خودا بکات لەکەم وکورتی لەبەر نەگەیشتن بەو ڕەوشتە نموونەییانەی کە خودا پێغەمبەر محمدی ﷺ پێناردووە لە فەرمانەکانی ئاین ، ئەمەش لەو فەرموودەی خودای گەورەوە سەرچاوە دەگرێت : ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا ۝٥٨﴾(النِّسَاء) .

واتە : خودا فەرمانتان پێدەکات ڕاسپاردەکانتان بدەنە دەستی خاوەنەکانی ، وخودا زاناترە.

## بەشی دادگەری لە پیادەکردنی سنورەکان ومافەکان

ئەو فەرموودەی خودای گەورە : ﴿وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِٱلْعَدْلِ ۝٥٨﴾(النِّسَاء) .

واتە : ئەگەر دادوەریتان کرد لەنێوان خەڵك ، حوکم بە داد بکەن .

دادوەری کردن لە نێوان خەڵك لە سنورەکان ومافەکاندایە کە دوو جۆرن :

یەکەم : ئەو سنور ومافانەی کە هی کۆمەڵە کەسێکی دیاری کراو نییە ، بەڵکو قازانجی بۆ تێکڕای موسڵمانانە ، یان بۆ چینێك لەوانە ، وهەموویان پێویستیان پێیەتی ، پێی دەوترێت سنوور ومافەکانی خودا ، بۆ نموونە : تۆڵە کردنەوە لە چەتە ودز وداوێن پیس وهاوشێوەکانیان ، یان پارێزگاری سامانی دەوڵەت ومالّی وەقف ومالّی میراتی کەسێك کە میراتگری نەبێت ، ئەمانە لە گرنگترین ئیش وکارەکانی کاربەدەستانی دەوڵەتن ، لەبەر ئەوە عەلی کوڕی ئەبو تالب ﵁ دەڵێت : ( لابد للناس من إمارة برة أو فاجرة ، فقيل : يا أمير المؤمنين هذه البرة قد عرفناها ، فما بال الفاجرة ؟ فقال : يقام بها الحدود ، وتأمن بها السبل ، ويجاهد بها العدو ، ويقسم بها الفيء ) .

واتە : پێویستە خەڵك کاربەدەستیان هەبێت باش بێت یان خراپ ، وترا : ئەی کاربەدەستی باوەڕداران دەزانین کاربەدەستی باش پێویستە هەبێت ، ئەی خراپ بۆچی باشە ؟ وتی : سنورەکانی خودای پێ دەپارێزرێت ، وڕێگاکانی پێ سەلامەت دەکرێت ، وجەنگیان پێ دەکرێت لەگەڵ دوژمناندا ، ودەستکەوتەکانی جەنگی پێ دابەش دەکرێت.

ئەم بەشە دەبێت کاربەدەستان بەباشی ڕەچاوی بکەن ، مەرج نییە کەسێك بێت داوای مافە زەوت کراوەکانی بکات بۆ ئەوەی مافی بۆ وەربگیرێتەوە ، ودەبێت داوای گەواهیدەر بکرێت بەبیٚ ئەوەی کەس داوای بکات ، ئەگەرچی شەرعناسان ناکۆکن لە بڕینی دەستی دز کە ئایا پێویست دەکات ئەو کەسەی ماڵەکەی براوە داوای ماڵەکەی بکاتەوە ، دوو بۆچوون هەیە لە مەزهەبی ئەحمەد وئەوانی تر ، بەڵام هەموویان کۆڕان لەسەر ئەوەی کە پێویست ناکات ماڵ دزراوەکە داوای سەپاندنی ئەو سزایە بکات ، بەڵام هەندێکیان دەڵێن : مەرجە داوای ماڵەکەی بکات ، چونکە دەشێت ئەو کەسە ئەو ماڵەی کە بردوویەتی بە ماڵی خۆی بزانێت ، ئەوی تریان ئەو ماڵەی ئەوی بردبێت ، بۆیە دەبێت پێش ئەنجامدانی هەر سزایەك هیچ گومانێك لە پرسەکەدا نەمێنێت .

ئەم جۆرە سزادانە کەسی لیٚ بەدەر نییە کەسی ناودار وبێناو ، بەهێز وبیٚ هێز ، وهەموویان بەیەك چاو سەیردەکرێن ئەگەر هاتوو ئەو تاوانەیان ئەنجامدا ، وڕەوا نییە ئەو سزایە جێبەجیٚ نەکرێت لەبەر تکاکردن یان دیاری وەرگرتن یان هەرشتێکی تر ، وتکاکردن لەو جۆرەکارانەدا دروست نییە ، وهەرکەسێك ببێتە ڕێگر لە ئەنجامدانی ویەکێ بخات "لە کاتێکدا توانای ئەنجامدانی هەبێت" ئەوە بەر نەفرەتی خودا وفریشتەکان وخەڵك بەگشتی دەکەوێت ، وخودا تەوبە وپەشیمان بوونەوە یان کرداری فەرز وسوننەتی لێوەرناگرێت ، ولەو کەسانەیە کە ئاینی خودایان بە نرخێکی کەم فرۆشتووە ، ئەبو داود لە سوننەکەیدا لە عبداللە کوڕی عومەرەوە ﵄ ڕیوایەتی کردووە دەڵێت : پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (( مَنْ حَالَتْ شَفَاعَتُهُ دُونَ حَدّ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ ، فَقَدْ ضَادَّ اللَّهَ فِي أمره وَمَنْ خَاصَمَ فِي بَاطِلٍ وَهُوَ يَعْلَمُهُ لَمْ يَزَلْ فِي سَخَطِ اللَّهِ حَتَّى يَنْزِعَ ، وَمَنْ قَالَ فِي مسلم مَا لَيْسَ فِيهِ حبس فِي رَدْغَةَ الْخَبَال حَتَّى يَخْرُجَ مِمَّا قَالَ ، قيل يارسول الله : وما ردغة الخبال ؟ قال : عصارة أهل النار ))[٧٢] .

---

٧٢. رواه أبو داود(٣٥٩٧) دون قوله : ((قيل يارسول الله : وما ردغة الخبال ؟ قال : عصارة أهل النار)) وصححه الألباني في (صحيح الجامع)(٦١٩٦).

واته : ئەوکەسەی بەتکاکردن ببێتە ڕێگر لە جێبەجێکردنی سنورێك (حد) لە سنورەکانی خودا ، ئەوا بەرەنگاری خودا دەکات لە فەرمانەکانی ، وئەوەی مشتومڕ بکات لە کارێکی ناڕەوا وبزانێت ناڕەوایە ، ئەوە لە خەشم وتوڕەیی خودادا دەژێت ، هەتا واز لەو کارە دەهێنێت ، وئەوەی شتێك بە موسڵمانێك بڵێت ووانەبێت ئەوە لە(ردغة الخبال) بەند دەکرێت ، هەتا واز لەو وتە ناڕەوایە دەهێنێت ، وترا ئەی پێغەمبەری خودا (ردغة الخبال) چییە ؟ فەرمووی : چڵك وعارەقی خەڵکی دۆزەخە .

پێغەمبەر ﷺ لەو فەرموودەی سەرەوە باسی دادوەر وگەواهیدەر وسکاڵاکاری کرد کە ئەو سیانە سێ پایەی حوکمدانن .

ولە هەردوو صەحیحەکەدا لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە رضي الله عنها ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت : ((أَنَّ قُرَيْشًا أَهَمَّهُمْ شَأْنُ الْمَخْزُومِيَّةِ الَّتِي سَرَقَتْ فَقَالُوا : مَنْ يُكَلِّمُ فِيهَا رَسُولَ اللَّهِ ؟ فَقَالُوا وَمَنْ يَجْتَرِئُ عَلَيْهِ إِلَّا أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ ، فقال : ياأسامة : أَتَشْفَعُ فِي حَدّ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ ؟ إِنَّمَا أَهْلَكَ الَّذِينَ قَبْلَكُمْ أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا سَرَقَ فِيهِمْ الشَّرِيفُ تَرَكُوهُ وَإِذَا سَرَقَ فِيهِمْ الضَّعِيفُ أَقَامُوا عَلَيْهِ الْحَدَّ والذي نفس محمد بيده لَوْ أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ لَقَطَعْتُ يَدَهَا))[٧٣] .

واتە : قورەیش ئەو ژنە مەخزومیەی کە دزی کرد بوو سەرقاڵی کردبوون ، وتیان : کەس ناتوانێت لەو بارەیەوە قسە لەگەڵ پێغەمبەری خودادا بکات ﷺ ئوسامەی کوڕی زەید نەبێت ، فەرمووی : ئەی ئوسامە : ئایا تۆ تکا بۆ کەسێك دەکەیت کە سنورێکی خودای بەزاندووە ؟! نەوەکانی ئیسرائیل لەبەر ئەوە تیاچوون ئەگەر کەسێکی ناودار دزی بکردایە وازیان لێ دەهێنا ، بەڵام ئەگەر کەسێکی بێ هێز دزی بکردایە

٧٣. رواه البخاري(٣٤٧٥) ، ومسلم(١٦٨٨).

سزایان بەسەردا دەسەپاند ، سوێند بەو کەسەی گیانی محمدی بە دەستە ئەگەر فاتمەی کچی محمد دزی بکات دەستی دەبڕم .

ئەم بەسەرهاتە پەندە ، چونکە لەناو قورەیشدا (بنو مخزوم) و(بنو مناف) دوو بنەماڵەی زۆر بەرێز وناوداربوون ، بەڵام ئەو سزای بەسەردا سەپاند لەبەر دزینی قاپی چێشت لێنان ، لە خەڵکی وەر دەگرت بە ئەمانەت ودواتر نکولی لێ دەکرد ، لەسەر وتەی هەندێك زانا ، یان دزینی شتی تر لەسەر وتەی هەندێکی تریان ، گەورەیی هۆزەکەی وناوداری بنەماڵەکەی نەبوونە رێگری ئەنجامدانی ئەو سزایە ، وخۆشەویستی پێغەمبەری خودا ئوسامە تکای بۆ کرد ، پێغەمبەر ﷺ تورە بوو لەوەی کە لەکارێکدا خودا حەرامی کردووە تکا دەکات ، دواتر نموونەی بە کچەکەی خۆی هێنایەوە کە باشترین ژنی دونیایە وخودا لەو کارە خراپە پاراستوویەتی ، فەرمووی : ئەگەر فاتمەی کچی محمد دزی بکات دەستی دەبڕم ، ڕیوایەت کراوە ئەو کچەی کە دزییەکەی کرد دواتر تەوبەی کرد ، ودەهاتە خزمەتی پێغەمبەری خودا ﷺ پێداویستیەکانی بۆ دابین دەکرد .

ودیسان ڕیوایەت کراوە : (( إن السارق إذا تاب سبقته يده إلى الجنة ، وإن لم يتب سبقته إلى النار ))[٧٤].

واتە : ئەگەر دز تەوبە بکات دەستی پێش خۆی دەکەوێت بۆ بەهەشت ، بەڵام ئەگەر تەوبە نەکات پێشی دەکەوێت بۆ دۆزەخ ، ومالك لە الموطأدا ڕیوایەتی کردووە : ( أن

---

٧٤. قال ابن عثيمين : (شيخ الاسلام ذكره بصغية التمريض ، والظاهر أن هذا المتن منكر ، لأنه يخالف الحديث الصحيح في البخاري وغيره : ((أن من فعل شيء من هذه القاذورات فأقيم عليه الحد فهو كفارة له)) رواه البخاري (٦٧٨٤) ، ومسلم (٤٥٦٠).

جماعة أمسكوا لصاً ليرفعوه إلى عثمان رضي الله عنه ، فتلقاهم الزبير فشفع فيه فقالوا : إذا رفع إلى عثمان فاشفع فيه عنده ، فقال : إذا بلغت الحدود السطان فلعن الله الشافع والمشفع).

واته : كۆمەڵە دزێكیان دەستگیركرد ، ویستیان ببەن بۆ لای عثمان رضي الله عنه ، لە ڕێگا زوبیریان پێگەیشت داوای كرد ئازادی بكەن ، وتیان : لای عثمان رضي الله عنه تكای بۆ بكە ، وتی : ئەگەر ئەو كارانە گەیشتە سوڵتان ، خودا نەفرەت لە تكاكار وتكا وەرگر دەكات.

واته : ئەو كەسانە كە تكا لە سنورەكانی خودادا وەردەگرن ، صفوانی كوڕی ئومەیە جارێك لەسەر پۆشاكەكەی (رداء) لە مزگەوتی پێغەمبەری خودا صلى الله عليه وسلم خەوتبوو ، كابرایەك لێی دزی ، صفوان گرتی وبردی بۆ لای پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم : ئەویش فەرمانی كرد بە بڕینی دەستی ، وتی : ئەی پێغەمبەری خودا صلى الله عليه وسلم لە بری پۆشاكەكەم دەستی دەبڕی ؟ من پێی دەبەخشم ، فەرمووی : (( فهلا قبل أن تأتيني به ))[٧٥].

واته : پێش ئەوەی بتهێنایە بۆ لای من دەتتوانی ببەخشیت .

دواتر دەستیان بڕی ، مانای وایە ئەو حوكمە پێش ئەوەی بچێتە بەردەستی كاربەدەستان توانای لێبوردنی هەیە ، بەڵام دوای ئەوەی بەرزكرایەوە بۆ لایان دەبێت ئەنجام بدرێت ، نابێت تكاكردن یان بەخشین یان لێبوردن یان هەر شتێكی تر ببێتە ڕێگری ئەنجامدانی ئەو سزایە.

لەبەر ئەوەیە زانایان هەموو كۆ دەنگن "ئەوەی من بزانم" لەسەر ئەوەی كە چەتە وڕێگر ودز وهاوشێوەكانیان ، ئەگەر كێشەكەیان بەرزكرایەوە بۆ لای كاربەدەست دوای ئەوە تەوبە بكەن ، ئەو تەوبەكردنە سزاكەیان لەسەر هەڵناگرێت ، بەڵكو پێویستە بەسەریاندا بسەپێت ئەگەر تەوبەش بكەن ، ئەگەر تەوبەیان كرد بە ڕاستی ئەوا

٧٥. رواه أبوداود (٤٣٩٤) ، والنسائي(٤٨٨١) ، وابن ماجه(٢٥٩٥) ، وصححه الألباني في (صحيح أبي داود).

ئەو سزا دەبێتە کەفارەتی ئەو تاوانەیان ، جێبەجێکردنی ئەو سزایە دەبێتە یارمەتیدەرێك بۆ تەواو بوونی تەوبەکەیان وگەڕاندنەوەی مافەکان بۆ خاوەنەکانیان ، بەوەش بەسزادان مافی ئادەمیزادەکان دەگەڕێتەوە ، ئەمە لە بنچینەدا لەو فەرموودەی خودای گەورەوە سەرچاوەی گرتووە : ﴿مَّن يَشْفَعْ شَفَٰعَةً حَسَنَةً يَكُن لَّهُۥ نَصِيبٌ مِّنْهَاۖ وَمَن يَشْفَعْ شَفَٰعَةً سَيِّئَةً يَكُن لَّهُۥ كِفْلٌ مِّنْهَاۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ مُّقِيتًا ﴿٨٥﴾﴾(النِّسَاء) .

واتە : هەرکەسێك یارمەتی دەربێت وتکاکاری ونێوانگیری بۆ کاری باشە بکات پاداشت وچاکەی دەستگیر دەبێت ، وهەرکەسێك یارمەتی دەربێت وتکاکاری ونێوانگیری بۆ خراپە بکات بەشدارە لەو تاوان وخراپەیە ، خودا بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە ، یان خودا پارێزەری پاداشتی هەمووانە ، وپاداشتی هەرکەسێك بە گوێرەی کردەوەکەی دەداتەوە .

چونکە هاوکاری کردن یارمەتیدانی کەسێکە کە داوای یارمەتی بکات هەتاکو لە گەڵیدا ببێتە هاوەڵ ، چونکە پێشتر خۆی تەنها بووە ، ئەگەر یارمەتیدەری بوو لەسەر خێر وچاکە ، ئەوە هاوکارێکی چاکە ، بەڵام ئەگەر یارمەتیدەری بوو لەسەر کاری خراپە ، ئەوکات دەبێتە هاوکارێکی خراپ ، چاکەش ئەوەیە کە فەرمانی پێکراوە ، خراپەش ئەوەیە کە یاساغی لێکراوە ، وئەگەر ئەو دوو هاوکارە درۆیان لەگەڵ یەکدا کرد ، ئەوا خودا ڕێنمایی کەسانی ناپاك ناکات .

خودای پەروەردگار دەفەرموێت : ﴿إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسْعَوْنَ فِى ٱلْأَرْضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوْ يُصَلَّبُوٓاْ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلَٰفٍ أَوْ يُنفَوْاْ مِنَ ٱلْأَرْضِۚ ذَٰلِكَ لَهُمْ خِزْىٌ فِى ٱلدُّنْيَاۖ وَلَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٣٣﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِن قَبْلِ أَن تَقْدِرُواْ عَلَيْهِمْۖ فَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٤﴾﴾(المَائِدَة) .

بێگومان پاداشتی ئەو کەسانەی دژایەتی خودا وپێغەمبەرەکەی دەکەن وهەوڵی نانەوەی بشێوی وتێکدان دەدەن لەسەر زەوی ئەوەیە : بکوژرێن ، یان لە خاچ بدرێن ، یان دەست وپێیان بە چەپ وڕاست ببڕدرێت ، یان لەو سەر زەمینە دوور بخرێنەوە ، ئەو کەسانە لە دونیا سەرشۆڕ وڕیسوان ، ولە دوارۆژیش دا سزایەکی زۆر گەورەیان بۆ هەیە ، جگە لەوانەیان کە تەوبە دەکەن وپەشیمان دەبنەوە پێش ئەوەی دەستتان بچێت بەسەریاندا ودەستگیریان بکەن ، بزانن بێگومان خودا لێخۆش بوو وپۆشەری تاوان وبە بەزەییە .

دەبینین تەنها ئەو کەسانەی هەڵاوێردە کرد (إستثناء) کە پێش ئەوەی دەستگیر بکرێن پەشیمان دەبنەوە ، بەڵام ئەوانەی پەشیمان نەبنەوە تا دوای دەستگیرکردنیان ، ئەوا سزا دەدرێن لەبەر ئەوەی ئایەتەکە گشتیە وماناکەشی ئەوە دەگەیەنێت ، لەبەر وازنەهێنان لەو کردارەیان .

ئەوە لە کاتێکدایە کە بە بەڵگە ئەو تاوانە بسەلمێت ، بەڵام ئەگەر خۆی دانینا بەتاوانەکەی وپەشیمان بوونەوەی خۆی ڕاگەیاند ، ئەو کات زانایان ناکۆکن لە حوکمی ئەو کەسە ، ئێرە جێگەی درێژەپێدانی نییە ، لە مەزهەبی ئیمامی ئەحمەددا هەرکەسێك بەو شێوە بێت حەددی بەسەردا ناسەپێت ، بەڵام ئەگەر خۆی داوای ئەنجامدانی حەددی کرد ئەو کات بەسەریدا دەسەپێت ، وئەگەر ڕۆیشت وازی لێدەهێنرێت .

ئەوەش لە فەرموودەکەی ماعزی کوڕی مالکەوە وەرگیراوە ، کە فەرمووی : (( فهلا تركتموه ))[٧٦].

واتە : بریا وازتان لێبهێنایە .

---

٧٦. رواه الترمذي (١٤٢٨) ، وابن ماجه(٢٥٥٤) ، وقال الألباني في (صحيح ابن ماجه) : حسن صحيح.

وئەو فەرمووەدەی : (( أصبت حداً فأقمه علي ))[77].

واتە : تاوانێکم کردووە کە شایانی حەد لێدانم ، بەسەرمدا بیسەپێنە .

لەگەڵ کۆمەڵێك ئەسەری تر ، ولە سوننەنی ئەبو داود والنسائی لە عبدالله کوڕی عومەر رضي الله عنهما ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت : پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : (( تعافوا الحدود فيما بينكم ، فما بلغني من حد فقد وجب ))[78].

واتە : لە ئەو حەددانەی دەکەوێتە نێوانتانەوە لەیەکتر خۆشبن ، هەرچ حەددێك بێتە لای من پێویستە بەئەنجامی بگەیەنم .

ولە سوننەنی النسائی وئیبن ماجە لە ئەبوهورەیرەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی : (( حد يعمل به في الأرض ، خير لأهل الأرض من أن يمطروا أربعين صباحاً ))[79].

واتە : حەددێك لەسەر زەوی ئەنجام بدرێت ، باشترە لەوەی چل ڕۆژ باران بۆ خەڵکی سەر زەوی ببارێت .

چونکە تاوان کردن هۆیەکە بۆ کەمی ڕۆزی ودەبێتە مایەی ترسان لە دوژمنان ، ئەوەش قورئان وسوننەت بەڵگەن لەسەری ، ئەگەر حەد ئەنجام بدرێت وسزای

---

٧٧. رواه البخاري(٦٨٢٣) ، ومسلم(٢٧٦٤).

٧٨. رواه أبوداود(٤٣٧٦) ، والنسائي(٤٨٨٥) ، وصححه الألباني في (صحيح الجامع) (٢٩٥٤).

٧٩. رواه النسائي(٤٩٠٤،٤٩٠٥) ، وابن ماجه(٢٥٣٨) ، وحسنه الألباني في (صحيح الجامع) (٣١٣٠).

تاوانباران بدرێت گوێڕایەڵی خودا زیاتر دەبێت وتاوانکاری کەم دەبێتەوە ، بەوەش خەڵك ڕۆزی دەدرێن وسەردەکەون.

ودروست نییە لە داوێن پیس ودز ومەیخۆر وچەتە ورێگر وهاوشێوەکانیان ، پارە وەربگیرێت بۆ ئەوەی حەددیان لەسەر ئەنجام نەدرێت ، جا ئەو پارەیە بۆ خەزێنەی دەولەت بێت یان بۆ شتی تر ، ئەو پارەیەی کە بۆ پەکخستنی حەددێك وەردەگیرێت پارەیەکی قێزەون وپیسە ، ئەگەر کاربەدەست ئەوەی کرد ، ئەوە دوو کاری خراپی گەورەی کردووە ، یەکەمیان : پەکخستنی حەددەکە ، دووەمیان خواردنیماڵێکی پیس وخراپ ، بەوەش کارێکی حەرامی ئەنجامداوە وکارێکی پێویستی (واجب) واز لێهێناوە ، خودا دەفەرموێت : ﴿لَوْلَا يَنْهَىٰهُمُ ٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ عَن قَوْلِهِمُ ٱلْإِثْمَ وَأَكْلِهِمُ ٱلسُّحْتَ ۚ لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ ﴿٦٣﴾﴾ (المَائِدَة) .

واتە : ئەوە بۆچی شارەزا ودانا پەروەردەکار وزاناکانیان یاساغی گوفتاری خراپ وخواردنی حەرامیان لێناکەن ؟! سوێندبێت کارێکی نەشیاو دەکەن .

وپەروەردگار بە جولەکە دەفەرموێت : ﴿سَمَّٰعُونَ لِلْكَذِبِ أَكَّٰلُونَ لِلسُّحْتِ ۚ﴿٤٢﴾﴾ (المَائِدَة) .

واتە : جولەکەکان زۆر حەرام خۆرن وسڵ لە خواردنی بەرتیل ناکەنەوە .

چونکە جولەکەکان بەرتیل خۆر بوون ، وهەندێك جار ناوی دیاری یان شتی تری لێدەنێن ، وهەرچ کاتێك کاربەدەست بەرتیلی خوارد ، ناچار دەبێت گوێ بۆ درۆ

وگەواهی درۆ وشتە خراپەکانی تر بگرێت : (( لعن رسول الله ﷺ الراشي والمرتشي والرائش "الواسطة" الذي بينهما ))[٨٠].

واتە : پێغەمبەری خودا ﷺ نەفرەتی کردووە لەو کەسەی بەرتیل دەخوات ولەو کەسەی بەرتیل دەدات ، وئەو کەسەش لە نێوانیاندا ئیش دەکات .

ولە هەردوو صەحیحەکەدا هاتووە : ((إِنَّ رَجُلَيْن اختصما إلى النبي ﷺ فَقَالَ أحدهما يَا رَسُولَ اللَّهِ أقض بيننا بِكِتَابِ اللَّهِ فَقَالَ صاحبه "وكان أَفْقَهُ مِنْهُ" نَعَمْ يا رسول الله : فَاقْضِ بَيْنَنَا بِكِتَابِ اللَّهِ وَأْذَنْ لِي فقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قُلْ قَالَ إِنَّ ابْنِي كَانَ عَسِيفًا فِي أهل هَذَا "يعني أجيراً" فَزَنَى بِامْرَأَتِهِ فَافْتَدَيْتُ مِنْهُ بِمِائَةِ شَاةٍ وَخادم ، وإِنِي سَأَلْتُ رجالاً من أَهْلَ الْعِلْمِ فَأَخْبَرُونِي أَنَّ على ابْنِي جَلْدُ مِائَةٍ وَتَغْرِيبُ عَامٍ وَأَنَّ عَلَى امْرَأَةِ هَذَا الرَّجْمَ فَقَالَ : وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَأَقْضِيَنَّ بَيْنَكُمَا بِكِتَابِ اللَّهِ المائة والخادم رَدٌّ عليك وَعَلَى ابْنكَ جَلْدُ مِائَةٍ وَتَغْرِيبُ عَامٍ وَاغْدُ يَا أُنَيْسُ على امْرَأَةِ هَذَا فاسألها فَإِنْ اعْتَرَفَتْ فَارْجُمْهَا ،فسألها ، فاعترفت ، فرجمها))[٨١].

واتە : دوو پیاو هاتن بۆ سکالاکردن لای پێغەمبەری خودا ﷺ یەکێکیان وتی : ئەی پێغەمبەری خودا بە قورئانی خودا دادوەری بکە لە نێوانماندا ، ئەوی تریان وتی "کە لە ئەوەی تریان شارەزاتر بوو" : بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ بە قورئانی خودا دادوەری بکە لە نێوانماندا بەڵام ڕوخسەتم بدە ، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی : بەڵێ ، وتی : کوڕێکم لە ماڵی ئەم کابرایە کرێکاری دەکرد ، ولەگەڵ ژنەکەی داوێن پیسی کردووە ، لە جیاتی ئەوە سەد مەڕ وکارەکەرێکم داوەتە ئەم کابرایە ، بەڵام پرسیارم لە

---

٨٠. رواه أحمد(٢١٨٩٣) ، وضعفه الألباني في (ضعيف الجامع)(٤٦٨٤) ، ورواه أبو داود(٣٥٨٠) ، والترمذي(١٣٣٧) ، وابن ماجه(٢٣١٣) ، دون قوله(الرائش) ، وصححه الألباني في (صحيح الجامع)(٥١١٤).

٨١. رواه البخاري(٦٨٩٥ ، ٦٨٦٠) ، ومسلم(١٦٩٧ ، ١٦٩٨).

کۆمەڵە خەڵکێکی زانا کرد ، پێیان وتم : کوڕەکەی من دەبێت سەد جەلدەی لێبدرێت وساڵێك دوور بخرێتەوە ، ژنەکەی ئەویش دەبێت بەردباران (رجم) بکرێت ، فەرمووی : سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە بە قورئانی خودا دادوەری دەکەم لە نێوانتان ، سەد مەڕ وکارەکەرەکەت بۆ دەگەڕێتەوە ، وپێویستە سەد جەلدە لە کوڕەکەی تۆ بدرێت وساڵێك دووربخرێتەوە ، ئەی (ئونەیس) بڕۆ پرسیار لە ژنی ئەم پیاوە بکە ئەگەر دانینا بە تاوانەکەیدا بەردبارانی بکە ، ئەویش پرسیاری لێکرد ، وئافرەتەکەش دانینا بەتاوانەکەیدا وبەردباران کرا .

لەم فەرموودەیە ئەوە دەردەکەوێت کە کاتێك ماڵدرا بۆ پەکخستنی حەد لەسەر ئەو کابرایە ، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی بەگەڕانەوەی ماڵەکە کرد بۆ خاوەنەکەی ، وفەرمانی کرد ئەو حەددە لەسەر تاوانبارەکە ئەنجام بدەن ، ئەو پارەی وەرنەگرت بۆ موسڵمانان ، یان بۆ جەنگاوەران وهەژاران یان بۆ کەسانی تر ، وموسڵمانان کۆ دەنگن کە پەکخستنی حەد بە وەرگرتنی پارە یان لەبەر شتی تر دروست نییە ، ولەسەر ئەوەش کۆ دەنگن کە ئەو پارەیەی لە داوێن پیس ومەیخۆر و ئاژاوەچی وچەتە وڕێگر وهاوشێوەکانیان وەردەگیرێت ، شتێکی پیس وقیزەونە وحەرامە وەرگرتنی ، وزۆر جار گەندەڵی لە ژیانی خەڵکدا دروست دەبێت بە هۆی پەکخستنی حەدد وسزانەدانی تاوانباران بە هۆی پارە وەرگرتنەوە یان بە هۆی ناوبانگ وپلەوپایەوە ، ئەمەش گەورەترین هۆیەکاری تێکچوونی ژیانی گەلانی وەك عەرەب وتورك وکوردە ، هەروەها تێکچوونی ژیانی جوتیاران وهەموو چینە جیاوازەکانی کۆمەڵگەیە لە دەوڵەمەندان وهەژاران وپیاوماقوڵان وئەفسەرانی سوپا وسەربازان ، وهەرکاتێك کاربەدەستێك بەرتیلی وەرگرت ڕێزی نامێنێت ولە دڵی خەڵکیشدا جێگەی نابێتەوە ، ئیدی نەفسی

نزم دەبێت وناتوانێت هیچ حەدد وسزایەك ئەنجام بدات ، ودەچێتە سەر شێوەی جولـەكە نەفرەت لـێكراوەكان .

وشەی (برطیل) لـە زمانی عەرەبیدا لـە بنچینەدا بە بەردی لاكێشە دەوترێت ، ئەو كەسەی بەرتیل وەردەگرێت ناتوانێت دان بەڕاستیدا بنێت وەك كەسێك بەردێكی لاكێشەی لـە دەمدا بێت وببێتە ڕێگری ئەوەی دان بەڕاستیدا بنێت ،ولـە ئەسەرێكدا هاتووە : ( ئەگەر بەرتیل لـە دەرگاوە هاتە ژوورەوە ، دەستپاكی لـە پەنجەرەوە دەچێتە دەرەوە).

وهەروەها ئەگەر پارە وەرگیرا بۆ دەولـەت لـەسەر ئەو كارانە ، دیسان وەك ئەو مالـە پیس وقێزەونەیە كە پێی دەوترێت تەمێكردن ، هەندێك لـە گوندنشینە خراپەكارەكان پارەیان لـە هەندێك خەلـك وەردەگرت ، دواتر دەهاتن بۆ لای كاربەدەستان ئەسپ وولاخیان لـەگەل خۆیان بۆ دەهێنان یان بۆ فەرمانبەرەكانی ،بەوەش ئارەزوویان بۆ گەندەلـی زیاتر دەكەن ، ئیدی ڕێزی دەولـەت وكاربەدەستان نامێنێت وخەلـكیش خراپ دەبن .

هەروەها مەیخۆر ئەگەر پارەی لـێوەرگیرا ، ئیدی هەرچی ئەوانەی مادە هۆشبەرەكان دەخۆنەوە ئارەزوو دەكەن كاتێك خواردیانەوە كاربەدەست بڕێك پارەیان لـێوەر بگرێت ، ئەوەش دەبێتە هاندەری خراپە وتەشەنەكردنی ، وهەروەها كەسانی ناودار ئەگەر دالـدەی كەسێك بدەن وببنە ڕێگر لـە بەردەم ئەنجامدانی حەددێك ، بۆ نموونە ئەگەر كۆمەلـە جوتیارێك تاوانێك ئەنجام بدەن ، دواتر پەنا ببەنە لای كاربەدەستێك ودالـدەیان بدات وببێتە ڕێگر لـە فەرمانی خودا وپێغەمبەر ﷺ ، بەو كارەیان لـەو كەسانە دەبن كە خودا وپێغەمبەر ﷺ نەفرەتیان لـێكردووە .

مسلـم لـە صەحیحەكەیدا ڕیوایەتی كردووە لـە عەلی كوڕی ئەبوتالـبەوە رضي الله عنه دەلـێت : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی : (( لعن الله من أحدث حدثاً أو آوى محدثاً ))[٨٢].

---

٨٢. رواه البخاري(٣١٨٠) ، ومسلم(١٣٧٠).

واته : نەفرەتی خودا لە کەسێك کە شتێکی خراپ دادەهێنێت ، یان دالّدەی خراپەکارێك دەدات .

هەرکەسێك پەنای یەکێك لەو خراپەکارانە بدات ئەوە خودا وپێغەمبەرەکەی ﷺ نەفرەتیان لێکردووە ، ئەگەر پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوەی فەرمووە : (( إن من حالت شفاعته دون حد من حدود الله ، فقد ضاد الله في أمره ))[٨٣].

واته : ئەوەی تکاکردنی ببێتە مایەی جێبەجێ نەکردنی حەددێك لە حەددەکانی خودا ، ئەوا بەرەنگاری خودا دەکات لە فەرمانەکانی .

ئەی ئەگەر کەسێك حەددەکات پەك بخات بە توانایی وهێز ، ولە تاوانباران خۆش بێت بەپارەیەکی پیس ونارەوا ، ئەوا بێگومان خراپییەکەی زیاترە .

دواتر خراپترین کار ئەوەیە کە پەنای تاوانباران بدرێت لەبەر پلەوپایە یان پارە ، جا ئەو پارەیە بۆ دەولّەت وەربگیرێت یان بۆ بەرپرسێك بێت بە ئاشکرا یان بە پەنهان ، هەموو ئەوانە حەرامن بەکۆدەنگی موسلّمانان ، نموونەی ئەوانە وەك پارێزگاری کردنە لە مەیخانە ومادە بێ هۆشکەرەکان ، چونکە ئەوەی ئەوکارە ئەنجام بدات ، یان یارمەتی کەسێك بدات لەسەر ئەو کارە بەوەی پارەیەکی لێوەربگرێت ، هەموو ئەوانە هاوشێوەی یەکن .

ئەو پارەی لەسەر ئەو جۆرە کارانە وەردەگیرێت وەك پارەی داوێن پیسی وپارەی فالّچی وپارەی فرۆشتنی سەگ وپارەی ئەو کەسەی نێوانگیری پیاو وئافرەتی داوێن پیس

---

٨٣. رواه أبوداود(٣٥٩٧) ، وصححه الألباني في (صحيح الجامع)(٦١٩٦).

دەكات كە پێیدەوترێت گەواد (القواد) ، پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : (( ثمن الكلب خبيث ، ومهر البغي خبيث ، وحلوان الكاهن خبيث ))[٨٤].

واتە : پارەی سەگ پیسە ، وپارەی داوێن پیسی پیسە ، وپارەی فاڵچی پیسە .

پارەی داوێن پیسی كە پێی دەوترێت دابەزینی سۆزانی (حدور القحاب) ، وئەو پارەی كە ژنانییەكان (مخنث) دەیدەنە منداڵانی كۆیلە یان ئازاد بەرامبەر شەڕواڵ پیسی لەگەڵیان هاوشێوەی پارەی ژنە داوێن پیسەكانە ، وپارەی فاڵچیەكان نموونەی پارەی ئەستێرەناسەكان وهاوكارەكانیانە ، كە لەسەر ئەو هەواڵە مژدە دەرانە بەخەڵكی ڕادەگەیەنن بە بۆچوونی خۆیان .

ئەگەر كاربەدەستان وازبهێنن لە نكولی كردن لە خراپە وسەپاندنی سزاكان لەبەر پارەیەك كە وەری دەگرن ، ئەوە وەك هاوشێوەی پێشەوای چەتە وایە كە لەگەڵ تاكەكانی دەستە وتاقمەكەی ماڵی دزی بەش دەكەن ، دیسان هاوشێوەی ئەو گەوادەیە (قوڕەمساخ ـ تەرەس) كە پارەیەك وەردەگرێت ودووكەس لەسەر داوێن پیسی كۆ دەكاتەوە ، وحاڵیشی هاوشێوەی حاڵی پیرەژنە خراپەكەی پێغەمبەر لوطە عليه السلام ، كە ڕێ نیشاندەری خراپەكاران بوو لەسەر میوانەكانی پێغەمبەر لوط عليه السلام ، خودا دەربارەی دەفەرموێت : ﴿فَأَنجَيْنَـٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَـٰبِرِينَ ۝٨٣﴾ (الأَعْرَاف) .

واتە : ئێمە لوط وكەس وكاریمان ڕزگاركرد ژنەكەی نەبێت كە لە تیاچووان بوو .

ودەفەرموێت :﴿فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِّنَ ٱلَّيْلِ وَلَا يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ إِلَّا ٱمْرَأَتَكَ ۖ إِنَّهُۥ مُصِيبُهَا مَآ أَصَابَهُمْ ۚ ۝٨١﴾(هُود) .

---

٨٤. رواه البخاري(٢٢٣٧) ، ومسلم(١٥٦٧).

واتە : لەگەڵ کەس وخزمەکانتدا شەوێکی درەنگ دەربچن ، وهیچ کەس لە ئێوە لانەکاتەوە ، ژنەکەت نەبێت ئەوەی تووشی ئەوان دەبێت تووشی ئەمیش دەبێت .

خودای گەورە سزای پیرەژنە گەوادەکەی دا بەو سزایەی کە سزای خەڵکە نێربازەکانی دا ، ئەمانە هەموو لەبەر ئەوەی کە پارە وەرگیراوە لەسەر هاوکاری ستەم وخراپەکاری ، کاربەدەست دانراوە بۆ ئەوەی فەرمان بە چاکە بکات ویاساغی خراپە بکات ، تەنها ئەوە مەبەستی فەرمانڕەوایەتییە ، ئەگەر کاربەدەست بە هۆی پارەوە ڕێگا بەکارێکی خراپ بدات ئەوە پێچەوانەی بوون وماهییەتی کاری کردووە ، نموونەی ئەو وەك کەسێکە دانراوە کە یارمەتیدەرت بێت لە دژی دوژمنان ، ئەو بە پێچەوانەوە یارمەتی دوژمنان بدات لە دژی تۆ ، ووەك ئەو کەسەیە کە پارەیەکی وەرگرتووە بۆ ئەوەی لەگەڵ موسڵمانان‌دا پێی بجەنگێت ،کەچی لە دژی موسڵمانان‌دا پێی دەجەنگێت.

بەوەش ڕوون دەبێتەوە کە چاك بوونی بەندەکان بەستراوە بە فەرمان بە چاکە کردن ویاساغی کردن لە خراپە ، چونکە باش بوونی ژیان وبەندەکانیش لە گوێڕایەڵی خودا وپێغەمبەرەکەی دایە ﷺ ، ئەوەش تەنها بە فەرمان بە چاکە کردن ویاساغی کردن لە خراپە بە دەست دێت ، بەوەش ئەم ئوممەتە باشترین ئوممەتی دونیایە ، خودا دەفەرموێت : ﴿كُنتُمۡ خَيۡرَ أُمَّةٍ أُخۡرِجَتۡ لِلنَّاسِ تَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَتَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ ١١٠﴾(آلِ عِمۡرَان).

واتە : ئەی ئوممەتی ئیسلام ئێوە باشترین ئوممەتن کە بۆ خەڵك هێنراونەتە بوون ، فەرمان بە هەموو چاکەیەك دەکەن ویاساغی وقەدەغەی هەموو خراپەیەك دەکەن .

ودەفەرموێت :﴿وَلۡتَكُن مِّنكُمۡ أُمَّةٞ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلۡخَيۡرِ وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۚ ١٠٤﴾(آلِ عِمۡرَان).

واته : با کۆمەڵێك لە ئێوە هەبن بانگەوازی خەڵك بکەن بۆ خێر وفەرمان بە چاکە بکەن ویاساغی وقەدەغەی خراپە بکەن .

ودەفەرمویێت : ﴿وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ﴿٧١﴾﴾(التَّوْبَة).

واتە : باوەڕدارانی پیاو وژن هەندێکیان پاڵپشتی هەندێکی تریان دەکەن ویەکتر سەردەخەن ، وفەرمان بە چاکە دەکەن و یاساغی لە خراپە دەکەن .

وخودای پەروەردگار لە بارەی نەوەکانی ئیسرائیلەوە دەفەرمویێت : ﴿كَانُواْ لَا يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُۚ لَبِئْسَ مَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ﴿٧٩﴾﴾(المَائِدَة).

واتە : خراپەیان ئەنجام دەدا وقەدەغە ویاساغییان لە یەك نەدەکرد ، بە ڕاستی ئەوەی ئەنجامیان دەدا خراپ وناپەسەند بوو .

ودەفەرمویێت : ﴿فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِۦٓ أَنجَيْنَا ٱلَّذِينَ يَنْهَوْنَ عَنِ ٱلسُّوٓءِ وَأَخَذْنَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ بِعَذَابِۭ بَـِٔيسِۭ بِمَا كَانُواْ يَفْسُقُونَ ﴿١٦٥﴾﴾(الأَعْرَاف).

واتە : کاتێك ئەوەی بیریان خرایەوە پشت گوێیان خست ، ئەو کەسانەمان ڕزگارکرد کە یاساغییان لە خراپەکاری دەکرد ، وسزای زۆر توندی ئەو کەسانەماندا کە ستەمیان کرد ، لەبەر ئەوەی لە ڕێگا دەرچوون .

خودای گەورە هەواڵیدا کاتێك کە سزای خودا دابەزی ، ئەو کەسانە ڕزگاریان بوو کە یاساغییان لە خراپەکرد ، وستەم کارانیش بە سزای زۆر توند لەناو چوون .

ولە فەرموودەیەکی صەحیحدا هاتووە ئەبوبەکری صدیق ﵁ لەسەر مینبەرەکەی پێغەمبەری خودا ﷺ وتاری دەخوێند فەرمووی : ((﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهْتَدَيْتُمْۚ ﴿١٠٥﴾﴾ (المَائِدَة) ، وَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ

ﷺ يَقُولُ : إِنَّ النَّاسَ إِذَا رَأَوْا المنكر فلم يغيروه أَوْشَكَ أَنْ يَعُمَّهُمْ اللَّهُ بِعِقَابٍ مِنْ عنده))[85].

واته : ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە گرنگی بە خودی خۆتان بدەن ، زیانتان پێ ناگەیەنێت هەرکەسێك گومڕا بێت ئەگەر ئێوە لەسەر هیدایەت وڕێگەی ڕاستبن ، ومن لە پێغەمبەری خودام ﷺ بیستووە دەیفەرموو : ئەگەر خەڵك کاری خراپە ببینن ونەیگۆڕن ، نزیکە خودا هەموویان سزا بدات .

ولە فەرموودەیەکی تردا هاتووە : (( إن المعصية إذا أخفيت لم تضر إلا صاحبها ، ولكن إذا ظهرت فلم تنكر أضرت العامة ))[86].

واته : کاری خراپە وتاوان ئەگەر بە پەنهان کرا تەنها زیانی بۆ خاوەنەکەی هەیە ، بەڵام ئەگەر بە ئاشکرا کرا ونکولی لێنەکرا ئەوا زیان بە هەمووان دەگەیەنێت .

ئەم جۆرە حوکمەی کە باسمانکرد ، لە سنورەکانی خودا ومافەکانی مەبەستی سەرەکی فەرمان بەچاکەکردن ویاساغی کردنی خراپەیە ، فەرمان بەچاکە کردن وەك : فەرمان کردن بە نوێژ ، وزەکات ، وحەج ، وخێر وچاکە ، ودەستپاکی ، وچاکە لەگەڵ دایك وباوك ، وبەجێهێنانی ئەرکی خزمایەتی ، وڕەوشت جوانی لەگەڵ خێزان ودراوسێ ...هتد.

پێویستە لەسەر کاربەدەستان فەرمان بە نوێژە فەرزەکان بکەن لەسەر ئەو کەسانەی کە پێویستە ، وئەو کەسەی نوێژ نەکات بە کۆڕای موسڵمانان سەرزەنشت دەکرێت ،

---

٨٥. رواه أبو داود(٤٣٣٨) ، والترمذي(٢١٦٨) ، وابن ماجه(٤٠٠٥) ، وصححه الألباني في (صحيح الجامع)(١٩٧٣).

٨٦. رواه الطبراني في المعجم الأوسط كما في مجمع الزوائد للهيثمي (٢٦٨/٧) ، وقال الألباني في (ضعيف الجامع)(٤٨٠) : موضوع .

ئەگەر ئەوانەی وازیان لە نوێژ هێناوە کۆمەڵێك بوون دەبێت لەگەڵیاندا جەنگ بەرپا بکرێت ، موسڵمانان لەسەر ئەوە کۆڕان ، وهەروەها لەسەر زەکات ورِۆژوو وهەندێك پێویستی تریش ، وکەسانێکیش کە حەرامێکی ئاشکرا حەڵاڵ بکەن کە ناکۆکی لەسەر نەبێت ، وەك مارەکردنی مەحرەمێك(المحارم) ، یان ئاژاوەنانەوە لەسەر زەوی ، وهاوشێوەی ئەو کارانە ، هەر کۆمەڵێك نکولی لە یەکێك لە فەرمانە ئاشکرا وباوەکانی شەریعەتی ئیسلامی بکات پێویستە لەگەڵیاندا جەنگ بەرپا بکرێت ، هەتاکو هەموو ملکەچی ئاینی خودابن ، بەکۆڕای زانایان .

وئەگەر ئەوەی واز لە نوێژ دەهێنێت تاکەکەسێك بێت ، ئەوا سزا دەدرێت بە لێدان وبەندکردن هەتا نوێژ دەکات ، زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن کە پێویستە بکوژرێت ئەگەر وازی لە نوێژ هێنا ، دوای ئەوەی داوای تەوبەکردنی لێدەکرێت ، ئەگەر تەوبەی کرد ونوێژی کرد باشە ، ئەگینا دەکوژرێت ، ئایا کاتێك دەکوژرێت موسڵمانە یان بێباوەڕە ؟ دوو بۆچوون هەیە : زۆربەی پێشینان (سلف) لەسەر ئەوەن کە بە بێباوەڕی دەکوژرێت ، ئەمە لەکاتێکدا کە ئەو کەسە دان بە پێویستی نوێژدا بنێت ، ئەگەر نکولی پێویستی نوێژی کرد ئەوە بێباوەڕە بەکۆڕای موسڵمانان ، وهەروەها هەر کەسێك نکولی هەریەکە لە پێویستیە ئاشکراکان یان حەرام کراوەکانی تر بکات پێویستە لەسەر ئەو کارە بکوژرێت ، چونکە سزادان لە سەر وازهێنان لە فەرمانە پێویستەکان وئەنجامدانی حەرام کراوەکان ، مەبەستی تێکۆشانە لە پێناوی خودا ، ئەوەش پێویستە لەسەر کۆمەڵی موسڵمانان بە کۆڕا ، وقورئان وسوننەت بەڵگەن لەسەر ئەو کارانە ، وئەوە لە باشترین کارەکانە ... (( قال رجل یارسول الله دلني علی عمل یعدل الجهاد في سبیل الله ، قال: لا تستطیعه ، أو لا تطیقه ، قال : أخبرني به ؟ قال :

هل تستطيع إذا خرج المجاهد أن تصوم ولا تفطر ، وتقوم ولا تفتر ؟ قال : ومن يستطيع ذلك ؟ قال : فذلك الذى يعدل الجهاد في سبيل الله ))[87].

واتە : پیاوێك وتی : ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ڕێنماییم بکە بۆ کارێك هاوتای تێکۆشان بێت لە پێناوی خودا ، فەرمووی : ناتوانیت ، یان لە توانای تۆدا نییە ، وتی : پێم بڵێ ؟ فەرمووی : ئایا دەتوانیت کە تێکۆشەر لە پێناوی خودا دەرچوو بۆ تێکۆشان بە ڕۆژوو بیت ونەیشکێنیت ، وهەستی شەونوێژ بکەیت وپشوو نەدەیت ، وتی : کێ ئەوە دەتوانێت ؟ فەرمووی : ئەوە هاوتای تێکۆشانە لە پێناوی خودا .

ودەفەرموێت : (( إن في الجنة لمائة درجة ، مابين الدرجة إلى الدرجة كما بين السماء والأرض ، أعدها الله للمجاهدين في سبيله ))[88].

واتە : لە بەهەشتدا سەد پلە هەیە ، نێوان پلەیەك بۆ پلەیەکی تر نێوانی ئاسمان وزەویە ، خودا ئامادەی کردووە بۆ ئەو کەسانەی لە پێناوی خودا تێدەکۆشن .

ئەو دوو فەرموودەیە لە هەردوو صەحیحەکەدا هاتوون ، پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : ((رأس الامر الإسلام ، وعموده الصلاة ، وذروة سنامه الجهاد في سبيل الله))[89].

واتە : دوو گەواهیدانەکە سەرەکیترین کاری ئیسلامە ، ونوێژ کۆڵەکەیەتی ، وتێکۆشان لە پێناوی خودا لوتکەیە .

---

٨٧. رواه البخاري(٢٧٨٥) ، ومسلم(١٨٧٨).

٨٨. رواه البخاري(٢٧٩٠) ، ومسلم(١٨٨٤).

٨٩. رواه الترمذي (٢٦١٦) ، وابن ماجه (٣٩٧٣) ، وصححه الألباني في (صحيح الجامع) (٥١٣٦).

خودای گەورە دەفەرموێت : ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُواْ وَجَٰهَدُواْ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿١٥﴾﴾ (الحُجُرَات) .

واتە : ئەو باوەڕدارانەی کە بڕوایان بە خودا و پێغەمبەرەکەی هێناوە دواتر توشی گومان نەبوون ، وتێکۆشاون بەماڵ وڕوحیان لە پێناوی خودا ، بەڕاستی ئەوانە ڕاستگۆن .

ودەفەرموێت :﴿أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ ٱلْحَآجِّ وَعِمَارَةَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ كَمَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَجَٰهَدَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ لَا يَسْتَوُۥنَ عِندَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٩﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ أَعْظَمُ دَرَجَةً عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿٢٠﴾ يُبَشِّرُهُمْ رَبُّهُم بِرَحْمَةٍ مِّنْهُ وَرِضْوَٰنٍ وَجَنَّٰتٍ لَّهُمْ فِيهَا نَعِيمٌ مُّقِيمٌ ﴿٢١﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿٢٢﴾﴾(التَّوْبَة) .

واتە : ئایا ئێوە ئاودان بە حاجیان وئاوەدانکردنەوەی ماڵی خودا ، دەچوێنن بەکەسێك کە باوەڕی بە خودا وڕۆژی دوایی هێناوە وتێدەکۆشێت لە پێناوی ڕێگای خودا ، لای خودا چوونیەك ویەکسان نین ، خودا ڕێنمایی کۆمەڵی ستەمکار ناکات ، ئەو کەسانەی بڕوایان هێناوە وتێدەکۆشن لە پێناوی ڕێگای خودا بە ماڵ وگیانیان ، پلەیان زۆر باڵایە لەلای خودا ، وئەوانە براوەن ، پەروەردگاریان مژدەی لێخۆش بوون وڕازیبوون وبەهەشتی ناز ونیعمەتی نەبڕاوەیان دەداتێ ، بەهەتاهەتایی تێیدا دەمێننەوە ، بە ڕاستی خودا پاداشتی گەورەی لایە.

## بەشی سزای ڕێگر وچەتە

سزای ڕێگر وچەتانە بە چەك ڕێگا لە خەڵك دەگرن ، بۆ ئەوەی ماڵ وسامانی خەڵك بە ئاشكرا ببەن ، لە عەرەب وتورك وكورد ، وجوتیاران وسەربازە خراپەكارەكان ویاخی بووانی شارەكان یان هەركەسێكی تر ، خودا بەو جۆرە كەسانە دەفەرموێت : ﴿إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ ذَٰلِكَ لَهُمۡ خِزۡيٞ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ٣٣﴾ (المَائِدَة) .

واتە : بێگومان پاداشتی ئەو كەسانەی دژایەتی خودا وپێغەمبەرەكەی دەكەن وهەوڵی نانەوەی بشێوی وتێكدان دەدەن لەسەر زەوی ئەوەیە : بكوژرێن ، یان لە خاچ بدرێن ، یان دەست وپێیان بە چەپ وڕاست ببڕدرێت ، یان لەو سەر زەمینە دوور بخرێنەوە ، ئەو كەسانە لە دونیا سەرشۆڕ وڕیسوان ، ولە دوارۆژیش دا سزایەكی زۆر گەورەیان بۆ هەیە.

ئیمامی شافعی ﵀ لە موسنەدەكەیدا لە ئیبن عەباسەوە ﵄ ڕیوایەتی كردووە "دەربارەی ڕێگر" دەڵێت : ( ئەگەر خەڵكیان كوشت وماڵیشیان برد ، كە گیران دەكوژرێن ولەخاچ دەدرێن ، وئەگەر خەڵكیان كوشت وماڵیان نەبرد دەكوژرێن ولەخاچ نادرێن ، وئەگەر ماڵیان برد وخەڵیان نەكوشت ئەوە دەستێك وپێیەكیان چەپ وڕاست دەبڕدرێت ، وئەگەر ترسیان لەسەر ڕێگا دروست كرد نەفی دەكرێن ودوور دەخرێنەوە).

ئەوە وتەی زۆربەی زانایانی وەك شافعی وئەحمەدە ، ئەو بۆچوونەش نزیكە لە وتەی ئەبوحەنیفەوە ، وهەیانە دەڵێن : بەدەستی كاربەدەستە ، لە هەركوێیەكدا بەرژەوەندی هەبوو دەیكوژێت ، ئەگەر كەسیشی نەكوشتبێت ، بۆ نموونە : ئەگەر سەركردەی

چەتەکان بوو وگوێڕایەڵیان دەکرد ؛ ودەست وپێی کەسانێك دەبڕێت کە بەرژەوەندی گشتی تێدابێت ، بۆ نموونە : ئەگەر کەسێکی بەهێز ولێهاتوو ولێزان بوو لە بردنی ماڵی خەڵك ، وهەندێك زانای تر دەڵێن : ئەگەر ڕێگرێك ماڵی خەڵکی ببات دەکوژرێت ودەست وپێی دەبڕدرێت ولە خاچیش دەدرێت ، وبۆچوونی یەکەمیان وتەی زۆربەی زانایانە ، وهەریەك لەو چەتە وڕێگرانە کەسێکیان کوشتبێت ، ئەوا کاربەدەستان دەیکوژن لە بری ئەو کەسەی کوشتوویەتی ، وبە هیچ شێوەیەك نابێت لێی خۆشبن بەکۆڕای زانایان ، ئیبن المنذر ئەو باسەی گێڕاوەتەوە ، فەرمانی ئەو کەسە چەتە بکوژە نادرێتە دەست کەس وکاری کوژراوەکە ، بە پێچەوانەی ئەوەی کەسێك کەسێکی تر بکوژێت بە هۆی دوژمنایەتی نێوانیان یان لەبەر کێشەیەك یان لەبەر هەر هۆکارێکی تایبەت ، ئەو بکوژە خوێنەکەی بەدەست کەس وکاری کوژراوەکەیە ، ویستیان دەیکوژن ، وئەگەر ویستیان لێی خۆش دەبن ، ویان ویستیان پارەی خوێنێکی لێوەردەگرن ، لەبەر ئەوە بۆ مەبەستێکی تایبەت کوشتوویەتی ، بەڵام چەتە وڕێگرەکان دەکوژرێن لەبەر بەتاڵان بردنی سامانی خەڵك ، لەبەر ئەوە زیان بە ئاسایشی گشتی دەگەیەنن وهاوشێوەی دزن ، لەبەر ئەوەی سنوری خودایان بەزاندووە دەکوژرێن وهیچ جۆرە لێخۆش بوون ولێبوردنێك نایانگرێتەوە ، ئەگەر بکوژەکەیش هاوتای کوژاوەکە نەبێت ، بۆ نموونە : ئەگەر بکوژەکە ئازاد بێت وکوژراوەکە کۆیلە بێت ، یان بکوژەکە موسڵمان بێت وکوژراوەکە لەو کەسانە بێت کە سەر و ماڵیان دەپارێزرێت (ذمي) .

زانایان ناکۆکن ئایا کەسێك ئاژاوەبنێتەوە دەکوژرێت ؟ ئەو وتەیە ڕاسترە کە دەڵێت : دەکوژرێت چونکە کوشتنەکەی دەبێتە حەددێك لە پێش تێکدانی ئاسایشی گشتی ، وەك چۆن ئەگەر ماڵی خەڵکی برد دەستی دەبڕدرێت ، ئەگەر مافی خەڵکی پێشێل کرد بەند دەکرێت .

ئەگەر چەتە ودزەکان کۆمەڵێك بوون ، تەنها کەسێکیان خەڵکی کوشتبێت ئەوانی تر یارمەتیدەر وپاسەوانی بوون ، وتراوە : تەنها بکوژەکە دەکوژرێت ، بەڵام زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن هەموویان دەکوژرێن ئەگەر سەد کەسیشبن ، یارمەتیدەر وئەنجامدەری تاوانەکە وەك یەك وان ، ئەوەش لە خەلیفە ڕاشدیەکانەوە گێڕدراوەتەوە ، هەروەك عومەری کوڕی خەتاب ﵁ ، ئەو کەسەی ڕێنمونی وچاوساغی بۆ چەتە ودز بکردایە دەیکوشت ، چونکە ئەو کەسەی تاوان ئەنجام دەدات بە هۆی چاوساغ وپاسەوان ویارمەتی دەرانییەوە ئەو کارە ئەنجام دەدات ، وکۆمەڵێك ئەگەر پێکەوە هاریکاری یەك بکەن تا هێز پەیدا دەکەن وڕێگا لە خەڵك دەگرن ، ئەو کاتە لە پاداشت وسزادا هاوەڵن وەکو تێکۆشەرانی ڕێگای خودا ، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی : (( المسلمون تتكافأ دماؤهم ، ويسعى بذمتهم أدناهم ، وهم يد على من سواهم ، يرد متسريهم على قعدهم))[٩٠].

واته : خوێنی هەموو موسڵمانان وەك یەکە ، ئەگەر موسڵمانێك داڵدەی کەسێك بدات پێویستە ڕێزی لێ بگیرێت ئەگەر کۆیلەش بێت کە ئەو پەنایە دەدات ، ودەبێت هەموویان یەك دەستبن لە دژی دوژمنان ، ئەگەر تیپێك لە سوپا جیابوونەوە ودەستکەوتێکیان هەبێت پێویستە بەسەر هەموو سوپادا دابەش بکرێت .

ئەگەر تیپێك لە سوپا هەڵە بوون وسامانێکیان دەستکەوت ، هەموو سوپاکە لەو دەستکەوتە بەشدارن ، چونکە بە پشتیوانی وهێزی سوپاکە ئەو کارەیان کردووە ، بەڵام هەندێك جار لەبەر دەست خۆشی کردن وستایش کردنیان زیاتریان دەدرێتێ ، چونکە پێغەمبەری خودا ﷺ هەرتیپێك (سرية) دەستکەوتێکی هەبووایە لە سەرەتای جەنگ دوای جیاکردنەوەی پێنج یەکی بۆ خەزێنەی دەوڵەت وچواریەکی دەستکەوتەکانی

٩٠. رواه أبوداود (٢٧٥١) ، وابن ماجه(٢٦٨٥) ، وحسنه الألباني في (صحيح الجامع) (٦٧١٢).

دەدایە جەنگاوەرەکان ، بەڵام ئەگەر لە کاتی گەڕاوەنەوەدا تیپێك لە سوپا جیابوویەوە ئەو کاتە سێ یەکی دەدانێ ، هەروەها ئەگەر سوپاکە بەبێ ئەوان شتێك بە دەستکەوت بگرێت ئەو تیپەش تیایدا بەشدارن ، چونکە ئەوان لەبەر بەرژەوەندی سوپا جیابوونەتەوە ، وەك چۆن پێغەمبەری خودا ﷺ بەشی طلحە وزوبێری دا رضي الله عنهما لە دەستکەوتی رۆژی بەدر ، چونکە ئەوانی لەبەر بەرژەوەندی سوپا بۆکارێك ناردبوو ، ئەو کەسانەش کە چەتەیی دەکەن بەشدارن لەوەی دەستیان دەکەوێت ولەو سزایەش کە بەسەریاندا دەسەپێت هاوبەشن .

هەروەها ئەو کەسانەی کە لەسەر شتی بێ مانا وبەتاڵ دەجەنگن هیچ پاساوێکیان نییە ، وەك ئەو کەسانەی کە لەسەر دەمارگیری خێڵەکی یان جەنگان لەسەر هەندێك شت کە لە پێش ئیسلام دەکرا هەموو ئەوانە ستەمکارن ، وەك پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی : (( إذا التقى المسلمان بسيفيهما فالقاتل والمقتول في النار ، قيل : يا رسول الله ! هذا القاتل ، فما بال المقتول ؟ قال : إنه أراد قتل صاحبه))[٩١].

واتە : ئەگەر دوو موسڵمان بە شمشێر بجەنگن ، بکوژ وکوژراوەکەش لە ئاگردان ، وترا : ئەی پێغەمبەری خودا ! ئەوە حاڵی بکوژەکەیە ، ئەی کوژراوەکە بۆ ؟! ، فەرمووی : چونکە ئەویش دەیویست هاوەڵەکەی بکوژێت .

ئەو فەرموودەیە لە هەر دوو صەحیحەکەدا هاتووە ، هەر کۆمەڵێك هەرشتێکی کۆمەڵەکەی تر لەناو ببات لە نەفس وماڵ پێویستە قەرەبووی بکاتەوە ، ئەگەرچی خودی بکوژ وتاوانبارەکەش نەناسرێت ، چونکە کۆمەڵێکی یاخی بوو وتاوانبار هەموویان یەك چارەنوسیان هەیە هەموویان وەکو یەك کەس وان ، لەبەر ئەوەشە خودای پەروەردگار دەفەرموێت : ﴿كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِصَاصُ فِي ٱلۡقَتۡلَىۖ ١٧٨﴾(البَقَرَةِ).

واتە : تۆڵەکردنەوەی دادگەرانە لە بکوژان پێویست کراوە لەسەرتان.

٩١. رواه البخاري (٣١) ، ومسلم (٢٨٨٨).

بەڵام ئەگەر کۆمەڵی چەتە ودز تەنها ماڵی خەڵکیان برد وکەسیان نەکوشت "وەك هەندێك لە گوندنشینەکان زۆرجار بەو شێوەیە دەکەن" ئەو کاتە هەریەکێك لەوان دەستی ڕاستی وپێی چەپی دەبڕدرێت ، بە بۆچوونی زۆربەی زانایان : وەك ئەبوحەنیفە وئەحمەد وئەوانی تریش ، ئەوەش مانای ئەو فەرموودەی خودایە کە دەفەرموێت : ﴿أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلَٰفٍ ﴿٣٣﴾﴾ (المَائِدَة) .

واتە : یان دەست وپێیان بە چەپ وڕاست ببڕدرێت .

ئەو دەستە دەبڕدرێت کە ستەمی پێکردووە ولە خەڵکی داوە ، وئەو پێیەش دەبڕدرێت کە لەسەری ڕۆیشتووە بۆ ئەنجامدانی ئەو تاوانە ، وشوێنی دەست وپێ بڕاوەکەی بە ڕۆنی گەرم داخ دەکرێت ، بۆ ئەوەی خوێنی بوەستێتەوە ونەبێتە هۆی لەناوچوونی ، ودەستی دزیش هەروەهای پێدەکرێت .

ئەم کردەوەیە لەوانەیە لە مردن بەئێش وئازارتر بێت ، چونکە ئەگەر گوندنشینە یاخی بووەکان وسەربازە لادەر ولە ڕێگا دەرچووەکان ، یان کەسانی تر ئەگەر ویستی تاوانکردنیان هەبێت ، ئەو کەسە دەست وپێ بڕاوەیان بینی لە نێوانیاندا ، بیر دەکەنەوە ودەترسن ، بە پێچەوانەی کوشتن کە دوای ماوەیەك لە بیر دەچێتەوە ، وهەندێك کەسی نەفس بەرز کوشتنی پێباشترە لە بڕینی دەست وپێی بە چەپ وڕاست ، ئەمەش باشترین وانەیە بۆ ئەو جۆرە کەسانە وهاوشێوەکانیان ، بەڵام ئەگەر چەکیان هەڵگرت وکەسیان نەکوشت ، وماڵی کەسیشیان نەبرد ، دواتر چەکیان فڕێدا وڕایانکرد ، ئەو کاتە نەفی دەکرێن و دوور دەخرێنەوە ، وتراوە : نەفی کردنیان مانای ئەوەیە ڕێگا نەدرێت لەو شار وناوچەیە نیشتەجێبن ، یان وتراوە : بەند دەکرێن ، یان : کاربەدەستان هەرچی بۆ بەرژەوەندی گشتی بە باش بزانن بەو شێوە ڕەفتاریان لەگەڵ دەکەن .

وكوشتنی ڕێگا پێدراویش بۆ ئەو کەسانەی کە شایستەی کوشتنن ئەوەیە بە شمشێر لە گەردنیان بدرێت ، چونکە ئەوە باشترین جۆری کوشتنە بۆ کوژراوەکە ، وخودا ڕێگای بەکوشتنی مرۆڤ داوە ئەگەر بەو شێوەیە دەستگیر کرا ، وهەروەها کوشتنی ئەو گیانلەبەرانەی کە کوشتنیان حەلاڵە ، پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : (( إن الله كتب الإِحسان على كل شيء ، فإذا قتلتم فأحسنوا القتلة ، وإذا ذبحتم فأحسنوا الذبحة ، وليحد أحد كم شفرته وليرح ذبيحته ))[٩٢].

واتە : خودا چاکەکردنی پێویست کردووە لەسەرتان بۆ هەموو شتێك ، ئەگەر کەسێکتان لەبەر تاوانێك کوشت بە باشترین شێوە بیکوژن بۆ ئەوەی کوژراوەکە کەمترین ئازار بچێژێت ، وئەگەر گیانلەبەرێکتان سەربڕی بە باشترین شێوە سەری ببڕن ، با کەسێك کە گیانداران سەر دەبڕێت چەقۆکەی تیژ بکات وسەربڕاوەکە بەخێرایی ئاسوودە بکات.

ودەفەرموێت : ((إِنَّ أَعَفَّ الناسِ قِتْلَةً أهلِ الإيمانِ))[٩٣].

واتە : بە بەزەیی ترین خەڵك لە کوشتندا باوەڕدارانن .

جا ئەو لە خاچ دانەش کە باسمان کرد ئەوەیە هەڵبواسرێن لە شوێنێکی بەرز بۆ ئەوەی خەڵکی بیان بینێت ، وتاوانەکەیان بۆ خەڵك ئاشکرا بێت ، لای زۆربەی زانایان دوای کوشتنیان ئەو کارەیان پێدەکرێت ، وهەندێکیان دەڵێن : دابنرێن هەتا دەمرن تا ببێتە پەند بۆ هەرکەسێك کە بیر لە ئەنجامدانی خراپەکاری دەکاتەوە ، بەڵام سزادان بە لووت وگوێ بڕین دروست نییە مەگەر بە شێوەی تۆڵەسەندن بێت ، عیمرانی کوڕی

---

٩٢. رواه مسلم(١٩٥٥).

٩٣.رواه أبو داود (٢٦٦٦) ، وابن ماجه(٢٦٨١) ، وضعفه الألباني في (ضعيف الجامع)(٩٦٣).

حصين رضي الله عنهما دەڵێت : (( ما خطبنا رسول الله ﷺ خطبة إلا أمرنا بالصدقة ، ونهانا عن المثلة ))[٩٤].

واتە : هەرکاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ وتاری بۆ بخوێندینایە فەرمانی بەخێر وچاکە پێدەکردین ، ویاساغی شێواندن ولووت وگوێ بڕینی لێدەکردین .

هەتا بێباوەڕیش دوای کوشتنی لە جەنگدا لووت وگوێی نابڕدرێت وناشێوێندرێت ، مەگەر ئەوان وایان بە کوژراوی موسڵمانان کردبێت لە تۆڵەدا هەرچیان کردبێت وایان لێدەکرێت ، وتۆڵە نەکردنەوە لەم بارەداشدا باشترە ، وەك چۆن خودای پەوەردگار دەفەرموێت : ﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُواْ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِۦ وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّٰبِرِينَ ۝١٢٦ وَٱصْبِرْ وَمَا صَبْرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِ ۝١٢٧﴾(النَّحلِ) .

واتە : ئەگەر سزاتاندا بەو شێوەیە سزا بدەن کە سزادراون ، وئەگەر ئارام بگرن ئەوە باشترە بۆ ئارامگران ، ئەی پێغەمبەر ﷺ ئارام بگرە لەبەر خودا .

وتراوە : ئەو ئایەتانە کاتێك دابەزی کە بێبڕواکانی قورەیش حەمزە وهەندێکی تر لە شەهیدەکانی جەنگی ئوحودیان شێواندبوو وسکیان هەڵدڕیبوون ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (( لئن أظفرني الله بهم لأمثلن بضعفي ما مثلوا بنا ))[٩٥].

واتە : ئەگەر خودا سەری خستم بەسەریاندا بەو شێوەیە کوژراوەکانیان دەشوێنم وەك چۆن کوژراوەکانی ئێمەیان شێواند .

خودای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند ، ئەگەرچی پێشتر لە مەککە دابەزیبوو ، وەکو

---

٩٤. رواه أبوداود(٢٦٢٧) ، وصححه الألباني في (صحيح أبي داود )(٢٣٢٢).

٩٥. رواه الحاكم في المستدرك (٢١٨/٣) ، والطبراني في المعجم الكبير(١٤٣/٣) ، وضعفه الألباني في (الضعيفة)(٥٥٠).

ئەم ئایەتانە : ﴿وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا ٨٥﴾(الإِسْرَاء) .

واتە : پرسیاری ڕوحیان لێکردیت بڵێ : ڕوح لە ژێر فەرمانی خودادایە .

وئەو ئایەتەی :﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفٗا مِّنَ ٱلَّيۡلِۚ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ١١٤﴾(هُود) .

واتە : لە ڕۆژدا نوێژ بکەن "کە نوێژی بەیانی ونیوەڕۆ وعەسرە" وهەروەها لەشەودا "نوێژی شێوان وخەوتنانە" چونکە ئەم چاکە کاریانە دەبێتە مایەی لێخۆش بوونی کارەخراپەکانتان .

ئایەتی تریش کە لە مەککە دابەزیوە ، دواتر لە مەدینە هۆیەك پێویستی کردووە جارێکی تر دابەزیوەتەوە ، دوای دابەزینی ئایەتەکەی سەرەوە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی : (( بل نصبر ))[٩٦].

واتە : بەڵکو ئارام دەگرین .

ولە صەحیحی موسلمدا بوریدەی کوڕی الحصیب رضي الله عنه دەڵێت : (( كان النبي ﷺ إذا بعث أميرا على سرية أو جيش أو في حاجه نفسه أوصاه في خاصة نفسه بتقوى الله تعالى وبمن معه من المسلمين خيراً ، ثم يقول : اغزوا بسم الله ، في سبيل الله ، قاتلوا من كفر بالله ، ولا تغلوا ولا تغدروا ، ولا تمثلوا ، ولا تقتلوا وليدا ))[٩٧].

---

٩٦.رواه أحمد(٢٠٧٢٣) ، وحسنه الألباني في (الصحيحة)(٢٣٧٧).

٩٧. رواه مسلم(١٧٣١).

واته : پێغەمبەر ﷺ کاتێك کەسێکی بکردایەتە بەرپرس بەسەر تیپێك یان سوپایەکەوە ئامۆژگاری دەکرد بەوەی لە خودا بترسێت وبەچاکە لەگەڵ ئەو موسڵمانەی لەگەڵیدان ڕەفتار بکات ، دواتر دەیفەرموو : بجەنگن بەناوی خوداوە ، ولە ڕێگای خودا ، وبجەنگن لەگەڵ کەسێك کە بێباوەڕە بەخودا ، ڕۆمەچن وناپاکی مەکەن (غدر) ، وکوژراوەکان مەشێوێنن ، ومنداڵ مەکوژن .

ئەگەر هاتنە سەرماڵ وچەکیان هەڵکێشا "لە بیابان نەبوو" بۆ بردنی ماڵ ، وتراوە : ئەوانە بە چەتە ناژمێردرێن ، بەڵکو وەکو دز وتالانکەر لە قەڵەم دەدرێن ، چونکە ئەگەر خاوەن ماڵ هاوار بکات خەڵکی بە هانایەوە دەچن ، وزۆربەی زانایان دەڵێن : حوکمیان لە نێو ماڵ ولە بیابانیشدا وەك یەکە ، ئەو وتەیە باوە لای مالك ، وشافعی ، وزۆربەی هاوەڵانی ئەحمەد ، وهەندێك لە هاوەڵانی ئەبوحەنیفەش ، بەڵکو لە نێو ماڵدا زیاتر شایستەی سزادانن وەك لە بیابان ، چونکە ماڵ شوێنی ئاسایش وپشوودانی خەڵکە ، وماڵ جێگەی هاوکاری ویارمەتیدانی یەکترە ، بەڵکو هەڵکوتانە سەر ماڵ وپێشێل کردنی حورمەتی تاوانێکی گەورەیە وپێویستە بەتوندی سزابدرێن ولێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکرێت ، لەبەر ئەوەی هەرچی لە ماڵدا هەیە بەتالانی دەبەن ، وڕێبوار زۆر جار بڕێکی کەم لە سەرمایەکەی لەگەڵیدایە ، ئەوەش ناوکرۆکی ڕاستییە،بەتایبەت ئەو کۆمەڵانەی کە لە میسر وشام (منسر)یان پێدەڵێن ،ولە بەغداد (العیارین)یان پێدەڵێن .

ئەگەر چەتە ودزەکان ڕێگا بگرن بە بەرد تێگرتن لە دوورەوە ، وبە یارمەتی ئامێرێك بەرد بگرنە خەڵك ، هەمان ئەو حوکمانە دەیان گرێتەوە ، هەندێك لە شەرعناسەکان دەڵێن : بەڕێگرتن نایەتە ئەژمار ئەگەر بە چەك وئامێری تیژ نەبێت ، وهەندێکیان کۆڕای زانایان (الإجماع) دەگێڕنەوە لەسەر ئەوەی دەبێت ڕێگرتن بەچەك وتفاقی جەنگی بێت ، بەڵام ئەگەر زانایان ناکۆکبن یان نا ئەوەی کە پەسەندە وزۆرینەی

موسڵمانان لەسەرین ئەوەیە : ئەوەی شەڕ بکات بۆ بردنی ماڵی خەڵك بەهەر شێوەیەك ئەوە چەتە ودزە ، وەك چۆن هەر بێباوەڕێك لەگەڵ موسڵماناندا بجەنگێت بەهەر شێوەیەکی جەنگان ، ئەوە جەنگییە ودوژمنە ، وهەر موسڵمانێك لەگەڵ بێبڕواکاندا بجەنگێت بە شمشێر یان بەڕم یان بە تیروکەوان یان بە بەرد یان بە دار یان هەرشتێکی تر ئەوە تێکۆشەری ڕێگای خودایە ، بەڵام ئەگەر خەڵك بە پەنهان بکوژێت بۆ بردنی ماڵ وسامانی ، بۆ نموونە کەسێك لەسەرە ڕێیەکدا (دیوەخان)ی هەبێت بە ڕێبوارانی بدات بەکریێ ، ئەگەر بەتەنها بوو بیکوژێت وماڵەکەی ببات ، یان بانگی کەسێك بکات بۆ ماڵەوە بۆ ئەوەی ئیشێکی بەکریێ بۆ ئەنجام بدەن وەك بەرگدوور یان پزیشك ، یان هەرشتێکی هاوشێوەی ئەوانە بیکوژێت وماڵەکەی ببات ، ئەمە پێی دەوترێت کوشتنی ناپاکی (غەدر وخیانەت) خەڵکی ئاسایی پێی دەڵێن : (المعرجین) ، ئەگەر ئەو کوشتنە تەنها بۆ بردنی ماڵ بێت ، ئەوا حوکمی چەتە وڕێگریان هەیە یان تۆڵەیان (قصاص) لێدەکرێتەوە ؟ لەوەشدا زانایان دوو بۆچوونیان هەیە :

یەکەمیان : ئەوانە وەکو چەتە وڕێگرن ، چونکە ئەوە کوشتنە بە ناپاکی وفێڵ ، وەکو کوشتنە بە زۆر لە بیاباندا ، هەردوو جۆرە کوشتنەکە مرۆڤ ناتوانێت خۆی لێ دەرباز بکات ، بەڵکو زیانی یەکەمیان زیاترە چونکە پێی نازانرێت .

دووەمیان : چەتە وڕێگر ئەوانەن بە ئاشکرا دەجەنگن ، بەڵام ئەو کەسەی کە شاراوەی ئەو کارە دەکەن پێویستە بدرێتە دەست خاوەن خوێنەکە ، ئەمەیان لە بنەماکانی شەریعەتەوە نزیکترە ، ئەوانە زیانیان زیاترە چونکە هەستی پێناکرێت .

شەرعناسەکان دیسان ناکۆکن دەربارەی ئەو کەسانەی کە کاربەدەست (سوڵتان ) بکوژێت ، وەك بکوژانی عثمان وعلی رضي الله عنهما ، ئایا حوکمیان وەکو بشێوی کاران وچەتە وڕێگرانە ، بەحەد دەکوژرێن ، یان کاریان دەدرێتە دەستی خاوەن خوێنەکە ؟ دوو بۆچوون هەیە لە مەزهەبی ئەحمەد وئەوانی تر ، چونکە کوشتنی سوڵتان دەبێتە هۆی تێکچوونی باری گشتی ، وەك کوشتنی کەسێکی ئاسایی نییە .

# بەشی ئەو چەتە وڕێگرانەی خۆ بە دەستەوە نادەن

دوای دەست ڕۆیشتن بەسەریاندا ، سوڵتان داوای کرد بۆ ئەوەی حەددیان بەسەردا بسەپێنێت بەبێ ستەم ، بەرگریان لێکرد ئەو کاتە پێویستە لەسەر موسڵمانان بجەنگن لەگەڵیان بە بۆچوونی هەموو زانایان ، هەتا هەموویان دەستگیر دەکرێن ، وهەرکاتێك ملکەچ نەبوون بەجەنگ نەبێت ، پێویستە هاوکاری کاربەدەستان بکرێت بۆ لەنێو بردنیان ، وبەهەر شێوەیەك بێت دەبێت لەنێووببرێن وکۆمەڵگەیان لێ ڕزگار بکرێت ، وهەر کەسێك یارمەتیان بدات ودالْدەیان بدات ولەگەڵیاندا بێت ئەوانەش لەنێو دەبرێن ، ئەوەش دەبێتە ئەنجامدانی سنوری خودا ، جەنگان لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانە پێویست ترە وەك لە کەسانێك کە لە هەندێك لە فەرمانەکانی شەریعەت وازدەهێنن ، چونکە ئەوانە کۆبوونەتەوە بۆ کوشتنی خەڵك وبردنی ماڵ وسامانیان بەتاڵان ، وتێکدانی کشتوکاڵ ودەغلْودانیان ولەناوبردنی وەچەکانیان ، مەبەستیان پیادەکردنی ئاین یان دەسەڵات نییە ، ئەو چەتە وڕێگرانە وەك کەسانێك وان کە پەنادەبەنە بەر قەڵایەك یان ئەشکەوتێك یان لوتکەی شاخێك یان دۆڵێك یان هەرشتێکی تر ، ڕێگا دەگرن لە هەرکەسێك بەلایاندا تێپەڕێت ، ئەگەر سەربازانی دەوڵەت داوایان لێبکات بێنەوە ژێر ڕکێفی دەوڵەت وهەریەکەیان تاوانبار بێت حەددی بەسەردا بسەپێنرێت ، دەجەنگن وەك ئەو گوند نشینانەی کە ڕێگا لە حاجیان وڕێگای کاروانەکان دەگرن ، یان ئەو کێوییانەی کە لەسەر شاخەکان وئەشکەوتەکان جێگیربوون ، بۆ ڕێگا گرتن ، یان ئەو کۆمەڵانەی هاوپەیمانن ویەکیان گرتووە لەسەر بنچینەی ڕێگاگرتن لە نێوان عێراق وشام بەوەش دەڵێن : (النهیضة) ئەو جۆرەکەسانە دەکوژرێن وەك باسمانکرد ، بەڵام کوشتنیان هاوشێوەی کوشتنی بێبڕواکان نییە ، ئەگەر موسڵمان بوون ، ماڵەکانیان نابرێت مەگەر

ماڵی خەڵکیان بەناڕەوا بردبێت ، ئەو کاتە پێویستە لەسەریان ئەوەندە قەرەبوو بکەنەوە کە بەتاڵان بردوویانە ، ئەگەر خودی تاڵانکەرەکەش نەناسرێت ، وئەگەر تاڵانکەرەکەش ناسرا هیچ جیاوازی نییە ، چونکە ئەنجامدەر ویارمەتی دەرەکانیش وەك یەکن وەك باسمانکرد ، بەڵام ئەگەر ناسرایەوە پێویستە قەرەبووی هەموو ماڵەکە بگرێتە ئەستۆ ئەگەر هیچ لەو ماڵەش نەمابێت ، وئەوەی لێیان دەسەنرێتەوە دەدرێتە کەس وکاری خاوەن ماڵەکان ، بەڵام ئەگەر نەناسران بۆ بەرژەوەندی گشتی موسڵمانان خەرج دەکرێت ، وەك ناندانی ئەو کەسانەی جەنگاون بۆ ئەوەی ئەو مافانە بەدەست بهێننەوە ، مەبەست لە جەنگان لەگەڵیان ئەوەیە ملکەچ بکرێن بۆ ئەوەی حەددیان بەسەردا بسەپێنرێت وڕێگری بشێوی وخراپەکارییان لێبکرێت ، ئەگەر یەکێك لەوان بریندار بوو برینێکی قوڵ ، بەو حاڵەوە وازی لێدەهێنرێت هەتا دەمرێت ، مەگەر کەسێك بێت شایانی کوشتن بێت دەکوژرێت ، وئەگەر هەڵهاتن ولە خراپەیان ڕزگاریان بوو دوای ناکەون ، مەگەر کەسێکیان حەددێکی دیاری کراو پێویست بێت لەسەری ، وهەریەکەیان بەدیل بگیرێت ئەو حەددەی تاوانەکەی لەسەری پێویستی کردووە بەسەریدا دەسەپێت ، وهەندێك لە زانایان زبرییان بەرامبەر ئەو جۆرە کەسانە نواندووە دەڵێن : ماڵەکەشیان بەتاڵان دەبرێت وپێنج یەکیشی بۆ خەزێنەی دەوڵەت لێ جیا دەکرێتەوە ، بەڵام زۆربەیان ڕێگا بەو کارە نادەن .

بەڵام ئەگەر خۆیان دایە پاڵ میرنشینێك یان کۆمەڵێك کە لە شەریعەتی ئیسلام دەرچووبن ، وهاوکارییان کردن لە دژی موسڵمانان ، ئەوە وەکو ئەوان جەنگ بەرپادەکرێت لەگەڵیاندا ، وهەرکەسێك لەوان ڕێگا لە خەڵك نەگرێت بەڵام باج وسەرانە لە ڕێبواران وەربگرێت بەپێی سەری مرۆڤەکان وسەری وڵاخ وباری شتومەك یان شتی تر ، ئەوە لەو کەسانەیە کە بەزۆر پارە لە خەڵك وەردەگرن وسزای تایبەتی

خۆی هەیە ، وشەرعناسەکان ناکۆکن لە دروستی کوشتنی ئەو جۆرەکەسانە وپێیان ناگوترێت ڕێگر ، چونکە بە هۆی ئەوانەوە ڕێگا نابڕدرێت ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو جۆرەکەسانە توندترین سزادەدرێن لە ڕۆژی دوایی ، هەتا پێغەمبەری خودا ﷺ دەربارەی (الغامدية) فەرمووی : ((لقد تابت توبة لو تابها صاحب مكس ، لغفر له))[٩٨] .

واتە : تەوبەیەکی کردووە ئەگەر ئەو کەسەی باج وسەرانە بەزۆر لە خەڵك وەردەگرێت تەوبەی وابکات ، خودا لێی خۆشدەبێت .

ودروستە بۆ ئەو کەسانەی کە ستەمیان لێکراوە لەگەڵ چەتە و ڕێگردا بجەنگن بەڕای هەموو موسڵمانان ، بەڵام دەوڵەت لەو حاڵەتەدا یارمەتی مادییان نادات ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : (( من قتل دون ماله فهو شهيد ، ومن قتل دون دمه فهو شهيد ، ومن قتل دون دينه فهو شهيد ، ومن قتل دون حرمته فهو شهيد ))[٩٩] .

واتە : هەرکەسێك لەسەر ماڵی بکوژرێت شەهیدە ، وهەرکەسێك لەسەر خوێنی بکوژرێت شەهیدە ، وهەرکەسێك لەسەر ئاینی بکوژرێت شەهیدە ، وهەرکەسێك لەسەر ناموس وحورمەتی بکوژرێت شەهیدە .

ئەو کەسانە شەرعناسان پێیان دەڵێن (الصائل) ، واتە : ( ئەو کەسەی ستەم دەکات بەبێ ئەوەی گومان یان دەسەڵاتی هەبێت) ، ئەوە جگە لە ستەمکار لە ژێر هیچ ناوێکی تردا جێگەی نابێتەوە ، ئەگەر لەو دەست درێژییەی مەبەستی ماڵ بوو دەتوانرێت بەگوێرەی توانا برێك پارەی بدرێتێ بۆ خۆپاراستن لە شەڕیان ، بەڵام ئەگەر بەوە قایل نەبوون ئەوکات شەڕی لەگەڵدا دەکرێت ، بەڵام ئەگەر مەبەستی لە چوونە سەر

٩٨. رواه مسلم(١٦٩٥).

٩٩. رواه أبوداود(٤٧٧٢) ، والترمذي(١٤٢١) ، والنسائي(٤٠٩٤) ، وصححه الألباني في (صحيح الجامع)(٦٤٤٥).

ماڵەکە شەرواڵپیسی بوو ، وەك ئەوەی داوای کاری خراپ لـە ئافرەت یان منداڵ یان کۆیلەی ئەو ماڵە بکات ، ئەوکاتە پێویستە بە هەموو شێوەیەك بەرگری لـە خۆی بکات ، وبەهیچ شێوەیەك ڕێگای پێنادرێت ئەو کارە قیزەونانە ئەنجام بدات ، بە پێچەوانەی ماڵ وپارە چونکە دەتوانرێت بۆ خۆپاراستن لـەشەڕیان بڕێك پارە بدرێت .

وئەگەر مەبەستی کوشتنی خاوەن ماڵ بوو ، دروستە بۆی بەرگری لـە خۆی بکات ، وئایا پێویستە لـەسەری ؟ زانایانی مەزهەبی ئەحمەد وئەوانی تر دوو ڕایان هەیە ، ئەمە لـەکاتێکدا کە خەڵك دەوڵەتیان هەبوو ، بەڵام ئەگەر "پەنا بە خوا" بشێوی بوو ، وەك ئەوەی دوو کاربەدەستی موسڵمانان ناکۆك بوون ، ولـەسەر پلەوپایە شەڕیان بوو ، ئایا دروستە بۆ مرۆڤ ئەگەر ڕۆیشت بۆ مەملەکەتەکەی تر ،تووشی شەڕێك بوو بەرگری لـە خۆی بکات لـەو بشێویە ؟ لـەوەشدا دوو بۆچوون هەیە لـە مەزهەبی ئەحمەد وئەوانی تر.

ئەگەر دەست بەسەر چەتە وڕێگردا گیرا "ماڵ وسامانی خەڵکیان بردبوو" پێویستە ئەو ماڵانە بدرێتەوە خاوەنەکانیان ، وسزای حەددیان بەسەردا بسەپێنرێت ، وهەروەها دزیش هەمان حوکمی هەیە ، ئەگەر نکولی هێنانەوەی ماڵە دزراوەکە یان بەتاڵان براوەکەیان کرد دوای جێگیر بوونی لـە سەریان ، سزا دەدرێن بە بەندکردن ولـێدان ، هەتا ماڵەکە دەهێننەوە یان کەسێك ڕادەسپێرن بیهێنێتەوە ، یان شوێنی حەشاردانی ئاشکرا دەکات ، وەك چۆن کەسێك سەرزەنشت وسزا دەدرێت ئەگەر (واجب)ێك پێویست بێت لـەسەری وبەئەنجامی نەگەیەنێت ، چونکە خودا لـە قورئاندا بۆ پیاوی حەڵاڵ کردووە کە خێزانەکەی سەرپێچی داوا ڕەواکانی کرد لـێی بدات ، لـێدانێکی وا کە دیاری نەکات وئێش وئازاری زۆری پێنەگەیەنێت ، تا ئەو مافانە بەجێ دەهێنێت ، کەوابوو کەسانی چەتە ودز شایەنترن کە لـێیان بدرێت تاکو ئەو مافانە دەگەڕێننەوە ، وداواکردنی سزادان بۆ خاوەن ماڵە ئەگەر ویستی پێیان ببەخشێت یان بیەوێت لـەسەر

شێوازێك ڕێك بكەوێت لەگەڵیاندا ، یان لە سزادانیان خۆشبێت ئەوانەی بۆ هەیە ، بەپێچەوانەی (حد) كە بەهیچ شێوەیەك ناتوانرێت لێی خۆش بێت ، وكاربەدەستان بۆیان نییە خاوەن ماڵەكان ناچار بكەن كە لە بەشێك لە ماڵەكەیان خۆشبن .

وئەگەر ماڵەكەیان لە ناوبردبوو بە خواردنی یان بەهەر شێوەیەكی تر "چەتە وڕێگرەكان یان دزەكان" وتراوە : پێویستە كەس وخزمیان دابینی بكەن ، وەك چۆن كەسێك شتێك داگیر بكات پێویستە كەسوكاری قەرەبووی بكەنەوە ، ئەوە بۆچوونی شافعی وئەحمەدە رضي الله عنهما ، وئەگەر كەسێك توانای قەرەبووكردنەوەی نەبوو پێویستە ئەو كاتەی حاڵی باش دەبێت بیداتەوە ، ووتراوە : نابێت پێبژاردن ودەست بڕین لەسەر یەك كەس ئەنجام بدرێت ئەوەش وتەی ئەبو حەنیفەیە رحمه الله ، وتراوە : پێویستە قەرەبوو بكاتەوە ئەگەر هەیبوو ، بەلام ئەگەر نەیبوو لەسەری پێویست نییە ، ئەوەش بۆچوونی مالكە رحمه الله.

وحەلاڵ و ڕەوا نییە بۆ كاربەدەستان پارە لە خاوەن مافەكان وەرگرن لە بری ئەوەی مافەكانیان بۆ وەربگرنەوە ، یان سزای حەد بەسەر تاوانباراندا بسەپێنن ، نەبۆ خۆیان ونەبۆ ئەو سەربازانەی بە دوای چەتە وڕێگر ودزەكاندا دەنێنرێن ، بەڵكو بەدوادا گەڕان وقەلاچۆكردنی ئەو جۆرە كەسانە جۆرێكە لە تێكۆشان لە پێناوی خودا .

جا ئەو سەربازانە لەم بارەدا بە پارەی دەوڵەت ئامادە دەكرێن وەك هەموو جەنگێكی تر ، ئەوەندەیان پێدەدرێت كە بەشی بەڕێوەبردن وپێداویستی بەدوادا چوونی تاوانباران بكات ، چونكە وەك وتمان : ئەوە جۆرێكە لە جەنگان لە پێناوی خودا ، وخەرج كردنی ماڵی زەكات لە پێناوی دژایەتی كردنی چەتە وڕێگرەكان دروستە ، وئەگەر چەتە وڕێگرەكان كۆمەڵێكی بەهێز وبەدەسەلات بوون ئەوكات پێویستە دڵنەوایی بكرێن ، ئەگەر كاربەدەست هەندێك ماڵی زەكات وخێری دایە چاوساغ ودەم ڕستەكانیان بۆ بە دەستەوە دانی ئەوانی تر یان لاواز بوونیان یان بۆ خۆپاراستن لە

شەڕی ئەو سەرکردانە دروستە ، ئەوکاتە ئەو جۆرەکەسانە دەبنە دڵ ڕاگیراوەکان (المؤلفة قلوبهم) ، ئەمەش زۆرێك لە ئیمامەکانی وەك ئەحمەد وئەوانی تر باسیان کردووە وئەوەش بە قورئان وسوننەت وبنەماکانی شەریعەت سەلماوە .

دروست نییە کاربەدەست کەسانێك بنێرێت بۆ دژایەتی کردنی چەتە وڕێگرەکان کە لاواز وبێ توانابن ، وهەروەها دروست نییە کەسانێك بنێرێت ماڵ لەو جۆرەکەسانە وەربگرێت کە ڕێیان لە خەڵك گرتووە ، بەڵکو پێویستە کەسانی بەتوانا وبەهێز ودەستپاك بۆ ئەو مەبەستە هەڵبژێردرێت،مەگەر لەکاتێکدا بێت کە کەسانی بەو شێوەیە دەست نەکەون ئەوکات پێویستە باشترین بەردەست ئەو کارەیان پێ بسپێردرێت .

ئەگەر هەندێك لە جێگرەکانی سوڵتان لەسەر شار وگوندەکان یان سەرۆك گوندەکان فەرمانیان کرد بەچەتە وڕێگرەکان بە تالانکردنی ماڵ وسامانی خەڵك بە ئاشکرا یان بە پەنهان ، بۆ ئەوەی بەشیان بدەن لەو دەستکەوتانەیان ئەمانیش بەرگرییان لێبکەن ، ئەو کەسانە لەسەرۆکی چەتە وڕێگرەکان تاوانبارترن ، چونکە ئەگەر ئەمان ئاسانکارییان بۆ نەکەن ناتوانن ئەو تاوانانە ئەنجام بدەن ، وئەو جۆرەکەسانە دەبێت وەك پشت وپەنا ویارمەتیدەری تاوانباران لە قەڵەم بدرێن ، ئەگەر چەتە وڕێگرەکان خەڵکیان کوشت ، ئەوا دەکوژرێن ویارمەتی دەرەکانیشیان لەگەڵیاندا دەکوژرێن ، لەسەر وتەی ئەمیری باوەڕداران عومەری کوڕی خەتاب ﷺ وزۆربەی زانایان ، بەڵام ئەگەر تەنها ماڵی خەڵکی ببەن دەست وپێیان دەبڕدرێت خۆیان ویارمەتیدەرەکانیان ، وئەگەر ماڵیان برد وخاوەن ماڵەکانیشیان کوشت ، دەکوژرێن ولە خاچ دەدرێن ، وهەندێك دەڵێن : پێویستە دەست وپێیان ببڕدرێت وپاشان بکوژرێن ولەخاچ بدرێن ، ووتراوە : یەکێك لەو سزایانەی بەسەردا دەسەپێت ئەگەر چەتە

وڕێگرەکانی دەستگیرکرد وپاشان ئەو ماڵ ودەستکەوتانەیان لەگەڵدا بەش بکات ، یان سنور وسزاکانی خودا پەك بخات وبەسەریاندا نەسەپێنێت .

وهەرکەسێك پەنای چەتە وڕێگرێك یان دزێك یان بکوژێك یان هاوشێوەی ئەم تاوانبارانە بدات ، یان هەرکەسێك پێویست بێت سزا وحەددێکی خودای بەسەردا بسەپێت یان مافی مرۆڤێکی بەسەرەوە بێت ، وڕێگری کرد تۆڵەی ئەو تاوانانەی لێبکرێتەوە ، ئەوە دەبێتە هاوەڵ وهاوکاری لەو تاوانانە ، وخودا وپێغەمبەر ﷺ نەفرەتیان لێکردووە ، ئیمامی مسلم لە صەحیحەکەیدا لە عەلی کوڕی ئەبو تالبەوە رضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی : (( لعن الله من أحدث حدثاً أو آوى محدثاً ))[١٠٠].

واتە : نەفرەتی خودا لەو کەسانەی بشێوی دەنێنەوە ، وئەو کەسانەش داڵدەی ئەو جۆرە کەسانە دەدەن .

وئەگەر ئەو کەسە دەستگیرکرا کە داڵدەی تاوانبارێکی داوە ، داوای لێدەکرێت بیدات بە دەستەوە ، یان هەواڵ دەربارەی ئەو شوێن وجێگە بدات کە تاوانبارەکە خۆی تیادا حەشارداوە ، ئەگەر سەرپێچی کرد ، سزا دەدرێت بە بەندکردن ولێدانیش ئەگەر پێویست بوو ، چەند جارێك هەولی لەگەڵدا دەدرێت تاکو شوێن وجێگەی ئەو خراپەکارە ئاشکرا دەکات ، هەرکەسێك پێویست بێت لەسەری تاوانبارەکان بدات بەدەستەوە وئەوەشی بەتاڵان بردوویانە بیگەڕێننەوە ، سەرپێچی بکەن سزا دەدرێن ، چونکە ئاگادارکردن وهەواڵدان بە دەوڵەت لەو بارەدا هاوکاریکردنە لەسەر خێر وچاکە ، بەڵام ئەگەر کەسێك بەبێ تاوان بەدوایدا گەڕان یان ئەو پارە ومالەی داوای

---

١٠٠. رواه البخاري(٣١٨٠) ، ومسلم(١٣٧٠).

لێدەکرێت ڕەوا نەبێت ئەوکاتە پێویستە هاوکاری بکرێت لە داڵدە دانیان وبەرگری لێکردنیان ، چونکە ئەوکارە پاڵپشتی کردنی ستەم لێکراوانە کە پێویستییەکی شەرعییە ، لە هەردوو صەحیحەکەدا لە ئەنەسی کوڕی مالکەوە ﷺ دەگێڕنەوە دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی : (( انصر أخاك ظالماً أو مظلوماً ، قلت : يا رسول الله أنصره مظلوما ، فكيف أنصره ظالماً ؟ قال : تمنعه من الظلم فذلك نصرك إياه ))[101].

واتە : پاڵپشت وهاوکاری براکەت بکە ستەمکار بێت یان ستەم لێکراو ، وتم : ئەی پێغەمبەری خودا : هاوکاری دەبم کاتێك ستەمی لێدەکرێت ، ئەی چۆن یارمەتیدەر وهاوکاریبم کاتێك ستەم دەکات ؟ فەرمووی : ڕێگری ستەم کردنی لێدەکەیت ، ئەوە هاوکاری وپاڵپشتی تۆیە بۆ ئەو .

ومسلم لە جابرەوە ﷺ فەرموودەیەکی وەکو ئەوەی گێڕاوەتەوە ، ولە هەردوو صەحیحەکەدا لە بەرائی کوڕی عازبەوە ﷺ دەڵێت : (( أمرنا رسول الله ﷺ بسبع ، ونهانا عن سبع : أمرنا بعيادة المريض ، واتباع الجنازة ، وتشميت العاطس ، وإبرار المقسم ، وإجابة الدعوة ورد السلام ، ونصر المظلوم ، ونهانا عن خواتيم الذهب ، وعن الشرب بالفضة ، وعن المياثر ، وعن لبس الحرير والقسي والديباج والإستبرق ))[102].

واتە : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی بە حەوت شت پێکردووین ویاساغی حەوت شتیشی لێکردووین ، فەرمانی پێکردووین بە : سەردانی نەخۆش ، وشوێن کەوتنی تەرمی مردوو ، وهەرکەسێك پژمی دوعای خێری بۆ بکەین ، وئەگەر سوێند خورا لەسەر هەرشتێك نابێت سەرپێچی بکەین ، ودەعوەت کراین بەدەم دەعوەتەکەوە بچین

---

١٠١. رواه البخاري(٦٩٥٢) ، ومسلم(٢٥٨٤).

١٠٢. رواه البخاري(١٢٣٩) ، ومسلم(٢٠٦٦).

، ووەڵامی سەلام بدەینەوە ، وهاوكار وپاڵپشتی ستەم لێكراوبین ، ویاساغی لێكردووین ئەنگوستیلەی زێڕ لەدەست بكەین ، ولە قاپی زیودا بخۆینەوە ، وكورتانی سواریەكانمان لە ئاوریشم بێت ، وجلوبەرگی ئاوریشم لەبەر بكەین یان هەر جلێك ئاوریشمی تێكەڵ بێت ، وئاوریشمی ئەستوور وجلی دروەوشاوە وچێنراو بە تاڵی زێڕ لەبەر بكەین.

ئەگەر كەسێك شارەزابێت بە شوێنی تاوانباران وئاگاداری دەوڵەت نەكاتەوە لە شوێن ومۆڵگەیان ، دروستە ئەو كەسە سزا بدرێت بە بەندكردن یان هەرسزایەكی تری شیاو ، چونكە ئەوە شتێكە كە پێویستە لەسەری ونكوڵی لێدەكات ، وكەس لە جیاتی كەسێكی تر سزا نادرێت مەگەر بزانرێت ئاگاداری ئەو كارەیە .

جا هەركەسێك ڕێگربێت لە گەیاندنی زانیارییەك كە پەیوەندی بە بەرژەوەندی گشتییەوە هەبێت دادوەران وكاربەدەستان دەتوانن لەسەر ئەو كارەی لێپرسینەوەی لەگەڵدا بكەن ، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت داوای ڕاپەڕاندنی كارێك بكرێت لە كەسێك كە لەسەر كەسێكی ترە بە ئەنجامی بگەیەنێت وڕاپیەڕێنێت ، هەتاكو ئەو فەرموودەی خودای باڵادەست بیگرێتەوە : ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۗ ﴿١٥﴾﴾(الإِسْرَاء) .

واتە : كەس تاوانی كەسی تر هەڵناگرێت وناخرێتە ئەستۆی .

یان ئەو فەرموودەی پێغەمبەری خودا ﷺ كە فەرموویەتی : (( ألا لا يجني جان إلا على نفسه ))[١٠٣].

واتە : ئەو كەسەی تاوانێك ئەنجام دەدات تەنها خۆی لێی بەرپرسە .

---

١٠٣. رواه الترمذي(٢١٥٩) ، وابن ماجه(٣٠٥٥) ، وحسنه الألباني في (صحيح الجامع) (٧٨٨٠).

بەڵكو ئەم ئایەت وفەرموودەیە بۆ ئەو كەسەیە كە داوای پارەیەك یان هەرشتێكی لێبكرێت كە كەسێكی تر لێی بەرپرسە ، بەبێ ئەوەی ئەم بریكاری بێت یان لە ئەستۆی گرتبێت یان پارەی ئەو كەسەی بەلاوە بێت ، یان كەسێك سزا بدرێت بە هۆی سەرپێچی كردنی خزمێكی یان دراوسێیەكی ، بەبێ ئەوەی ئەم ئاگای لە هیچ بێت ، نەبە ئەنجام نەدانی كارێك كە لە سەری پێویست بێت ئەنجامی بدات ، ونەبە ئەنجامدانی كارێك كە لە سەری پێویست بێت ئەنجامی نەدات ، ئەمە ئەو كارەیە كە ئایەت وفەرموودەكە دەیگرێتەوە ، بەڵام ئەو كەسەی سەرەوە سزا دەدرێت لەبەر تاوانێك كە خۆی ئەنجامی داوە ، ئەویش ئەوەیە شوێن وجێگەی تاوانبارانی زانیوە ودەسەڵاتی لێ ئاگادار نەكردووەتەوە ، واتە : بە هەواڵ نەدانی هاوكاری كەسانێكی كردووە كە پێویستە ڕاپێچی دادگا بكرێن وئەو مافانەی كە پێشێلیان كردووە تۆڵەیان لێبكرێتەوە ، بەوەش هاوكاری وپاڵپشتی ڕاستی نەكردووە كە بە قورئان وسوننەت وكۆڕای موسڵمانانیش پێویستە لەسەری ئەو كارە بكات ، لەبەر خۆشویستنی یان لەبەر خزمایەتی كەسە تاوانبارەكە ، وەك چۆن كەسانێك لەبەر دەمارگیری خێڵایەتی ئەو كارە دەكەن یان لەبەر ڕق وكینەیەك بەرامبەر كەسە ستەم لێكراوەكە لە دڵیاندایە ئەو كارە دەكەن ، وخودا دەفەرموێت : ﴿وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعۡدِلُواْۚ ٱعۡدِلُواْ هُوَ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰۖ ٨﴾(المَائِدَة).

واتە : ڕق وكینەتان لە كەسانێك پاڵنەرتان نەبێت دادگەر نەبن ، دادگەربن ئەوە نزیكترە لە پارێزكاری ولە خودا ترسانەوە .

بەڵام ئەگەر پشت هەڵكردن بێت "لە مافەكانی خودا ، ودادپەروەری كە خودا پێویستی كردووە" وترسان وسەرشۆڕی وئاین فرۆشتن بێت ، وەك كەسانێك كە وازیان

هێناوه لـه سەرخستنی خودا وپێغەمبەرەکەی ﷺ وئاین وقورئان ، ئەوانەی کە پێیان بوترێت تێبکۆشن لـه پێناوی خودا سستی دەکەن وخۆیان دەدزنەوە .

بەهەر حاڵ ئەو جۆرە کەسانە شایەنی سزادانن بە وتەی هەموو زانایان ، ئەوەش ئەم ڕێگا نەگرێتە پێش ، سنورەکان پشت گوێ دەخات ومافەکان ون وپێشێل دەکات ، وبەهێز ودەست ڕۆیشتووەکان لاواز وبێ دەسەڵاتەکان دەخۆن وهەموو مافەکانیان زەوت دەکەن .

ئەوە هاوشێوەی کەسێکە کە ماڵی ستەمکارێکی لابێت خۆی لێ گێل بکات وخۆی لـەوە بدزێتەوە کە بیداتە کاربەدەستێکی دادپەروەر ، بۆ ئەوەیش بیداتەوە دەستی خاوەنەکانی ، یان هەرچی خەرجی پێویست (واجب) لـەسەریەتی لێی دەربکات ، وەك خەرجی ماڵ ومنداڵ وکۆیلـە ومەڕومالاتی ، وزۆر جار کەسێك شتێکی لـەسەر پێویست دەبێت بە هۆی کەسانی ترەوە ، بۆ نموونە ئەگەر کەسوکاری نەداربوون خەرجیان لـەسەری پێویست دەبێت ، وهەروەها لـەسەر کەسوکاری کەسێك کەسێکی تر بکوژێت پێویستە خوێنەکەی بۆ قەرەبوو بکەنەوە ، ئەم جۆرە سەرزەنشت کردنە سزایە بۆ ئەو کەسانەی زانیاریان هەیە دەربارەی ماڵێك یان کەسێك کە لـە لایەن دەسەڵاتەوە لـەبەر پێشێل کردنی مافی خەڵك داواکراوبن ، ئەویش ئامادە نەبێت ئەو زانیاریە بداتە بەرپرسان وەك زانیاری دەربارەی چەتە وڕێگر ودز ، بەڵام ئەگەر ئامادە نەبوو زانیاری پێشکەش بکات لـەبەر ئەوەی بترسێت لـەوەی کاربەدەستان ستەم لـە کەسە داواکراوەکە بکەن وەك ئەوەی بیکوژن لـە بری تاوانێك کە شایەنی مەرگ نەبێت ئەوە کارێکی باشی کردووە ، وزۆر جار لای کاربەدەستان گومان وئارەزوو تێکەڵ دەبن ، بۆیە پێویستە ڕەوا وناڕەوا لـەیەك جیابکرێنەوە .

ئەو حاڵەتەش زۆر جار لای سەرۆك هۆزەكان ڕوودەدات لەشار ولادێكان ، ئەگەر پەنابەرێك پەنای پێبردن ، ولە نێویاندا خزمایەتی ودۆستایەتیەك هەبوو ، ئەو كاتە دەمارگیری خێڵەكی وایان لێدەكات كە بەرگری لە خراپەكاران بكەن ، وناوبانگ وخانەدانی لای ئەو سەرۆك هۆزە نەفامانە ئەوەیە كە پشتگیری لەو كەسە بكەن ئەگەرچی ستەمكاریش بێت " ولەسەر باتڵیش بێت" بەتایبەت ئەگەر ستەمكارەكە سەرۆك هۆزێكی هاوتای خۆیان بێت ، ئەوكاتە وادەبینن كە بە دەستەوەدانی پەنابەرە تاوانبارەكە سەرشۆڕی وبێ توانایی وبێڕێزییە بۆیان ، ئەمە نەفامییەكی تەواوە ، ویەكێكە لە هۆكارە گرنگەكانی گەندەڵ بوون وێكچوونی ئاین ودونیای خەڵك ، ولە مێژوە باسكراوە زۆربەی جەنگەكانی گوند نشینەكان وەك جەنگی (البسوس) كە لە نێوان (بنوبكر) و(تغلب) دا ڕوویداوە لەبەر ئەو هۆیەی سەرەوە بووە ، وهەروەها توركە مەغۆلەكان بەو هۆیەوە ولاتی موسڵمانانیان داگیر كردووە ودەستیان بەسەر ئەو دیوی ڕووبار (ماوراء النهر) وخراساندا گرتبوو .

جا هەركەسێك نەفسی خۆی لەبەر خودا بشكێنێتەوە خودا بەرێزی دەكات ، وهەریەكە لە پێناوی گەیشتن بەڕاستی ودابین كردنی مافەكان خۆی ماندوو بكات ئەوە گەورەترین ڕێزی لەخۆی ناوە ، وئەوانە دەبنە نزیكترین كەسان لە خوداوە ، ئەوەشی شانازی بەستەمكاریەوە بكات وڕێگری دەستەبەركردنی مافەكان بێت ، وخراپە ئەنجام بدات ، ئەوە خۆی ڕیسوا وسەرشۆڕ كردووە ، خودا دەفەرموێت :﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡعِزَّةَ فَلِلَّهِ ٱلۡعِزَّةُ جَمِيعًاۚ ١٠﴾(فَاطِر) .

واتە : ئەوەی سەربەرزی دەوێت لە دونیا ولە قیامەتدا ئەوا سەربەرزی لە گوێڕایەڵی فەرمانەكانی خودا دایە .

وبە دووڕووەکان دەفەرمویّت : ﴿يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَآ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ ٱلْأَعَزُّ مِنْهَا ٱلْأَذَلَّ ۚ وَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٨﴾﴾ (المُنَافِقُون) .

واتە : دەڵێن : ئەگەر گەڕاینەوە بۆ شاری مەدینە ئەوکات بەهێز وبەڕێزەکان ڕیسوا وبێهێزەکان لەشار دەردەکەن ، وڕێز وبەهێزی بۆ خودا وپێغەمبەرەکەیەی ﷺ باوەڕدارنە ، بەڵام دووڕووەکان ئەوە نازانن .

وخودا لە سیفەتی ئەو جۆرە مرۆڤانە دەفەرمویّت : ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُعْجِبُكَ قَوْلُهُۥ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَيُشْهِدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا فِى قَلْبِهِۦ وَهُوَ أَلَدُّ ٱلْخِصَامِ ﴿٢٠٤﴾ وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِى ٱلْأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ ٱلْحَرْثَ وَٱلنَّسْلَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْفَسَادَ ﴿٢٠٥﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُ ٱتَّقِ ٱللَّهَ أَخَذَتْهُ ٱلْعِزَّةُ بِٱلْإِثْمِ ۚ فَحَسْبُهُۥ جَهَنَّمُ ۚ وَلَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿٢٠٦﴾﴾(البَقَرَة) .

واتە : خەڵکی واهەیە لە ژیانی دونیادا کە قسە دەکات بە گوتاری سەرسامت دەکات ، وادەزانی قسەی باش دەکات ، وخودا دەکات بە شاهید لەسەر ئەوەی لە دڵیدایە ، ودەڵێت : ئەوەی لەسەر زارمە هاوتای ئەوەیە کە لە دڵمدایە ودرۆ دەکات ، وزۆر کەللەڕەق وحەز بەدەمەدەمە ، وئەگەر پشت هەڵبکات هەوڵی بشێوی وخراپە دەدات لەسەر زەوی وهەوڵی لە ناوبردنی بەروبووم وکشتوکاڵ ونەوەکان وگیانلەبەرانیش دەدات ، وخودا خراپەکار وبشێوکارانی خۆشناویّت ، وئەگەر پێی بگوترێت پارێزکاربە ولە خودا بترسە ، لووت بەرزی دەکات وخۆی بەزل دەزانێت ولەسەر تاوانکاری وگومڕایی بەردەوام دەبێت ، ئەو جۆرە کەسە دۆزەخیان بەسە کە خراپترین لانکە وجێگەیە .

كەوابوو پێویستە لەسەر هەركەسێك كە پەنای هەڵهاتوویەك دەدات "ئەگەر ستەم لێكراو بوو" پەنای بدات وهاوكاری بكات ، وبەتەنها بانگەشەكردنی ستەم ئەوەی بۆ ناسەلمێت ، لەوانەیە هەندێك جار سكالاّ بكات لە هەمان كاتدا ستەمكاریش بێت ، بەڵكو دەبێت لە بەرامبەرەكەی وكەسانی ترەوە كێشەكەی بڕیاری لەسەر بدرێت ، ئەگەر دەركەوت كە ستەمكارە هەوڵدەدرێت بەنەرم ونیانی لەو ستەمەی بگەڕێنرێتەوە ئەگەر كرا ، ئەگەرنا هەوڵدەدرێت حوكمێكی دادوەرانە بكرێت ، ئەگەر ڕازی نەبوو ئەوكاتە هێز بەكار دەهێنرێت بۆ ملكەچ كردنی بۆ دادپەروەری ، بەلاّم ئەگەر كەسێك ستەمی لێكرابێت ولەهەمانكاتدا ئەمیش ستەمی كردبێت ، یان هەموویان ستەم كاربوون ، یان هیچ یەكێك لەوان ستەمی نەكردبێت بەلاّم بەگومان هەڵەیەك كەوتبێتە نێوانیانەوە ، ئەوكات هەوڵی ئاشتەوایی دەدرێت یان ئەگەر دەركەوت مافی یەكێكیانە بڕیار لە بەرژەوەندی ئەو كەسە دەدرێت ، وەك خودا دەفەرموێت : ﴿وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱقۡتَتَلُواْ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَاۖ فَإِنۢ بَغَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا عَلَى ٱلۡأُخۡرَىٰ فَقَٰتِلُواْ ٱلَّتِي تَبۡغِي حَتَّىٰ تَفِيٓءَ إِلَىٰٓ أَمۡرِ ٱللَّهِۚ فَإِن فَآءَتۡ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَا بِٱلۡعَدۡلِ وَأَقۡسِطُوٓاْۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ ۝٩ إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ إِخۡوَةٞ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَ أَخَوَيۡكُمۡۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ۝١٠﴾(الحُجُرَاتِ) .

واتە : ئەگەر دوو كۆمەڵ لە موسڵمانان ناكۆكی كەوتە نێوانیان ، هەوڵی چاكسازی وئاشتەوایی بدەن لە نێوانیان ، ئەگەر كۆمەڵێكیان ڕازی نەبوو بە فەرمانی خودا ئەوە لەگەڵیدا بجەنگن تا ڕازی دەبێت بە فەرمانی خودا ، ئەگەر ڕازی بوو ئەوكاتە ناوبژی بكەن لە نێوانیان بە دادوەرانە ، دادپەروەربن بێگومان خودا دادپەروەرانی خۆش دەوێت ، موسڵمانان برای یەكن ئەو برایەتیەتان بپارێزن ولە خودا بترسن بۆ ئەوەی خودا ڕەحمتان پێبكات .

وده‌فه‌رموێت : ﴿لَّا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَاهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَاحٍ بَيْنَ النَّاسِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١١٤﴾﴾(النِّسَاء).

واته : چاكه له زۆربه‌ی وتووێژ وچپه‌چپی خه‌ڵكدا نییه ، جگه له‌وه‌ی كه فه‌رمان ده‌كات به به‌خشینێك ، یان كرده‌وه‌یه‌كی چاك یان هه‌وڵی ئاشته‌وایی ده‌دات له نێوان خه‌ڵكدا ، هه‌ركه‌سێك به‌و كرده‌وه‌یه هه‌ستێت به‌مه‌ستی به ده‌ستهێنانی ڕه‌زامه‌ندی خودا له ئاینده‌دا پاداشتی زۆر گه‌وره‌ی پێده‌به‌خشین .

وئه‌بو داود له سوننه‌كه‌یدا گێڕاویه‌تیه‌وه : پیاوێك پرسیاری كرد له پێغه‌مبه‌ری خودا ﷺ : (( أمن العصبية أن ينصر الرجل قومه في الحق ؟ قال : لا ، قال : ولكن من العصبية أن ينصر الرجل قومه في الباطل ))[١٠٤].

واته : ئایا له ده‌مارگیرییه كه‌سێك پاڵپشتی خزمه‌كانی بێت له‌سه‌ر كارێكی ڕه‌وا ؟ فه‌رمووی : نه‌خێر ، به‌ڵام له ده‌مارگیرییه كه‌سێك پاڵپشت وهاوكاری خزمه‌كانی بێت له‌سه‌ر كارێكی ناڕه‌وا .

وقال : (( خيركم الدافع عن قومه ما لم يأثم ))[١٠٥].

واته : باشترین كه‌سانی ئێوه ئه‌وانه‌ن به‌رگری له‌خزم وكه‌سوكاریان ده‌كه‌ن ئه‌گه‌ر له‌سه‌ر تاوان نه‌بێت .

وقال : (( مثل الذي ينصر قومه بالباطل كبعير تردى في بئر فهو يجر بذنبه ))[١٠٦].

---

١٠٤. رواه أبوداود (٥١١٩) ، وابن ماجه(٣٩٤٩) ، وضعفه الألباني في (ضعيف ابن ماجه) (١٣٠٢/٢).

١٠٥. رواه أبوداود (٥١٢٠) ، وقال الألباني في (ضعيف الجامع)(٢٩١٥) : موضوع.

١٠٦. رواه أبوداود (٥١١٧) ، وصححه الألباني في (صحيح الجامع)(٥٨٣٨).

واته : نموونەی ئەو کەسەی پاڵپشتی خزم وکەس وکارەکەیەتی وهەوڵی سەرخستنیان دەدات لەسەر کارێکی نارەوا ، وەك ئەوە وایە حوشترێك کەوتبێتە ناو بیرێکەوە وبیەوێت بەهۆی راکێشانی کلکیەوە بیهێنێتە دەرەوە ! .

وقال : (( من سمعتموه يتعزى بعزاء الجاهلية فأعضوه بهن أبيه ، ولا تكنوا ))[١٠٧].

واته : گوێتان لە کەسێك بوو بانگهێشتی دەمارگیری دەکرد پێی بلێن : گاز(قەپ) لە ئالەتی(ذكر) باوکت بگرە ، بەبێ کینایەت .

هەر کەسێك لە بانگەوازی ئیسلام وقورئان دەربچێت ، بەشانازی کردن بە بنەماڵە یان وڵات یان رەگەز یان مەزهەب یان تەریقەت ئەوە لە دەمارگیری ونەفامییە ، وکاتێك دوو پیاو کۆچەرییەك وپشتیوانێك بوو بە ناکۆکیان ، کۆچەرییەکە وتی : کۆچەرییەکان فریام کەون ، وپشتیوانەکەش وتی : پشتیوانەکان فریام کەون ، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی : (( أبدعوى الجاهلية وأنا بين أظهركم ))[١٠٨].

واته : بانگەواز بۆ نەفامییەت دەکەن ومنیش لەنێوانتاندام ؛ وبەوەش زۆر تورەبوو .

---

١٠٧. رواه أحمد(٢٠٧٢٧) ، وصححه الألباني في (صحيح الجامع)(٦١٩).

١٠٨. رواه البخاري(٣٥١٨) ، و مسلم(٢٥٨٤).

## سزای دزی كردن

دز پێویستە دەستی ڕاستی ببڕدرێت بە پێی قورئان وسوننەت وكۆڕای زانایان (الإجماع) ، خودا دەفەرموێت : ﴿وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقۡطَعُوٓاْ أَيۡدِيَهُمَا جَزَآءَۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلٗا مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ٣٨ فَمَن تَابَ مِنۢ بَعۡدِ ظُلۡمِهِۦ وَأَصۡلَحَ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَتُوبُ عَلَيۡهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ٣٩﴾ (المَائِدَةِ) .

واتە : پیاو یان ژن ئەگەر دزییان كرد دەستیان ببڕن ، لە پاداشتی ئەو كردەوەیان وەك سزا وتەمێ كردنێك لە خوداوە ، خودا باڵا دەست ودانای كار لەجێیە ، هەركەسێك لەو دزانە تەوبە بكات دوای ئەو ستەمەی لە خەڵكی كردووە ونەفسی خۆی چاك بكات وچاكە ئەنجام بدات وگوێڕایەڵی فەرمانەكانی خودا بكات ، بە دڵنیاییەوە خودا تەوبەی لێ وەردەگرێت ، بێگومان خودا لێخۆش بوو وپۆشەری تاوانە وبە بەزەییە .

دروست نییە دوای جێگیر بوونی ئەو تاوانە سزاكەی دوابخرێت ، نەبە بەندكردن ونەبە پارە وەرگرتن وهیچ شتێكی تر ، بەڵكو دەستی دەبڕدرێت لە هەموو كاتێكدا تەنانەت لەكاتە پیرۆزەكانیشدا ، چونكە ئەنجامدانی ئەو سزایانە خوداپەرستیە ، وەك تێكۆشانە لە پێناوی خودا ، پێویستە خەڵك بزانێت دانانی ئەو جۆرە سزایانە ڕەحمەتی خودایە بۆ بەندەكانی ، وپێویستە كاربەدەستان زۆر توندبن لە ئەنجامدانی ئەو سزایانە بەسەر تاوانباراندا ، ونابێت بەزەییان بێتەوە بەو جۆرە كەسانەدا وئەو سزایە نەسەپێنن ، ودەبێت لە ئەنجامدانی ئەو جۆرە سزایانە مەبەستیان قازانجی كۆمەڵگا بێت ، بە ڕێگا گرتن لە خراپەكاران ، نەك لەبەر توڕەیی وخۆسەپاندن بەسەر خەڵكدا ، پێویستە كاربەدەستان وەكو باوكێكی بەبەزەییبن بۆ تاوانباران ، ئەگەر باوك وازبێنێت لە ڕێنمایی

کردنی منداڵەکەی ئەو کاتە منداڵەکەی خراپ دەبێت ولە ڕێگا دەردەچێت ، بەڵکو باوك ڕێنمایی منداڵەکەی دەکات لەبەر ئەوەی منداڵێکی باشی بێت ولەڕێگا دەرنەچێت ، هەرچەند منداڵەکەش واگومان ببات کە پێویستی بە ئامۆژگاری وڕێنمایی کردن نییە ، وەکو پزیشك کاتێك پێویست دەکات دەرمانی تاڵ وژاڵ دەرخواردی نەخۆشەکانی دەدات ، وهەروەها ئەو ئەندامەی مرۆڤ کە تووشی دەبێت بۆ پاراستنی بەشەکانی تری پێویستە ئەو ئەندامەی ببڕدرێت ، ولە کاتی کەڵەشاخ کردندا لەبەر چارەسەرکردن پێویستە مولولەکانی خوێن بریندار بکرێن بۆ ئەوەی خوێنیان لێ بێتە دەرەوە ، وهەروەها مرۆڤ دەرمانی تام وبۆنی ناخۆش دەخوات ودەخواتەوە وخۆی تووشی نارەحەتی دەکات بۆ ئەوەی ئاسوودە بێت .

بەو شێوەیە ئەو جۆرە سزایانە لە شەریعەتدا دانراون ، وپێویستە مەبەستی کاربەدەست لە سەپاندنی ئەو جۆرە سزایانە هاوشێوەی پزیشك ونەخۆشەکانی بێت ، چونکە هەرکاتێك مەبەستی چاککردنی خەڵك وپاساغی کردنیان بێت لە خراپەکاری ، بە دەستەبەرکردنی سوود وقازانج بۆیان ودوورخستنەوەی ئەو شتانەی زیان بە کۆمەڵگە دەیەگەنێت ، لەوەشدا دەبێت تەنها مەبەستی ڕەزامەندی وگوێڕایەڵی خودا بێت ، ئیدی خودا دڵەکانی بۆ نەرم دەکات ، وهەموو هۆکاری باش وخێری بۆ ئاسان دەکات ، وسزادانی ئەو کەسانەی بۆ ئاسان دەکات ، ئەو کەسەش کە سزا دەدرێت ڕازی دەبێت کاتێك سزای تاوانەکەی بەسەردا بسەپێت .

بەڵام ئەگەر مەبەستی خۆسەپاندن بوو بەسەر خەڵك وجێگیرکردنی پایەی دەسەڵاتەکەی بێت ، بۆ ئەوەی بەگەورە وبەهێزی بزانن یان هەرچی ماڵ وسامانی لێ داواکردن سەرپێچی نەکەن ، ئەوکات مەبەستەکەی بەسەر خۆیدا دەشکێتەوە ، گێڕدراوەتەوە لە عومەری کوڕی عبدالعزیزەوە رحمه الله پێش ئەوەی ببێتە خەلیفەی

موسڵمانان کاربەدەستی ولیدی کوڕی عبدالملك بوو لەسەر مەدینەی پێغەمبەری خودا ﷺ ، ئەو کاتە بە سیاسەتێکی دانایانە خەڵکی ئەو شارەی سیاسەت دەکرد ، جارێك حەجاج لە عێراقەوە چوو بۆ مەدینە کە تووشی خراپترین حاڵی کردبوون ، پرسیاری لە خەڵکی شاری مەدینە کرد ، عومەر کەسێتی چۆنە لە نێوانتاندا ؟ وتیان : ناتوانین سەیری بکەین ، وتی ئەی خۆشتان دەوێت ؟ وتیان : لە کەسوکارمان خۆشەویستترە ، وتی : ئەی ئەدەب ورەوشتی چۆنە ؟ وتیان : رەوشت بەرزە وزۆر نزیکە لێمانەوە ، وتی : ئەوە کەسایەتی بێت وئاوا خۆشتان بوێت وهەڵسوکەوتی ئاوابێت ، ئەوە شتێکە خودا لە ئاسمانەوە پێیداوە.

ئەگەر دەستی دز برا پێویستە خوێنەکەی بوەستێنرێتەوە ، وباش وایە دەستی بکرێتە ملی ، وئەگەر بۆ جاری دووەم دزی کرد ، پێی چەپی دەبڕدرێت ، وئەگەر بۆ جاری سێیەم وچوارەم دزی کرد ، هاوەڵان وزانایانی دوای ئەوان دوو بۆچوونیان هەیە ، یەکەمیان : ئەوەیە دەست وپێکەی تری دەبڕدرێت ، ئەوە وتەی ئەبو بەکرە رضي الله عنه ومەزهەبی شافعی وئەحمەدە لە وتەیەکیدا ، دووەمیان : ئەوەیە بەند بکرێت ، ئەوەش وتەی عەلی رضي الله عنه وکوفیەکان وئەحمەدە لەوتەیەکی تریدا ، وکاتێك دەستی دز دەبڕدرێت شتە دزراوەکە بە هاکەی چواریەکی دینارێکی زێڕبێت ، یان سێ درهەمی زیو بێت لە لای خەڵکی حیجاز وفەرموودەناسان (أهل الحديث) وکەسانی تریش ، وەك مالك وشافعی وئەحمەد ، وهەیانە دەڵێت : دەبێت شتە دزراوەکە دینارێکی زێڕ یان دە درهەمی زیو بێت ، هەرکەسێك ئەو بڕەی سەرەوە بدزێت دەستی دەبڕدرێت بە بۆچوونی هەمووان ، لە هەردوو صەحیحەکەدا لە عبدالله کوڕی عومەر رضي الله عنهما ڕیوایەتیان کردووە : (( أن رسول الله ﷺ ، قطع في مجن ثمنه ثلاثة دراهم )) وفي لفظ مسلم : (( قطع سارقا في مجن قيمته ثلاثة دراهم ))[١٠٩].

---

١٠٩. رواه البخاري(٦٧٩٥) ، ومسلم(١٦٨٦).

واتە : پێغەمبەری خودا ﷺ دەستی بڕی لەبەر قەڵغانێك کە نرخەکەی سێ درهەم بوو ، ولە ڕیوایەتی موسلم دا : دەستی دزێکی بڕی لەبەر ئەوەی قەڵغانێکی دزی بوو نرخەکەی سێ درهەم بوو .

دیسان لە هەردوو صەحیحەکە لە عائیشەوە رضي الله عنها ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی : (( تقطع اليد في ربع دينار فصاعدا )) [110] ، وفي رواية لمسلم : (( لا تقطع يد السارق إلا في ربع دينار فصاعداً )) [111] وفي رواية للبخاري قال : (( اقطعوا في ربع دينار ، ولا تقطعوا فيما هو أدنى من ذلك )) [112].

واتە : دەست دەبڕدرێت لە چواریەکی دینارێك بەرەو سەرەوە ، ولە ڕیوایەتی موسلم دا : دەستی دز نابڕدرێت لە چواریەکی دینارێك بەرەو سەرەوە نەبێت ، ولە ڕیوایەتی بوخاری دا دەفەرموێت : لە چواریەکی دینارێك دەست ببڕن ، لەوە کەمتر دەست مەبڕن.

لەوکاتەدا چواریەکی دینارێك سێ درهەم بووە ، ویەك دینار دوازدە درهەم بووە ، کەسێك بەدز ناژمێردرێت هەتاکو ماڵ لە سنوری تایبەت ودیاری کراوی ماڵدا نەبات ، وئەو پارەی کە لە خاوەنەکەی ونبووە ، وبەروبوومی کشتوکاڵی کە لە بیابانێکدایە بەبێ پەرژین ، ومەڕ ومالآت کە شوانی لەگەڵدا نەبێت ، هاوشێوەی ئەو جۆرە ماڵانە دەستی دزەکەی پێ نابڕدرێت ، بەڵام سەرزەنشت دەکرێت وپێی دەبژێردرێت (الغرامة) ، وەك لە سوننەتدا هاتووە .

---

١١٠. رواه البخاري(٦٧٩٠) ، ومسلم(١٦٨٤).

١١١. رواه مسلم(١٦٨٤).

١١٢. رواه احمد(٢٣٩٩٤) ، وصححه الألباني في (صحيح الجامع)(١١٨١).

بەڵام هەندێك لە زانایان ئەو فەرموودەیە بە لاواز (ضعيف) دەزانن ، ئەوەی كەوای وتووە ئەحمەد وئەوانی ترن ، ڕافعی كوڕی خدیج رضي الله عنه دەڵێت : گوێم لە پێغەمبەری خودا ﷺ بوو دەیفەرموو : (( لا قطع في ثمر ولا كثر ))[113].

واتە : دەست بڕین نییە لە دزینی بەروبووم وناوكرۆكی دارخورما .

وعەمری كوڕی شوعەیب لە باوكی وباپیرییەوە رضي الله عنهم دەگێڕێتەوە ودەڵێت : ((سمعت رجلاً من مزينة يسأل رسول الله ﷺ ، قال : يا رسول الله جئت أسألك عن الضالة من الإبل ، قال : معها حذاؤها وسقاؤها ، تأكل الشجر ، وترد الماء ، فدعها حتى يأتيها باغيها ، قال : فالضالة من الغنم ، قال : لك أو لأخيك أو للذئب ، تجمعها حتى يأتيها باغيها : قال : فالحريسة التي تؤخذ من مراتعها ؟ قال : فيها ثمنها مرتين ، وضرب نكال ، وما أخذ من عطنه ، ففيه القطع إذا بلغ ما يؤخذ من ذلك ثمن المجن، قال: يا رسول الله : فالثمار وما أخذ منها من أكمامها قال: من أخذ منها بفمه، ولم يتخذ خبنة فليس عليه شيء ، ومن احتمل فعليه ثمنه مرتين ، وضرب نكال، وما أخذ من أجرانه ففيه القطع، إذا بلغ ما يؤخذ من ذلك ثمن المجن، وما لم يبلغ ثمن المجن، ففيه كرامة مثليه ، وجلدات نكال))[114].

واتە : گوێم لە پیاوێكی (مزینە)یی بوو پرسیاری لە پێغەمبەری خودا كرد ﷺ وتی : ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ پرسیاری حوشترێكت لێدەكەم كە ون بووبێت ، فەرمووی : پێڵاو وئاوی لەگەڵ خۆیدایە ، لەوەڕ دەخوات وئاو دەخواتەوە ، واتە : لێگەڕێ هەتاكو خاوەنەكەی دەیدۆزێتەوە ، وتی : ئەی ونبووی مەڕومالاّت ؟ فەرمووی : بۆ تۆیە یان بۆ براكەت یان بۆ گورگە ، دەتوانیت بیبەیت بەڵكو خاوەنەكەی بێت بەدوایدا

113. رواه أبوداود(٤٣٨٨) ، والترمذي(١٤٤٩) ، والنسائي(٤٩٦٠) ، وابن ماجه(٢٥٩٣) ، وصححه الألباني في (صحيح الجامع)(٧٥٤٥).

114. رواه أبوداود(١٧١٠) ، وحسنه الألباني في (صحيح أبي داود) ، و(الإرواء)(٢٥١٩).

، وتی : ئەی ئەو کەسەی کە مەڕ لە لەوەڕگاکەی دەبات ولەناوی دەدات چی لەسەرە ؟ فەرمووی : دوو ئەوەندەی نرخەکەی لێوەردەگیرێت ولێی دەدرێت وسەرزەنشت دەکرێت ، وئەو حوشترەی لە پەچەکەیدا دەبرێت ولەناو دەبرێت ، دەست برینی لەسەرە ئەگەر نرخی حوشترەکە لە نرخی قەڵغانێك زیاتر بوو کە سێ درهەمە ، وتی : ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەی بەروبووم وئەوەی لە پەرژینی کێڵگەیەك دەبرێت ؟ فەرمووی : ئەوەی بەشی خواردنی دەبات ولێی هەڵناگرێت لەگەڵ خۆیدا هیچی لەسەر نییە ، وئەوەی لەگەڵ خۆیدا لێی دەبات دوو ئەوەندەی نرخەکەی لێوەردەگیرێت ولێی دەدرێت وسەرزەنشت دەکرێت ، وئەوەی لە خەرمان شت دەبات دەستی دەبڕدرێت ئەگەر ئەوەی بردوویەتی بە ئەندازەی نرخی قەڵغانێك بێت ، ئەگەر نەگەیشتە ئەو ئەندازەیە دوو ئەوەندەی نرخەکەی لێوەر دەگیرێت ولێدانیش دەکرێت .

ئەو فەرموودەی سەرەوە بەو شێوەیە لای (النسائی) هاتووە ، لەبەر ئەوەیە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی : ((ليس على المنتهب ولا على المختلس ولا الخائن قطع))[115] .

واتە : تالانکەر ورفێنەر وناپاك (ئەمانەت خۆر) دەست برینیان لەسەر نییە .

تالانکەر ئەو کەسەیە لە پێش چاوی خەڵك ماڵەکە دەبات ، ورفێنەر کەسێکە دەیەوێت شتێك ببات ، بەڵام پێش ئەوەی ببات هەستی پێدەکرێت ، بەڵام جەردە وگیرفان بڕ ئەوانەن کە گیرفانی خەڵك دەبڕن وزەمبیلەی شتومەك دەبەن بۆچوونی ڕاست ئەوەیە دەستیان دەبڕدرێت .

---

١١٥. رواه أبوداود(٤٣٩٢، ٤٣٩٣) ، والترمذي(١٤٤٨) ، والنسائي(٤٩٧١)، وصححه الألباني في (صحيح الجامع)(٥٤٠٢) ، قال ابن عثيمين رحمه الله : ويستثنى من ذلك العارية فإنه ثبت عن النبي ﷺ أنه قطع في جحد العارية.

# بەشی سزای داوێن پیسی (الزنا)

پیاوی داوێن پیس ئەگەر ژنی هێنابوو ، وئافرەتی داوێن پیس ئەگەر مێردی کردبوو بەردباران دەکرێن هەتا مردن ، وەك چۆن پێغەمبەری خودا ﷺ ماعزی کوڕی مالکی ئەسلمی و(الغامدیە) ، ودوو جولەکە وکەسانی تر کە تاوانی داوێن پیسیان (الزنا) ئەنجام دابوو بەردبارانی کردن ، وموسڵمانانیش دوای ئەو بەردبارانی داوێن پیسیان کردووە ، وزانایان ناکۆکن : ئایا پێش ئەوەی بەردباران بکرێت سەد جەلدەی لێدەدرێت ؟ دوو بۆچوونی جیاواز هەیە لە مەزهەبی ئەحمەد وئەوانی تر ، بەڵام ئەگەر ژنی نەهێنا بوو ، ئەوە بەپێی قورئان سەد جەلدەی لێدەدرێت ، ویەك ساڵیش لەو ناوچەیە دوور دەخرێتەوە وەك لە سوننەتی پێغەمبەری خودادا ﷺ هاتووە ، ئەگەرچی هەندێك لەزانایان دوورخستنەوەی بە پێویست (واجب) نازانن .

هیچ لەو سزایانە ناسەپێت تاکو چوار کەس گەواهی لەسەر نەدات ، یان کەسەکە خۆی چوار جار گەواهی بدات ودان بەو تاوانەدا بنێت ، لای زۆربەی زانایان ، وهەندێکیان دەڵێن : تەنها یەکجار کەسەکە گەواهی لەسەر خۆی بدات ئەو سزایەی بەسەردا دەسەپێت ، بەڵام ئەگەر دانی بەو تاوانەدانا وپاشان لێی پاشگەزبووەوە ، هەندێك دەڵێن : ئەو سزایەی لەسەر دەکەوێت ، وهەیانە دەڵێت لەسەری ناکەوێت .

وبەکەسێك دەڵێن : هاوسەردار (المحصن) "کە ئازاد و پێگەیشتوو وژیر بێت (مکلف)" کە جووت بوونی کردبێت لەگەڵ خێزانەکەیدا ، ئەگەر بۆ تەنها یەك جاریش بێت ، وئایا مەرجە ئەو ژن وپیاوە لەو سیفەتانەی سەرەوە هاوتابن ؟ زانایان دوو بۆچوونیان هەیە ... وئایا ئەگەر یەکێك پێنەگەیشتوو بێت (غیر بالغ) وپێگەیشتوویەك هاوسەری بێت یان بەپێچەوانەوە ئایا لە ڕیزی هاوسەرداران دێنە ئەژمار ؟ .

بەڵام ئەو كەسانەی كە لە ئەستۆی موسڵمانانداان (أهل الذمة) ، ئەوانیش هەمان حوكمی موسڵمانانیان هەیە لای زۆربەی زانایان وەك شافعی وئەحمەد ، چونكە پێغەمبەری خودا ﷺ ئەو دوو جولەكەی كە داوێن پیسیان كردبوو بەردبارانی كردن لەبەر دەرگای مزگەوتەكەی ، ئەوەش یەكەم بەردباران كردن بوو لە ئیسلامدا .

وزانایان ناكۆكن لەو ئافرەتەی كە سكی پڕە وپیاو وگەورەشی (سید) نییە ، وهیچ گومان لەوەدا نەبێت كە ئافرەتەكە سكی پڕە ، لە مەزهەبی ئەحمەد وئەوانی تر دوو بۆچوون هەیە ، وتراوە : سزای حەددی لەسەر نییە ، چونكە دەشێت بە زۆر سكی پڕكرابێت ، یان دەشێت ئەو ئافرەتە تۆوی (منی) پیاوێكی كردبێتە گیانی خۆیەوە بەبێ ئەنجامدانی تاوانی داوێن پیسی ، یان دەشێت بە هەڵە پیاوێك وایزانی بێت ژنی خۆیەتی وئەو كارەی لەگەڵدا كرابێت ، ووتراوە سزای حەددی بەسەردا دەسەپێت ، ئەمەیان لە خەلیفە ڕاشدیەكان گێڕدراوەتەوە ، ولە بنەماكانی شەریعەتەوە نزیكە وبۆچوونی خەڵكی مەدینەیە ، چونكە ئەگەری (الإحتمال) دەگمەن لای لێناكرێتەوە ، وەك ئەگەری درۆكردنی ، یان درۆی گەواهی دەرەكان ، ئەگەر هۆكاری تاوانەكە دیار بوو.

بەڵام نێرباز هەندێك لە زانایان دەڵێن : سزای وەك سزای شەڕواڵپیسی یە ، ووتراوە : لەوەش كەمترە ، بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت وهاوەڵان لەسەری كۆكن : ئەنجامدەری تاوانەكە وئەو كەسەی تاوانەكەی لەگەڵدا ئەنجام دەدرێت(الفاعل والمفعول به) دەكوژرێن ، ئەگەر ژنیان هەبێت یان نا ، چونكە خاوەن سونەنەكان لە ئیبن عەباسەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتیان كردووە دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی : (( من وجدتموه يعمل عمل قوم لوط ، فاقتلوا الفاعل والمفعول به ))[116] .

واته : هەركەسێكتان بینی ئیشی گەلی لوطی دەكرد ، ئەنجامدەری تاوانەكە وئەو كەسەی تاوانەكەی لەگەڵدا ئەنجام دەدرێت بكوژن ، وئەبوداود لە ئیبن عباسەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتی كردووە كە پرسیاری لێكراوە : ( في البكر يوجد على اللوطية ، قال : يرجم ).

---

١١٦. رواه أبوداود (٤٤٦٢) ، والترمذي (١٤٥٦) ، وابن ماجه (٢٥٦١) ، وصححه الألباني (في صحيح الجامع)(٦٥٨٩).

واتە : كەسێك كە هاوسەرگیری نەكردبێت وگەنج بێت بینرا ئیشی گەلی لوطی دەكرد ، دەڵێت : بەردباران دەكرێت .

ولە عەلی كوڕی ئەبو تالبیشەوە ﷺ هەروەها گێڕدراوەتەوە .

هاوەڵان ناكۆكنین لە كوشتنی ، بەڵام ناكۆكن لە جۆری كوشتنەكەی ، لە ئەبوبەكری صدیقەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە : فەرمانی كردووە بە سوتاندنی ، ولەوانی ترەوە فەرمانكراوە بە كوشتنی ، وهەندێكیان دەڵێن : دیواری بەسەردا دەڕوخێنرێت تا دەمرێت ، ووتراوە : لە پیسترین شوێندا بەند دەكرێت تا دەمرێت ، وهەندێكی تریان دەڵێن : دەبرێتە سەر بەرزترین دیواری ناوچەكە وفڕێ دەدرێتە خوارەوە ، دوایی بەرد باران دەكرێت ، وەك ئەوەی خودا ﷻ سزای گەلەكەی لوط داوە بە بەردباران كردنیان ، ئەمەیان لە ئیبن عەباسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە ، وڕیوایەتێكی تر دەڵێت : بەردباران دەكرێت ، زۆربەی پێشینان لەسەر ئەو بۆچوونەن ودەڵێن : چونكە خودا گەلەكەی لوطی بەردباران كرد ، وبەردباران كردنی داوێن پیسیش لە شەریعەتدا دانراوە وەك چواندنێك بە بەردباران كردنی گەلەكەی لوط ، هەردووكیان بەردباران دەكرێن ، ئەگەر ئازادبن یان كۆیلە ، یان یەكێكیان كۆیلە بێت ئەویتریان ئازاد ، بە مەرجێك پێگەیشتووبن ، ئەگەر یەكێكیان پێنەگەیشتوو بوو ناكوژرێت بەڵام سزا دەدرێت ، كەسێك پێگەیشتوو نەبێت بەردباران ناكرێت .

## بەشی سزای مەی خۆر وتۆمەتبارکردنی کەسێك بە داوێن پیسی

سزای مەی خۆر : لە سوننەتی پێغەمبەری خودا ﷺ جێگیر بووە وموسڵمانانیش کۆڕان لەسەری ، لە سونەنەکاندا ڕیوایەت کراوە لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ لە چەند ڕێگایەکەوە فەرموویەتی : (( من شرب الخمر فاجلدوه ، ثم إن شرب فاجلدوه ، ثم إن شرب فاجلدوه ، ثم إن شرب الرابعة فاقتلوه ))[١١٧].

واتە : هەرکەسێك مەی خواردەوە جەلدەی لێبدەن ، دیسان ئەگەر خواردیەوە جەلدەی لێبدەن ، دیسان ئەگەر خواردیەوە جەلدەی لێبدەن ، بۆجاری چوارەم ئەگەر خواردیەوە بیکوژن .

وجێگیر بووە لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ کە جەلدەی لە مەیخۆر داوە زیاتر لە جارێك ، وخەلیفەکانی وموسڵمانانیش دوای ئەو وایان کردووە .

وکوشتن لای زۆربەی زانایان سڕاوەتەوە وحوکمی هەڵگیراوە (منسوخ) ، ووتراوە : حوکمەکەی هەڵنەگیراوە ، ووتراوە : ئەوە سەرزەنشت کردنێکە کاربەدەست لە کاتی پێویست دا بەکاری دەهێنێت .

ولە پێغەمبەری خوداوە ﷺ جێگیر بووە کە چل دار وسەرپێیی (النعل) لە مەیخۆری داوە ، وئەبوبەکر رضي الله عنه چل داری لێداون ، وعومەر رضي الله عنه هەشتا داری لێداون ، وعەلی رضي الله عنه هەندێك جار چل دار وهەندێك جار هەشتا داری لێداون ، هەندێك لە

---

١١٧. رواه أبوداود(٤٤٨٢) ، والترمذي(١٤٤٤) ، وابن ماجه(٢٥٧٣) ، وصححه الألباني في (صحيح الجامع)(٦٣٠٩).

زانایان دەڵێن : پێویستە هەشتا داریان لێبدرێت ، وهەیانە دەڵێن : پێویستە چل داریان لێبدرێت ، ولەوە زیاتر کاربەدەستان لەکاتی پێویستدا پەنای بۆ دەبەن ، ئەگەر خەڵکانێك خوویان بە مەیخواردنەوە گرتبوو ، یان ئەگەر ئەو کەسە لەوە زیاتری لێنەدرێت لەو کارە نەگەڕێتەوە ... هتد .

بەڵام بۆ ئەو کەسانەی کەم دەخۆنەوە چل دار بەسە ، ئەمەش لە بۆچوونەکەی تریان باشترە ، ئەوەش وتەی شافعی وئەحمەدە ، لە ڕیوایەتێکدا کە لە ئەحمەد گێڕدراوەتەوە .

وعومەری کوڕی خەتاب ﷺ "کاتێك مەی خواردنەوە زۆر بوو" ئەوکات دوورخستنەوە وسەرتاشینیشی بۆ زیاد کرد ، لەگەڵ لێدانی چل داردا ، یان ئەگەر کاربەدەست بوو لەسەر کار لابرێت کارێکی باشە ، چونکە عومەری کوڕی خەتاب ﷺ پێیان ڕاگەیاند هەندێك لە کاربەدەستانی بۆ گەواهیدان ونموونە هێنانەوە چەند دێڕێکی هێناوەتەوە کە باسی لە مەی کردووە ، لەسەر کار لای بردوون .

ئەو مەیەی کە خودا وپێغەمبەرەکەی حەرامیان کردووە ، وپێغەمبەر ﷺ فەرمانی بەلێدانی دارحەد کردووە ، بریتییە لە هەر خواردنەوەیەك کە مەست وسەرخۆش بکات لەهەر مادەیەکەوە دروست کرابێت ، ئەگەر لە بەروبووم بێت وەك ترێ وخورما وهەنجیر ، یان لە دانەوێڵە بێت وەك گەنم وجۆ ، یان لە مێروو بێت وەك هەنگوین ، یان لە گیانلەبەر بێت وەك شیری ماین ، بەڵکو لە کاتێکدا خودای باڵادەست ئایەتی حەرامکردنی مەیی بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ دابەزاند ، ئەو کات لە شاری مەدینە مەیی ترێ نەبوو ، چونکە لە مەدینە داری ڕەز (مێو) نەبوو ، وتەنها لە وڵاتی شامەوە دەهێنرا ، وزۆربەی خواردنەوەکانیان شەرابی(بادە) خورما بوو ، ولە سوننەتدا لە زۆر شوێن

گێڕدراوەتەوە لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ وخەلیفە ڕاشدییەكان وهاوەڵان ﷺ ، كە هەموو سەرخۆشكەرێك حەرامە ، هەر هەموویان لە ڕەگەزی مەیین .

خەڵك جاران گیراوەی شیرینیان دەخواردەوە ، ئەو گیراوەیە بریتی بوو لە ئاو وخورما ومێوژ بە تێكەڵ كراوی ، دواتر خورما ومێوژەكە دەردەهێنرا بۆ ئەوەی ئاوەكە شیرین بێت ، بە تایبەت ئاوەكانی حیجاز كە زۆربەی شۆرە ، ئەو جۆرە گیراوانە بە كۆڕای موسڵمانان حەڵاڵە ، چونكە نابێتە هۆی سەرخۆشكردن ، وەك چۆن شەربەتی ترێ حەڵاڵە پێش ئەوەی ببێتە مادەیەكی سەرخۆشكەر ، پێغەمبەری خودا ﷺ یاساغی (نهی) ئەوەی لێكردبوون كە ئەو گیراوانە لە قاپی لە دار دروستكراو ولە قوڕ دروستكراو وقاپی بە قیر وزفت ڕوپۆشكراو بگرنەوە ، وفەرمانی پێكردبوون كە ئەو گیراوانە لەو جۆرە قاپانەدا بگرنەوە كە سەرقاپەكانیان دەتوانرێت بەباشی توند بكرێت وبكرێتەوە ، چونكە ئەو جۆرە دەفرانە كاتێك گیراوەكەی ناویان ببێتە (سەرخۆشكەر) هەڵدەئاوسێن ، گەر وانەبێت لەوانەیە گیراوەكە ببێتە سەرخۆشكەر ونەزانرێت بخورێتەوە بەوەش مرۆڤ تووشی خواردنەوەی شتی گومان لێكراو دەبێت ، بەڵام ئەو جۆرە قاپانەی كە فەرمان كراوە ئەو جۆرە گیراوانەی تێدا نەگیرێتەوە گەر گیراوەكەش بگەنێت وببێتە مەیش گۆڕانیان بەسەردا نایەت .

ولە پێغەمبەری خودایان ﷺ گێڕاوەتەوە دواتر ڕوخسەتی بە بەكارهێنانی ئەو جۆرە دەفرانە داوە دەفەرموێت : ((كنت نهيتكم عن الإنتباذ في الأوعية فانتبذوا ، ولا تشربوا المسكر))[118] .

واتە : من یاساغی ئەوەم لێكردبوون كە گیراوە لەو قاپانەدا بگرنەوە ، ئێستا دەتوانن بیگرنەوە بەڵام سەرخۆشكەر مەخۆنەوە .

---

١١٨. رواه مسلم (٩٧٧).

هاوەڵان وزانایانیش لـە دوای ئەوان ناکۆکن ، هەندێکیان سڕینەوەی (النسخ) ئەوەی پێنەگەیشتووە یان لای جێگیر نەبووە ، یاساغی ئەوەی کردووە کە گیراوە لـەو جۆرە قاپانەدا بگیرێتەوە ، وهەیانە باوەڕی وایە ئەو کارە جێگیر بووە وسڕاوەتەوە وڕوخسەتی بەکارهێنانی ئەو جۆرە قاپەیان داوە ، هەندێك لـە شەرعناسەکان بیستبوویان کە هەندێك لـە هاوەڵان گیراوەی خورما وترێ دەخۆنەوە ، وایان باوەڕکردبوو کە ئەو گیراوانە سەر خۆشکەرن ، بەو گومانەش ڕوخسەتی خواردنەوەی هەموو جۆرە گیراوەیەکیان دابوو جگە لـە گیراوەی خورما و مێوژ ، وڕوخسەتی ئەو گیراوەشیان دابوو کە دوای کوڵان لـە خورما ومێوژ دەگیرایەوە ، بەڵام ڕاستی ئەوەیە کە زۆربەی موسڵمانان لـەسەری کۆکن ، هەموو سەرخۆشکەرێك مەیە ، هەرکەسێك بیخواتەوە جەلـدەی لـێدەدرێت ، ئەگەر تەنها دڵۆپێکیش بخواتەوە بۆ چارەسەرکردن بێت یان بۆ شتی تر ، چونکە پرسیاریان لـە پێغەمبەری خودا کرد ﷺ کە مەی بۆ چارەسەرکردن بەکاربهێنن ؟ فەرمووی : (( إنها داء وليست بدواء ))[119] .

واتە : مەی خۆی نەخۆشیە بۆ چارەسەر بەکار نایەت .

ودەفەرموێت : (( وإن الله لم يجعل شفاء أمتي فيما حرم عليها ))[120] .

واتە : خودا چارەسەری ئوممەتەکەمی لـە شتانێکدا دانەناوە کە حەرامی کردووە لـەسەریان .

وسزادان پێویستە ، بۆ کەسێك کە ئەو تاوانە ساغ ببێتەوە لـەسەری ، یان خۆی دانی پێدابنێت ، بەڵام ئەگەر بۆنی مەی لـێدەهات ، یان بینرا کە دەرشێتەوە یان شتێکی لـەو بابەتە ، وتراوە : داری حەددی لـێنادرێت ، چونکە پێدەچێت ئەوەی خواردیەتیەوە سەرخۆشکەر نەبێت ، یان نەیزانیبێت مەیە وخواردبێتیەوە ، یان بە زۆر دەرخواردیان دابێت ... هتد .

---

١١٩. رواه مسلم (١٩٨٤).

١٢٠. رواه الطبراني في المعجم الكبير(٣٢٦/٢٣) ، وابن حبان في صحيحه(٣٣٩٣) ، وضعفه الألباني في (ضعيف الجامع)(١٦٣٧).

ووتراوە : داری حەددی لێدەدرێت ئەگەر زانرا سەرخۆشە ، ئەوەش لە خەلیفە ڕاشدییەکان وهاوەڵان گێڕدراوەتەوە وەك عثمان وعلى وئیبن مسعود رضي الله عنهم ، وسوننەتی پێغەمبەری خوداش ﷺ لەسەر ئەو ڕاستیە بەڵگەیە ، خەڵك بەوە باش دەبن ، ئەوەش مەزهەبی مالك وئەحمەدە لە زۆربەی وتەکانی وئەوانی تریش .

وئەو تریاکە سەرخۆشکەرەی کە لە گەڵای داری مێو دروست دەکرێت دیسان حەرامە ، ئەوەی بیکێشێت داری حەددی لێدەدرێت ، ولە مەی پیسترە لەو ڕوانگەیەوە کە ژیری ودەروونیش تێك دەدات ، نامەردی وگەوادی وهەرچی کاری خراپ هەیە تووشی خاوەنەکەی دەکات .

ومەی پیسترە لەو ڕوانگەیەوە کە تووشی دەمەقاڵە وشەڕ وکوشتنی دەکات ، وهەردووکیان مرۆڤ لە یادی خودا ونوێژ دوور دەخەنەوە ، هەندێك لە زانایانی ئەم دواییە لە لێدانی داری حەد لەو کارە وەستاون ، وادەبینن کە خواردنی ئەو شتە نابێتە مایەی ئەوەی خاوەنەکەی شایەنی لێدانی داری حەد بێت ، چونکە واگومان دەبەن کە بێئاگابوون بەخشی هەستی خۆشی ومەست بوون وەکو بەنج بوون وایە ودەڵێن : زانایانی پێشین هیچ بۆچوونێکیان لەو بارەوە نییە ، بەڵام وانییە بەڵکو ئەوانەی دەیخۆن پێی سەرخۆش دەبن وخووی پێوە دەگرن ، وەك خواردنەوەی مەی بەڵکو خراپتریشە ، ودەبێتە ڕێگر لە یادی خودا ونوێژ ، بەتایبەت ئەوانەیان کە ڕۆدەچن لە خواردنی ، لەگەڵ ئەو هەموو خراپییەی کە هەیەتی وەك نامەرد بوون وگەوادی کردن ، وتێکچوونی بیرو هەست وهەرچی شتی تری خراپ هەیە .

بەڵام لەبەر ئەوەی مادەیەکی ڕەقە دەخورێت وناخورێتەوە ، شەرعناسان ناکۆکن لە پیسییەکەی وسێ بۆچوونیان هەیە لەو بارەیەوە : لە مەزهەبی ئەحمەد وئەوانی تر ،

وتراوه : پیسه وه‌كو مه‌ی ، ئه‌وه‌ش بۆچوونی ڕاسته ، وتراوه : نه‌خێر له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ڕه‌قه ، ووتراوه : جیاوازی هه‌یه له نێوان ئه‌وه‌ی شل بێت یان ڕه‌ق ، به‌هه‌رحاڵ ئه‌و ماده‌یه خودا وپێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی ﷺ حه‌رامیان كردووه به وته وبه‌ماناش ، چونكه له بابه‌تی مه‌یه وسه‌رخۆشكه‌ره ، ئه‌بو موسی ئه‌شعه‌ری رضي الله عنه ده‌ڵێت : وتم ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خودا ﷺ فه‌توامان بۆ بده ده‌رباره‌ی دوو خواردنه‌وه كه ئێمه له یه‌مه‌ن دروستیان ده‌كه‌ین : (البتع) كه له هه‌نگوین دروست ده‌كرێت تا ده‌گه‌نێت ، و(المزر) كه له گه‌نمه شامی وجۆ دروست ده‌كرێت تا ده‌گه‌نێت ، ده‌ڵێت : پێغه‌مبه‌ری خودا ﷺ ئه‌وه‌ی پێبه‌خشرابوو كه به‌كه‌مترین وشه زۆرترین مانا بكات (جوامع الكلم) ، فه‌رمووی : ((كل مسكر حرام))[١٢١].

واته : هه‌موو سه‌ر خۆشكه‌رێك حه‌رامه .

ونعمانی كوڕی بشیر رضي الله عنهما ده‌ڵێت : پێغه‌مبه‌ری خودا ﷺ فه‌موویه‌تی : (( إن من الحنطة خمراً ومن الشعير خمراً ، ومن الزبيب خمراً ، ومن التمر خمراً ، ومن العسل خمراً ، وأنا أنهى عن كل مسكر ))[١٢٢].

واته : له گه‌نم وجۆ ومێوژ وهه‌نگوین مه‌ی دروست ده‌كرێت ، ومن یاساغی هه‌موو سه‌رخۆشكه‌رێك ده‌كه‌م .

به‌ڵام ئه‌م فه‌رمووده‌یه له هه‌ردوو صه‌حیحه‌كه‌دا به وته‌ی عومه‌ر هاتووه ، وله‌سه‌ر مینبه‌ره‌كه‌ی پێغه‌مبه‌ری خودا ﷺ وتاری خوێندوو : فه‌رمووی : ((الخمر ما خامر العقل))[١٢٣].

---

١٢١. رواه البخاري(٤٣٤٣) ، ومسلم(١٧٣٣).

١٢٢. رواه أبوداود(٣٦٧٧) ، وحسنه الألباني في (صحيح الجامع)(١٦٠٤).

١٢٣. رواه البخاري(٤٦١٩) ، ومسلم(٣٠٣٢).

واته : مەی هەرشتێکە کە سەرخۆشبکات وژیری ببات ، وئیبن عومەر رضي الله عنهما دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی : (( كل مسكر خمر ، وكل مسكر حرام )).

واته : هەموو سەر خۆشکەرێك مەییە ، وهەموو سەرخۆشکەرێك حەرامە .

ولە ریوایەتێکی تردا هاتووە : (( كل مسكر خمر ، وكل خمر حرام ))[124].

واته : هەموو سەر خۆشکەرێك مەییە ، وهەموو مەییەك حەرامە .

وعائشه رضي الله عنها دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی : (( كل مسكر حرام ، وما أسكر الفرق منه ، فملء الكف منه حرام ))[125].

واته : هەموو سەر خۆشکەرێك حەرامە ، وەهەر شتێك (فرق)ێکی[126] سەرخۆش بکات ، خواردنەوەی پڕمشتێکی حەرامە .

وخاوەن سونەنەکان لە چەند رێگایەکەوە لە پێغەمبەری خودایان ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی : (( ما أسكر كثيره ، فقليله حرام ))[127].

---

١٢٤. رواه مسلم(٢٠٠٣).

١٢٥. رواه أبوداود (٣٦٨٧) ، والترمذي(١٨٦٦)، و صححه الألباني في صحيح الجامع(٤٥٥٢).

١٢٦. فرق : في (النهاية) : الفرق بالفتح مكيال يسع ستة عشر رطلا ، وهي اثنا عشر مدا وثلاثة أصوع عند أهل الحجاز ، وقيل : الفرق خمسة أقساط القسط نصف صاع ، فأما الفرق بالسكون فمائة وعشرون رطلا منه الحديث (( ما أسكر الفرق منه فالحسوة منه حرام )) اهـــ ؛ فالسكون هو الأنسب بمقام المبالغة وكذا ضبط به في الأصول المعتمدة ، وفي (القاموس) : الفرق مكيال المدينة يسع ثلاثة أصوع ، ويحرك أو هو أفصح أو يسع ستة عشر رطلا وأربعة أرباع ، وقال ابن الملك : الفرق بالسكون من الأواني والمقادير ما يسع ستة عشر رطلا أو اثني عشر مدا ، وعن محمد بن الحسن : ستة وثلاثين رطلا ، والمعتمد ما قاله المحقق ابن الهمام من أن الفرق بتحريك الراء عند أهل اللغة ، وأهل الحديث يسكنونها وهو مكيال معروف يسع ستة عشر رطلا (فملء الكف منه حرام) قال الطيبي : الفرق وملء الكف عبارتان عن التكثير والتقليل لا التحديد .

١٢٧. رواه أبوداود (٣٦٨١) ، والترمذي(١٨٦٥) ، وابن ماجه(٣٣٩٣) ، والنسائي(٥٦٠٧) ، وصححه الألباني في (صحيح الجامع)(٥٥٣٠).

واتە : ئەوەی زۆری سەرخۆش ومەست بکات ، خواردنەوەی کەمیشی حەرامە .

وجابر ﭬ دەڵێت : (( أن رجلاً سأل النبي ﷺ عن شراب يشربونه بأرضهم من الذرة ، يقال له : المزر ، فقال : أمسكر هو ؟ قال : نعم ، فقال : كل مسكر حرام ، إن على الله عهداً لمن شرب المسكر ، أن يسقيه من طينة الخبال ، قالوا : يا رسول الله وما طينة الخبال ؟ قال : عرق أهل النار ، أو عصارة أهل النار ))[١٢٨].

واتە : پیاوێك پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خودا ﷺ لە خواردنەوەیەك لە گەنمەشامی لای ئەوان دەخورایەوە پێیان دەوت (المزر) ، فەرمووی : ئەو خواردنەوەیە سەرخۆشکەرە ؟ وتی : بەڵێ ، فەرمووی : هەموو سەرخۆشکەرێك حەرامە ، خودا بەڵێنی داوە هەرکەسێك سەرخۆشکەر بخواتەوە (طينة الخبال)ی دەرخوارد دەدات ، وتیان : ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ : (طينة الخبال) چییە ؟ فەرمووی : ئارەقی ئەهلی ئاگرە یان چڵك وخوێن وپیسی ئەهلی ئاگرە .

وئیبن عەباس ﭭ لە پێغەمبەری خودای ﷺ گێڕاوەتەوە : فەرموویەتی : (( كل مخمر خمر ، وكل مسكر حرام ))[١٢٩].

واتە : هەر شتێك سەرخۆشبکات مەییە ، وهەموو سەر خۆشکەرێك حەرامە .

فەرموودە لەم بارەیەوە زۆر زۆرە ، پێغەمبەری خودا ﷺ بە چەند وشەیەکی کەم مانای زۆری کردووە ئەوەی ئاگا وژیری مرۆڤ ببات وسەرخۆشی بکات ، بەبێ جیاوازی لە نێوان جۆرێك وجۆرێکی تر ، ئەگەر خواردنەوە بێت یان خواردن ، چونکە لەوانەیە

---

١٢٨. رواه مسلم(٢٠٠٢) .

١٢٩. رواه أبوداود (٣٦٨٠) ، وصححه الألباني في (صحيح الجامع)(٤٥٤٨) .

کەسێك نان بکاتە ناو مەی وبیخوات ، وحەشیش دەخورێت ودەخورێتەوە ، هەموو ئەوانە حەرامن ، لەبەر ئەوە پێشینان قسەیان لەسەر ئەو بابەتە نەکردووە چونکە شتێکی تازەیە لە نزیك کۆتاییەکانی سەدەی شەشەمدا هاتووە ، وەك چۆن خواردنەوەی ترێی سەرخۆشکەر دوای پێغەمبەری خودا ﷺ دروست کراوە ، هەموو ئەوانە لەژێر ئەو حوکمە گشتیانەی قورئان وسوننەتدا جێگەیان دەبێتەوە .

## بەشی سزای تاوانباركردن بەداوێن پیسی

یەكێك لەو تاوانانەی كە قورئان وسوننەتی پێهاتووە ، وموسڵمانانیش كۆڕان لەسەری سزای تاوانباركردنە بە داوێن پیسی ، ئەگەر كەسێك كەسێكی ئازادی داوێن پاكی تاوانباركرد بە داوێن پیسی یان بە نێربازی ، پێویستە هەشتا جەلدەی لێبدرێت ، (محصن) لێرە بەمانای كەسی ئازادی داوێن پاكە ، بەڵام لە پرسی سزای داوێن پیس بە كەسێك دەوترێت كە ژنی هێنابێت یان مێردی كردبێت وجووت بووبێت بە بەڵگەنامەیەكی مێردكردنی دروست .

## بەشی ئەو تاوانانەی کە حەددێکی دیاری کراویان نییە

ئەو تاوانانەی کە حەددێکی دیاری کراوی بۆ دانەنراوە یان کەفارەتی بۆ دیاری نەکراوە ، وەك ئەو کەسەی منداڵێك یان ژنێکی بێگانە ماچ بکات ، یان دەستبازی لەگەڵ ئافرەتێکدا بکات بەبێ جووت بوون ، یان شتێکی حەرام دەخوات وەك خوێن ومردارەوە بوو ، یان کەسێك تۆمەتبار دەکات بە جگە لە داوێن پیسی ، یان دزی لە شوێنێك دەکات کە شوێنێکی پارێزراو نییە ، یان دزینی شتێکی کەم ، یان خیانەت کردن لە ئەمانەت ، وەك کارمەندانی (بیت المال) یان ماڵی (الوقف) وماڵی هەتیو وهاوشێوەکانی ، ئەگەر خیانەت بکەن ، یان بریکار وهاوەڵ ئەگەر خیانەت بکەن ، یان کەسێك لە کڕین وفرۆشتندا گزی (غش) بکات ، وەك ئەو کەسانەی کە لە شتومەکی خواردن و کەلوپەل وهاوشێوەکانی دزی دەکەن ، یان لە کێشانە وپێوانە دزی لە خەڵك دەکەن ، یان کەسێك گەواهی ناڕەوا بدات ، یان گەواهی ناڕەوا بخاتە سەر زاری کەسێك ، یان بەرتیل بدات بۆ ڕاپەڕاندنی ئیش وکارەکانی ، یان حوکم بە قورئان نەکات ، یان ستەم لە هاولاتییەك بکات ، یان تەعزیەباری وەکو سەردەمی نەفامی بکات ، یان بەدەم بانگهێشتی نەفامیەوە بچێت ، هەروەها هەموو حەرام کراوەکانی تر ، هەموو ئەو جۆرە کەسانە سزادەدرێن بەوەی سەرزەنشت دەکرێن ولۆمە دەکرێن ولێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرێت ، بە ئەندازەی ئەوەی کاربەدەست بەپێویستی بزانێت ، وبەگوێرەی زۆر وکەمی تاوانەکە ، ئەگەر تاوانەکەی زۆر بوو سزاکەی زیاتر دەبێت ، بە پێچەوانەی ئەوەی کە تاوانەکەی کەم بێت ، یان سەیری حاڵی تاوانبارەکە دەکرێت ، ئەگەر لەو کەسانە بوو کە خووی بە تاوان کردنەوە گرتبوو سزای زیاتر دەدرێت ، بە پێچەوانەی کەسێك کە بە کەمی تاوان دەکات ، وبەگوێرەی گەورە

وبچوكی تاوانەكە ، ئەگەر كەسێك دەست بۆ كۆمەڵە ژن ومنداڵێكی خەڵك ببات زیاتر سزا دەدرێت وەك لە كەسێك كە تەنها دەست بۆ ژنێك یان منداڵێك ببات .

كەمترین تاوان حەددی تیادا نییە ، وحەد هەرشتێكە كە كەسێك ئازار بدات ، بە وتە یان بەكردەوە ، یان بە قسە لەگەڵدا نەكردن ، یان هەڵسوكەوت لەگەڵ نەكردنی ، كەسێك سەرزەنشت دەكرێت بە ئامۆژگاری كردنی یان بە ترساندنی ، یان بە توڕەبوون لێی ، هەندێك جار بەوە سزا دەدرێت كە سەلامی لێناكرێت تا پەشیمان دەبێتەوە لەو كردەوەی ئەگەر ئەم كارە بەرژەوەندی تیادابوو بۆی ، وەك چۆن پێغەمبەری خودا ﷺ قسەی لەگەڵ ئەو سێ هاوەڵەدا نەكرد كە لە جەنگی تەبووك دواكەوتن ، وهەندێك جار بەوە سزا دەدرێت كە لەسەر كار لادەبرێت وەك چۆن پێغەمبەری خودا ﷺ وهاوەڵانی وایان دەكرد ، وهەندێك جار سزا دەدرێت بەوەی لەگەڵ سەربازی موسڵماناندا بەكار ناهێنرێت وەك جەنگاوەرێك ، ئەگەر لە كاتی شەڕدا پشتی هەڵكرد وهەڵهات ، چونكە پشت هەڵكردن لە جەنگ لە تاوانە گەورەكانە ، وبڕینی مووچەكەی وەكو سزایەكە بۆی ، وكاربەدەست ئەگەر خۆی بەگەورە زانی لادانی لەسەر كار سزایە بۆی .

وهەروەها سزای دەدرێت بە بەندكردن ، وهەندێك جار بە لێدان ، وبەدەم وچاو ڕەشكردنی وسواركردنی لەسەر گوێدرێژ بەهەڵگەڕاوەیی ، وەك لە عومەری كوڕی خەتابەوە رضي الله عنه گێڕدراوەتەوە كەوای كردووە لەو كەسەی كە گەواهی بەدرۆ داوە ، چونكە درۆزن ڕوو ڕەشە ئەویش دەم وچاوی ڕەش كردووە ، وقسەی هەڵگێڕاوەتەوە ئەویش سواربوونەكەی هەڵگێڕاوەتەوە .

بەڵام لایەنی زۆری ئەم جۆرە سزادانە ، وتراوە : دە قامچی زیاتری لێنادرێت ، وزۆربەی زانایان دەڵێن : نابێت بگەیەنرێتە ئاستی داری حەد ، دیسان ئەوان دوو وتەیان هەیە ، هەیانە دەڵێن : نابێت بگاتە ئاستی کەمترین داری حەد ، ونابێت بۆ کەسێکی ئازاد بگاتە ئاستی حەددی کەسێکی ئازاد ، ئەویش چل یان هەشتا داری حەددە ، ونابێت بۆ کەسێکی کۆیلە بگاتە ئاستی سزادانی کۆیلەیەك ، ئەویش بیست یان چل داری حەددە ، ووتراوە لە هەرباریێکدا نابێت بگاتە ئاستی حەددی کۆیلەك ، هەرتاوانێك مەرج نییە ئەو سزایە بدرێت کە بۆ هاوشێوەکەی لە شەریعەتدا دانراوە ، بۆ نموونە ئەگەر کەسێك شتێك بدزێت لە شوێنێك دەرەوەی ئەو بازنەی کە پێیدەڵێن : پارێزراو دەستی نابڕدرێت ، ئەگەرچی داری حەددی لێدەدرێت زیاتر لەو کەسەی تۆمەتی داوێن پیسی دەداتە پاڵ بێ تاوانێك ، وهەرکەسێك هەرچی بە ئافرەتێك بکات بەڵام داوێن پیسی لەگەڵدا نەکات دیسان سزای شەروالپیسی بەسەردا ناسەپێت ، وەك لە عومەری کوڕی خەتاب ﵁ گێڕدراوەتەوە : ( کەسێك مۆرەکەی تەزویر (ساختە) کردبوو ، بەوەش پارەی لە (بیت المال) وەرگرتبوو ، فەرمانی کرد ڕۆژی یەکەم سەد دار ورۆژی دووەم سەد دار ورۆژی سێیەم سەد داری لێ بدرێ) ، ولە خەلیفە ڕاشدیەکانیان گێڕاوەتەوە : ئەگەر پیاو وژنێك لە نێوجێگەیەکدا بینران ، سەد داریان لێدەدرێت ، ولە پێغەمبەری خودایان گێڕاوەتەوە ﷺ : کەسێك جووت بێت لەگەڵ کەنیزەکی خێزانەکەی : ((إن كانت أحلتها له جلد مائة وإن لم تكن أحلتها له: رجم))[130].

واتە : ئەگەر ژنەکەی حەڵاڵی کردبوو بۆی سەد داری لێدەدرێت ، بەڵام ئەگەر حەڵاڵی نەکرد بوو بۆی : بەردباران دەکرێت .

---

١٣٠. رواه أبوداود (٤٤٥٩) ، والترمذي(١٤٥١) ، وابن ماجه(٢٥٥١) ، والنسائي(٣٣٦٠) ، وضعفه الألباني في (ضعيف أبي داود).

ئەم بۆچوونانە مەزهەبی ئەحمەد وچەند زانایەکە ، ودوو بۆچوونەکەی پێشوو مەزهەبی شافعی وچەند زانایەکی ترە ، بەڵام مالك وچەند زانایەك لێیان گێڕاوەتەوە : تاوانی وا هەیە خاوەنەکە بە هۆیەوە دەکوژرێت ، هەندێك لە هاوەڵانی ئەحمەد هاوڕان لەگەڵیدا ، بۆ نموونە ئەگەر موسڵمانێك سیحوڕی کرد بۆ دوژمنان لە دژی موسڵمانان ، ئیمامی ئەحمەد لە کوشتنی ئەو جۆرە مرۆڤانە ڕاوەستاوە ، بەڵام مالك وهەندێك لە حەنبەلییەکان کوشتنیان بە دروست زانیوە "وەك ئیبن عەقیل" ، وئەبوحەنیفە وشافعی وهەندێکی تر لە حەنبەلییەکان "وەك قازی ئەبویعلی" ئەوەیان بەدروست نەزانیوە .

هەندێك لە هاوەڵانی شافعی وئەحمەد وچەند زانایەکی تر بە دروستیان زانیوە : کەسێك بانگەوازکار بێت بۆ شتە داهێنراوەکان (البدع) کە پێچەوانەی قورئان وسونەتن بکوژرێن ، وهەروەها زۆربەی هاوەڵانی مالکیش ئەوەیان بە دروست زانیوە ودەڵێن : مالك لەبەر ئەوە کوشتنی قەدەرییەکانی (القدرية) بە دروست زانیوە چونکە بشێوی دەنێنەوە لەسەر زەوی ، نەك لەبەر هەڵگەڕانەوە لە ئاین ، وهەروەها جادوبازیش (ساحر) لەبەر ئەو هۆیە دەکوژرێت ، چونکە زۆربەی زانایان ڕایان وایە جادوباز دەکوژرێت ، ولە جوندبەوە ﵁ بە وتەی خۆی وفەرموودەی پێغەمبەری خوداش ﷺ گێڕدراوەتەوە : (( إن حد الساحر ضربه بالسيف ))[131].

واتە : سزای جادوباز کوشتنییەتی بە شمشێر .

وهەروەها لە عومەر وعثمان وحفصە وعبداللەی کوڕی عومەر وهاوەڵانی تریش ﷺ گێڕدراوەتەوە ڕایان وایە دەکوژرێت ، هەندێك زانا دەڵێن : لەبەر ئەوەی کافر بووە ، وهەندێکی تریان دەڵێن : لەبەر بشێوی (الفساد) نانەوەیە لەسەر زەوی ، بەڵام

---

١٣١. رواه الترمذي(١٨٦٥) ، وضعفه الألباني في (ضعيف الجامع)(٢٦٩٩).

زۆرینەی زانایان ڕایان وایە دەکوژرێت وەکو حەددێك لەسەری ، وئەبوحەنیفە ڕای وایە کەسێك کە تاوان دووبارە بکاتەوە هەڕەشەی کوشتنی لێدەکرێت ، ئەگەر جۆری ئەو تاوانە شایانی کوشتن بێت ، وەك چۆن کەسێك نێربازی دووبارە بکاتەوە دەکوژرێت ، یان کەسێك کەسێکی تر تیرۆر بکات لە پێش ماڵی خۆیدا یان هەرشتێکی تر لەبری دەکوژرێت .

وبەڵگەش لەسەر ئەوەی تێکدەر وبشێویکار ئەگەر بەکوشتن نەبێت واز لەوکارە خراپانە نەهێنێت دەکوژرێت ، ئەو فەرموودەیە کە مسلم لە صەحیحەکەیدا لە عورفجەی ئەشجعیەوە رضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە ، دەڵێت : گوێم لە پێغەمبەری خودا بوو ﷺ دەیفەرموو : (( من أتاكم وأمركم جميع على رجل واحد ، يريد أن يشق عصاكم ، أو يفرق جماعتكم فاقتلوه )) وفي رواية : (( ستكون هنات ، وهنات ، فمن أراد أن يفرق أمر هذه الأمة وهي جميع فاضربوه بالسيف كائناً من كان ))[١٣٢].

واتە : ئەگەر ئێوە تەبا بوون لەسەر پێشەوایەتی وسەرکردایەتی کەسێك ، وکەسێك بێت وبیەوێت ئەو یەك دەنگی وتەبابوونەتان لیٚ تێك بدات بیکوژن ، ولە ڕیوایەتێکی تردا : لە ئایندەدا کۆمەڵێك بشێوی وشتی سەرسوڕهێنەر پەیدا دەبێت ، هەرکەسێك بیەوێت کاری ئەم ئوممەتە تێکبدات لەکاتێکدا ئەوان تەبابوون ، ئەوە بەشمشێر بیکوژن ، هەرکەسێك بوو .

وهەروەها بۆ ئەو کەسانەی کە مەی دەخۆنەوە فەرمان کراوە بەکوشتنیان جاری چوارەم ، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی کە ئەحمەد لە موسنەددا لە دەیلم الحميريیەوە رضي الله عنه گێڕاوەتەوە دەڵێت : (( سألت رسول الله ﷺ فقلت يا رسول الله : إنا بأرض

---

١٣٢. رواه مسلم(١٨٥٢).

نعالج بها عملاً شديدا ، وإنا نتخذ شرابا من القمح نتقوى به على أعمالنا ، وعلى برد بلادنا ، فقال : هل يسكر ، قلت : نعم ، قال : فاجتنبوه ، قلت : إن الناس غير تاركيه ، قال : فإن لم يتركوه فاقتلوهم ))[١٣٣].

واته : پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خودا ﷺ وتم : ئەی پێغەمبەری خودا ، ئێمە لە وڵاتێکین ئیشوکاری سەخت ودژوار دەکەین ، خواردنەوەیەك لە گەنم دروست دەکەین ، بۆ ئەوەی بەهێزمان بکات لە ئیش وکارەکانمان ، ولەبەر سەرمای وڵاتەکەمان دەیخۆینەوە ، فەرمووی : سەرخۆش دەکات ؟ وتم : بەڵێ ، فەرمووی : لێی بەدووربن ، وتم : خەڵکی وازی لێناهێنن ، فەرمووی : هەرکەس وازی نەهێنا بیکوژن .

لەبەر ئەوەی تێکدەر وەك دەست درێژیکار وایە ، ئەگەر وازی لەو کارەی نەهێنا بەکوشتن نەبێت ئەوا دەکوژرێت ، بەوەش کە باسمانکرد سزادان دوو جۆرە :

یەکەم : لەسەر تاوانێك کە ئەنجام دراوە ، سزادان بەرەنجامی تاوانێکە وەك سەرزەنشتێك لەلایەن خوداوە ، بۆ نموونە سزادانی مەی خۆر یان سزای کەسێك کە بە بێتاوان کەسێکی تر بەشەروالْ پیسی تاوانبار دەکات ، وبرینی دەست وپێی ڕێگر وبرینی دەستی دز .

دووەم : سزادان لەبەر ئەنجام نەدانی کارێکی پێویست ، یان وازنەهێنان لە کارێکی حەرام لە ئاییندەدا وەك چۆن کەسێك لە ئاین هەڵگەڕابێتەوە داوای پەشیمان بوونەوەی لێدەکرێت ، ئەگەر پەشیمان نەبووەوە دەکوژرێت ، وهەروەها نوێژنەکەر وزەکات نەدەر وپێشێلکاری مافی خەڵك سزا دەدرێن تا ئەوەی لەسەریانە بەجێی دەهێنن ، ئەگەر کەسێك سزا درا بەلێدان ، بۆ جاری دووەم زیاتر سزا دەدرێت ئەگەر ئەوەی

١٣٣. رواه أبوداود(٣٦٨٣) ، وصححه الألباني في (المشكاة)(٣٦٥١).

پێویست بوو لەسەری بەجێی نەهێنا ، بۆ نموونە دروستە سزای نوێژنەکەر بدرێت چەند جارێك تا نوێژ دەکات ، یان ئەوەی پێویستە لەسەری بە ئەنجامی دەگەیەنێت ، وئەو فەرموودەیەی کە لە هەردوو صەحیحەکەدا هاتووە ، لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ دەفەرموێت : (( لا يجلد فوق عشرة أسواط إلا في حد من حدود الله ))[١٣٤].

واتە : لە دە قامچی زیاتر لەکەس نادرێت مەگەر لەسەر حەددێك لە حەددەکانی خودا ﷻ نەبێت .

هەندێك لە ئەهلی زانست بەوە ڕاڤەیان کردووە ، کەوا مەبەستی لە سنوری خودا ئەوەی کە حەرام کراوە لەبەر مافی خودا ، چونکە زاراوەی سنورەکان (الحدود) لە قورئان وسوننەتدا مەبەست پێی جیاوازی کردنە لە نێوان حەڵاڵ وحەرام ، وەك کۆتایی حەڵاڵ وسەرەتای حەرام ، لە یەکەمدا دەفەرموێت :﴿تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَعْتَدُوهَاۚ ٢٢٩﴾(البَقَرَة).

واتە : ئەوانە سنورەکانی خودان مەیانبەزێنن .

ولەباری دووەمدا دەفەرموێت : ﴿تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَاۗ ١٨٧﴾(البَقَرَة) .

واتە : ئەوانە سنوری خودان نزیکیان مەکەونەوە .

بەڵام ناونانی سزادانی دیاری کراو بە (حد) ، ئەو شتە لە نەریتەوە (عرف) وەرگیراوە ، ومەبەستی فەرموودەکەش : هەرکەسێك لە کەسێکی تریدا لەبەر پێشێل کردنی مافێکی خۆی ، وەك لێدانی پیاو لە خێزانەکەی ئەگەر گوێڕایەڵی نەکرد لەسەر شتێك کە سەرپێچی خودا نەبوو ، نابێت دە دار زیاتری لێبدات ، وئەو جەلدەی کە شەریعەتی ئیسلامیی دیاری کردووە : قامچییەکی مام ناوەندە ، چونکە باشترین شتەکان

---

١٣٤. رواه البخاري(٦٨٤٨) ، ومسلم(١٧٠٨).

وەرگرتنی مام ناوەندەکەیەتی ، عەلی ﷺ دەڵێت : (لێدانێکی مام ناوەند ، وقامچییەکی مام ناوەند) ، جەلدە لێدان نابێت بە گۆچان وشتی تر بێت بەڵکو بە جۆرە قامچییەکی تایبەتە ، وئەو جۆرە قامچییەش بەکارنایەت کە پێی دەوترێت (الدرة) بەڵکو بۆ سەرزەنشتکردن بەکاردێت .

عومەری کوڕی خەتاب ﷺ : لە کاتی تەمێکردن وسەرزەنشتکردندا (الدرة)ی بەکار دەهێنا ، بەڵام بۆ سنورەکان قامچی بەکار دەهێنا وهەموو جلوبەرگەکەی لەبەر دانەدەکەند ، بەڵکو تەنها ئەوەی لەبەر دادەکەند کە بەرگری لە لێدانەکە بکردایە وەك فەروە وفەرەنجی وهاوشێوەیان ، ونابەسترێتەوە ئەگەر پێویستی بەوە نەکرد ، ولە دەم وچاوی نادرێت ، چونکە پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : (( إذا قاتل أحدكم فليتق الوجه ))[135].

واتە : لە هەر کەسێکتان دا خۆتان لە لێدانی دەم وچاوی بپارێزن .

چونکە لێدانەکە بۆ کوشتنی نییە بەڵکو بۆ تەمێ کردنییەتی ، وهەر ئەندامێکی تری پێویستە لەو ئازارە بەشداربێت ، وەك پشت وشان ورانەکانی .

---

١٣٥. رواه البخاري (٢٥٥٩) ، ومسلم (٢٦١٢).

# بەشی سزای سەرپێچیکاران

ئەو سزایانەی کە شەریعەت پێیهاتووە بۆ ئەو کەسانەی سەرپێچی خودا وپێغەمبەری خودا ﷺ دەکەن دوو جۆرن :

یەکەمیان : سزادانی ئەوەی لە توانا دایە سزا بدرێت ، جا کەسێك بێت یان زیاتر .

دووەمیان : سزادانی کۆمەڵێکی بەرگریکار ، وەك ئەوەی لە ژێر ڕکێفدا نەبن ودەستیان پێنەگات بەجەنگ نەبێت .

ئەوە بنچینەی تێکۆشانە لە دژی بێباوەڕان ودوژمنانی خودا وپێغەمبەرەکەی ﷺ ، هەرکەسێك بانگەوازی (دعوة)ی پێغەمبەری خودای ﷺ پێگەیشت کە ئەوە ئاینی خودایە ناردوویەتی ووەڵامی نەدایەوە پێویستە لەگەڵیدا شەڕ بکرێت : ﴿حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِۚ ٣٩﴾(الآنفَال) .

واتە : بۆ ئەوەی تەنها ئاینی خودا بالآبێت ولەگەڵ خودادا کەسی تر نەپەرسترێت .

چونکە کاتێك خودا پێغەمبەرەکەی ﷺ ڕەوانەکرد فەرمانی پێکرد خەڵکی بانگ بکات بۆ ئاینی خودا ئەوکات ڕوخسەتی نەدابوون کەس بکوژن ولەگەڵ کەسدا بجەنگن ، هەتا کۆچی کرد بۆ مەدینە ، ئیتر ڕوخسەتی بەو موسڵمانانەش دا بەو ئایەتەی کە دەفەرمویێت : ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُواْۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ٣٩ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِم بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُۗ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَٰتٌ وَمَسَٰجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ كَثِيرًاۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ٤٠ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ أَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُواْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَنَهَوْاْ عَنِ ٱلْمُنكَرِۗ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ ٤١﴾(الحَجّ) .

واته : ڕوخسەت دراوە بەو کەسانەی کە ستەمیان لێکراوە بەجەنگان ، وخوداش بە توانایە بۆ سەرخستنیان ئەو کەسانەی کە لە ماڵەکانی خۆیان بەناڕەوا دەرکراون ، تەنها لەبەر ئەوەی دەیانگوت خودا پەروەردگارمانە ، ئەگەر خودا بەهۆی جەنگ وتێکۆشان ڕێگری لە بێبڕوا وهاوەڵ بڕیاردەرەکان نەکردبا ، ئەوا هەموو کڵێسا وپەرستگا گەورەکانی جولەکە وگاورەکان ومزگەوتی موسڵمانان کە یادی خودای تێدا دەکەن تێکدەدران ، هەرکەس ئاینەکەی خودا سەربخات خوداش سەری دەخات ، خودا بەهێز وبەتوانایە ، ئەو کەسانەی کە سەرمان خستن نوێژ دەکەن وزەکات دەدەن وفەرمان بەچاکە دەکەن ویاساغی خراپە دەکەن ، وسەرئەنجام وچارەنووسی هەمووان بۆ لای خودا دەگەڕێتەوە .

لە دوای ئەوەش خودا شەڕی لەسەر پێویست کردن بەو ئایەتە : ﴿كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِتَالُ وَهُوَ كُرۡهٞ لَّكُمۡۖ وَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ شَرّٞ لَّكُمۡۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ٢١٦﴾(البَقَرَة) .

واته : جەنگان لە دژی بێباوەڕان واجب وپێویست کراوە لەسەرتان کە پێتان ناخۆشە وقورسە لەسەرتان ، ولەوانەیە شتێکتان پێ ناخۆش بێت کە خێر وچاکە بێت بۆتان ،وشتێکتان پێ خۆش بێت کە شەڕ وخراپە بێت بۆتان،خودا دەزانێت وئێوە نازانن.

داکۆکی پێویست بوون وگەورەیی جیهاد وتێکۆشان لە هەموو سورەتە مەدەنییەکاندا هاتووە ، وبەخراپ باسی ئەو کەسانە دەکات کە وازی لێدەهێنن ووەسفیان دەکاتە بە دووڕوو ودڵ نەخۆش ، خودا دەفەرموێت : ﴿قُلۡ إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمۡ وَأَبۡنَآؤُكُمۡ وَإِخۡوَٰنُكُمۡ وَأَزۡوَٰجُكُمۡ وَعَشِيرَتُكُمۡ وَأَمۡوَٰلٌ ٱقۡتَرَفۡتُمُوهَا وَتِجَٰرَةٞ تَخۡشَوۡنَ كَسَادَهَا وَمَسَٰكِنُ تَرۡضَوۡنَهَآ أَحَبَّ إِلَيۡكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٖ فِي سَبِيلِهِۦ فَتَرَبَّصُواْ حَتَّىٰ يَأۡتِيَ ٱللَّهُ بِأَمۡرِهِۦۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ٢٤﴾(التَّوۡبَة) .

واتە : ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ : ئەگەر باوکانتان ومنداڵەکانتان وبراکانتان وژنەکانتان وخێڵ وعەشیرەتەکەتان وئەو ماڵ وسامانەی کە دەستتان کەوتووە وئەو بازرگانییەی کە دەترسن لە زەرەر وزیان ولەناوچوونی وماڵەکانتان کە پێی خۆشحاڵن ، خۆشەویستترە لەلاتان لە خودا وپێغەمبەرەکەی وتێکۆشان لەپێناوی خودا ، چاوەڕوانی سزای خودابن ، وخودا هیدایەتی لەڕێ دەرچووان نادات .

وخودای پەروەردگار دەفەرموێت : ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُواْ وَجَٰهَدُواْ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿١٥﴾﴾(الحُجُرَات).

واتە : ئەو باوەڕدارانەی باوەڕیان بە خودا وپێغەمبەرەکەی هێناوە ، وپاشان هیچ گومان لەدڵیاندا نییە ، وبە ماڵ وگیانیان لەپێناو ڕێگای خودا تێدەکۆشن بێگومان ئەوانە ڕاستگۆن .

وهەروەها دەفەرموێت : ﴿فَإِذَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ مُّحْكَمَةٌ وَذُكِرَ فِيهَا ٱلْقِتَالُ رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ نَظَرَ ٱلْمَغْشِيِّ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْمَوْتِۖ فَأَوْلَىٰ لَهُمْ ﴿٢٠﴾ طَاعَةٌ وَقَوْلٌ مَّعْرُوفٌۚ فَإِذَا عَزَمَ ٱلْأَمْرُ فَلَوْ صَدَقُواْ ٱللَّهَ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ ﴿٢١﴾ فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُواْ فِي ٱلْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوٓاْ أَرْحَامَكُمْ ﴿٢٢﴾﴾(مُحَمَّد) .

واتە : ئەگەر سورەتێکی ڕوون وئاشکرا دابەزێت وباسی جەنگی تێدا بکرێت ، دەبینی ئەو کەسانەی کە دڵیان نەخۆشە بەشێوەیەك سەیرت دەکەن چاویان ئەبڵەق بووە لەترسی مردن ، باشترە بۆیان گوێڕایەڵبن وقسەی باش بکەن ، ئەگەر کار لە کارترازا وجەنگ پێویست بوو لەسەریان ئەگەر ڕاست بکەن لەگەڵ خودا باشترە بۆیان

، ئەگەر پشتان لە باوەڕەکەتان کرد ودەستان کردە بشێوی نانەوە بە کوفر وهاوەڵ بڕیاردان وپچڕاندنی سیلەی ڕەحم ئەوە کارێکی خراپە .

لەم جۆرە ئایەتانە زۆرن لە قورئاندا .

وهەروەها خودای باڵادەست جیهادکردن وتێکۆشەرانی بەرز بە گەورە داناوە ، لە سورەتی (الصف)دا دەفەرموێت : ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ تِجَـٰرَةٍ تُنجِيكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ۝ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُجَـٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ۝ يَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَيُدْخِلْكُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ وَمَسَـٰكِنَ طَيِّبَةً فِى جَنَّـٰتِ عَدْنٍ ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ۝ وَأُخْرَىٰ تُحِبُّونَهَا ۖ نَصْرٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَتْحٌ قَرِيبٌ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۝﴾(الصَّفّ) .

واتە : ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ئایا ڕێگای بازرگانییەکتان پیشان بدەم کە لە سزای بە ئێش وئازار ڕزگارتان بکات ، باوەڕ بێنن بە خودا وپێغەمبەرەکەی ﷺ وتێبکۆشن لە پێناوی خودا بەماڵ وگیانتان ئەوە باشە بۆتان ئەگەر ئێوە بزانن ، خودا لە تاوانەکانتان دەبورێت ودەتانخاتە ناو بەهەشتێك کە ئاو بەژێر باخەکانیدا تێدەپەڕێت وماڵی خۆش جوان وڕازاوەی تێدایە ، ئەوە سەرکەوتنی گەورەیە ، شتێکی تریش کە حەزی لێ دەکەن ، ئەویش بەخشینی سەرکەوتنە لەلایەن خوداوە وزیاتر ڕزگار کردنی وڵاتانە بە خێرایی ، ئەی محمد ﷺ مژدەی پاداشت بدە بە باوەڕداران .

وئەو ئایەتانەی کە دەفەرموێت : ﴿أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ ٱلْحَآجِّ وَعِمَارَةَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ كَمَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَجَـٰهَدَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ لَا يَسْتَوُۥنَ عِندَ ٱللَّهِ ۗ

﴿وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ١٩ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ أَعۡظَمُ دَرَجَةً عِندَ ٱللَّهِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ ٢٠ يُبَشِّرُهُمۡ رَبُّهُم بِرَحۡمَةٖ مِّنۡهُ وَرِضۡوَٰنٖ وَجَنَّٰتٖ لَّهُمۡ فِيهَا نَعِيمٞ مُّقِيمٌ ٢١ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجۡرٌ عَظِيمٞ ٢٢﴾(التَّوبَة) .

واته : ئايا ئێوه ئاودان به حاجیان وئاوەدانکردنەوەی ماڵی خودا ، دەچوێنن بەکەسێك كه باوەڕی به خودا ورۆژی دوایی هێناوه وتێدەكۆشێت لە پێناوی ڕێگای خودا ، لای خودا چوونیەك ویەكسان نین ، خودا ڕێنمایی كۆمەڵی ستەمكار ناكات ، ئەو كەسانەی بڕوایان هێناوه وتێدەكۆشن لە پێناوی ڕێگای خودا به ماڵ وگیانیان ، پلەیان زۆر باڵایە لەلای خودا ، وئەوانە براوەن ، پەروەردگاریان مژدەی لێخۆش بوون وڕازیبوون وبەهەشتی ناز ونیعمەتی نەبڕاوەیان دەداتێ ، بەهەتاهەتایی تێیدا دەمێننەوە ، بە ڕاستی خودا پاداشتی گەورەی لایە.

وديسان دەفەرموێت : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرۡتَدَّ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَسَوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ يُحِبُّهُمۡ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ يُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوۡمَةَ لَآئِمٖۚ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ٥٤﴾(المَائِدَة) .

واته : ئەی ئەوانەی كه باوەڕتان هێناوه ، هەركەسێك لە ئێوه لە ئاینەكەی هەڵگەڕێتەوه ، ئەوا خودا خەڵكانێك دەهێنێت كه خۆشی دەوێن وئەوانیش خودایان خۆش دەوێت ، سەركزن بەرامبەر باوەڕداران ، وبەرامبەر بێباوەڕان سەربڵند وبەهێزن ، لە پێناوی ڕێگای خودا جیهاد دەكەن وتێدەكۆشن ، ولە لۆمەی هیچ لۆمەكارێك ناترسن ، ئەوه فەزڵی خودایە دەیبەخشێت بە هەركەسێك كه بیەوێت ، وخودا فەزڵی فراوانە وزانایە بەوەی كه كێ شایستەیە پێی ببەخشێت .

وديسان دەفەرموێت : ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ لَا يُصِيبُهُمْ ظَمَأٌ وَلَا نَصَبٌ وَلَا مَخْمَصَةٌ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَطَـُٔونَ مَوْطِئًا يَغِيظُ ٱلْكُفَّارَ وَلَا يَنَالُونَ مِنْ عَدُوٍّ نَّيْلًا إِلَّا كُتِبَ لَهُم بِهِۦ عَمَلٌ صَٰلِحٌ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٢٠﴾ وَلَا يُنفِقُونَ نَفَقَةً صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً وَلَا يَقْطَعُونَ وَادِيًا إِلَّا كُتِبَ لَهُمْ لِيَجْزِيَهُمُ ٱللَّهُ أَحْسَنَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٢١﴾﴾ (التَّوْبَةِ).

واته : تێکۆشەرانی ڕێگای خودا توشی تینوێتی وهیلاکی وبرسێتی نابن لـه پێناوی خودا ، وبچنه هەرشوێنێك کە بێبڕواکان پێیان ناخۆش بێت ، وهەرچیان لیّ بە دەستکەوت بگرن ، بەهەریەکە لـەوانە خودا کارێکی باشیان بۆ دەنووسێت ، خودا چاکەی چاکەکاران ون ناکات ، وئەوان هەرچی ببەخشن لـەگەورە وبچوك یان هەر شیوێك تێپەڕێنن ئیللا بۆیان دەنوسرێت ، بۆ ئەوەی خودا پاداشتی ئەو کارە باشانەیان بداتەوە .

بیربکەرەوە لـە ئەنجامی کارەکانی ئەوان چی دروست دەبێت ، وسەرئەنجام چ پاداشتێکیان دەست دەکەوێت ، وفەرمانکردن بەجیهاد وتێکۆشان وباسی خێر وچاکەی لـە قورئان وسوننەتدا زۆرترە لـەوەی بتوانرێت هەمووی لـە شوێنێکدا باس بکرێت .

لـەبەر ئەوە باشترین کاری سوننەتە کە مرۆڤ ئەنجامی بدات ، وزانایان کۆکن لـەسەر ئەوەی کە باشترە لـە حەج وعومرە ، ولـە نوێژی سوننەت وڕۆژووی سوننەت ، وەك چۆن قورئان وسوننەتیش بەڵگەن لـەسەر ئەوە ، هەتا پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : ((رأس الأمر الإسلام ، وعموده الصلاة ، وذروة سنامه الجهاد))[١٣٦].

واته : گەواهیدانی ئیسلام سەری هەموو شتەکانە ، ونوێژیش کۆڵەکەیەتی وجیهاد وتێکۆشان لوتکەیە وبەرزترین کارە .

---

١٣٦. رواه الترمذي (٢٦١٦) ، وابن ماجه(٣٩٧٣) ، وصححه الألباني في (صحيح الجامع) (٥١٣٦).

وفەرموویەتی : (( إن في الجنة لمائة درجة ، ما بين الدرجة والدرجة ، كما بين السماء والأرض ، أعدها الله للمجاهدين في سبيله ))[137].

واتە : لە بەھەشتدا سەد پلە ھەیە ، نێوان ھەرپلەیەك بۆ پلەیەكی تر ، وەك نێوانی ئاسمان وزەویە ، خودا ئامادەی كردووە بۆ ئەو كەسانەی لە پێناوی ئاینی خودا ﷻ تێدەكۆشن .

وفەرموویەتی : (( من اغبرت قدماه في سبيل الله حرمه الله على النار ))[138].

واتە:ئەوەی پێیەكانی لە پێناوی خودادا تۆزاوی بكات خودا ئاگری لەسەر حەرام دەكات.

وھەروەھا فەرموویەتی : (( رباط يوم وليلة في سبيل الله خير من صيام شهر وقيامه ، وإن مات أجري عليه عمله الذي كان يعمله ، وأجري عليه رزقه ، وأمن الفتان ))[139].

واتە : چاودێری كردن وپاسەوانی شەو ورۆژێك لە پێناوی خودا خێری زیاترە لە ڕۆژوو وشەونوێژی مانگێك ، ئەگەر بمرێ ئەو كارەی كە لەسەری بووە دوای مردنیش ھەر پاداشتی بۆ دەنوسرێت ، ورۆزیشی بەردەوام دەبێت ، ولە سزای ناو گۆڕیش ڕزگاری دەبێت .

ولە سونەنەكاندا دەفەرموێت : (( رباط يوم في سبيل الله ، خير من ألف يوم فيما سواه من المنازل ))[140].

واتە : چاودێری كردنی وپاسەوانی ڕۆژێك لە پێناوی خودا ، باشترە لە ھەزار ڕۆژ لە ڕۆژانی ماڵەوە .

---

137. رواه البخاري(2559) ، ومسلم(2612).

138. رواه البخاري(907).

139. رواه مسلم(1913).

140. رواه الترمذي(1667) ، والنسائي(3169) ، وقال الألباني في (صحيح الترغيب)(1224) : حسن لغيره.

وفەرموویەتی : (( عينان لا تمسهما النار ، عين بكت من خشية الله ، وعين باتت تحرس في سبيل الله ))[141].

واتە : دوو چاو ئاگریان بەرناکەوێت ونایان سوتێنێ ، چاوێك لەبەر ترسی خودا بگری ، وچاوێك چاودێری بکات لە ڕێگای خودا .

وفەرموویەتی : ((حرس ليلة في سبيل الله ، أفضل من ألف ليلة يقام ليلها ، ويصام نهارها))[142].

واتە : چاودێری کردنی شەوێك لە پێناوی خودا ، باشترە لە هەزار شەو ، شەونوێژی تیادا بکرێت ، وڕۆژەکەشی ڕۆژووی تیادا بگیرێت .

ولە هەر دوو صەحیحەکەدا هاتووە : (( أن رجلاً قال : يا رسول الله ، أخبرني بشيء يعدل الجهاد في سبيل الله ، قال : لا تستطيع ، قال : أخبرني به قال : هل تستطيع إذا خرج المجاهد أن تصوم لا تفطر ، وتقوم لا تفتر ؟ قال لا ، قال : فذلك الذي يعدل الجهاد))[143].

واتە : پیاوێك وتی : ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ، هەواڵم بدەرێ دەربارەی کردەوەیەك هاوتای تێکۆشان بێت لە پێناوی خودا ؟ ، فەرمووی : ناتوانیت پێی هەستیت ، وتم : پێم بڵێ ، فەرمووی : ئایا دەتوانیت ئەگەر تێکۆشەر لە ماڵ دەرچوو بۆ تێکۆشان لە پێناوی خودا بە ڕۆژوو بیت ونەیشکێنیت وشەونوێژ بکەیت وکۆڵ نەدەیت ، وتی : نەخێر ، فەرمووی : ئەوە هاوتای تێکۆشانە لە پێناوی خودا .

---

١٤١. رواه الترمذي (١٦٣٩) ، وصححه الألباني في (صحيح الجامع)(٤١١٢).

١٤٢. رواه احمد (٤٣٥) ، وضعفه الألباني في (ضعيف الجامع)(٢٧٠٤).

١٤٣. رواه البخاري(٢٧٨٥) ، ومسلم(١٨٧٨).

ولـه سونەنەكاندا دەفەرمویێت : ((إن لكل أمة سياحة ، وسياحة أمتي الجهاد في سبيل الله))[١٤٤].

واته : هەموو گەلێك گەشت وگوزاری هەیە ، گەشت وگوزاری ئوممەتەكەی من تێكۆشانە لـە پێناوی خودا .

ئەم بابەتە زۆر فراوانە ، وهیچ كردەوەیەك نییە لـە شەریعەتدا هێندەی تێكۆشان لـە پێناوی خودا پاداشت وچاكەی لـە قورئان وسوننەتدا باسكرابێت ، چونكە قازانجی تێكۆشان لـە پێناوی خودا گشتییە بۆ ئەو كەسەی پێی هەڵدەستێت وخەڵكی تریش لـە دونیا وئایینیشدا ، وكۆكراوەیەكە لـە كردەوەی ئاشكرا وپەنهان ، چونكە پێكدێت لـە خۆشەویستی ودڵسۆزی ، وپشت بەستن ، وملكەچ كردنی ماڵ وگیان بۆ خودا ، وهەروەها ئارامگرتن ودونیا نەویستی ویادی خودا وهەموو جۆرەكانی كردەوەی باش ، بە جۆرێكە هیچ كردەوەیەكی تر ئەو سیفەتانە لـە خۆی ناگرێت .

وئەو كەسەی پێی هەڵدەستێت تاك بێت یان كۆمەڵ لـە دوو شت بەدەرنابێت : یان سەركەوتن ، یان شەهیدبوون ودەستكەوتنی بەهەشت ، وهەموو خەڵكی دەبێت بمرن ، ولـە تێكۆشان لـەپێناوی خودادا ژیان ومردن بەكاردێت بۆ ئەوەی كە ئاسوودەی دونیا ودوارۆژیشی فەراهەم بێت ، ولـە وازهێنان لـە تێكۆشان خۆشی دونیا وپاداشتی دوارۆژیش بەدەست نایەت یان كەم دەبێتەوە ، وهەندێك خەڵك حەز لـە كاری سەخت ودژوار دەكەن لـەگەڵ كەمی سود وقازانجی ، بەڵام تێكۆشان لـە هەموو كارە سەختەكان بەسوودترە ، هەندێك جار بۆ ئاسودەیی دەروون بەكاردێت هەتاكو مردن دێتە رێی ، چونكە مردنی شەهید لـە هەموو جۆرە مردنەكان ئاسانترە ، وباشترین مردنە .

---

١٤٤. رواه أبوداود(٢٤٨٦) من حديث أبي أمامة رضي الله عنه ، ولفظه : أن رجلاً قال : يارسول الله ائذن لي في السياحة ، فقال النبي صلى الله عليه وسلم : ((إن سياحة أمتي الجهاد في سبيل الله تعالى))وصححه الألباني في (صحيح الجامع)(٢٠٩٣).

ئەگەر بنچینەی جەنگی ڕەوا تێکۆشان بێت لە پێناوی خودا ، وئامانجیشی ئەوە بێت تەنها خودا بپەرسترێت ، وبۆ ئەوەی وشەی خودا بەرز وبڵند بێت ، هەرکەس ڕێگری لەوە بکات ئەوە جەنگ لە دژی بەرپا دەکرێت ، موسڵمانان لەسەر ئەوە کۆکن ، بەڵام هەر کەسێك نەبێتە ڕێگر ودژکار وجەنگاوەر ، وەك ئافرەت ومنداڵ وقەشە وپیر وکوێر ونەخۆش هاوشێوەی ئەمانە ، لەلای زۆربەی زانایان ناکوژرێن وسزانادرێن ، مەگەر جەنگاوەربن بەکردەوە یان بە وتە ، ئەگەرچی هەندێك وادەبینن کە جەنگ لە دژی هەمووانە ، جگە لە ئافرەت ومنداڵ کە دەبنە ماڵ وسامانی موسڵمانان ، وڕای یەکەمیان پەسەندترە ، چونکە شەڕ بۆ کەسێکە کە دەجەنگێت لە دژمان ، ئەگەر ویستمان ئاینی خودا سەربخەین وەك خودای پەروەردگار دەفەرموێت : ﴿وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ١٩٠﴾(البَقَرَةِ) .

واتە : بجەنگن لە پێناوی خودا لەگەڵ ئەو کەسانەی کە لەگەڵتاندا دەجەنگن ، وستەم مەکەن ، چونکە بە ڕاستی خودا ستەمکارانی خۆشناوێت .

ولە سونەنەکاندا لە پێغەمبەری خودایان ﷺ گێڕاوەتەوە : ((أنه مر على امرأة مقتولة في بعض مغازيه ، قد وقف عليها الناس ، فقال : ما كانت هذه لتقاتل ، وقال لأحدهم : إلحق خالداً فقل له : لا تقتلوا ذرية ولا عسيفاً ))[١٤٥].

واتە : لە یەکێك لە جەنگانیدا بەلای ئافرەتێکی کوژراودا تێپەڕی ، خەڵك لەسەری وەستابوون ، فەرمووی : نە دەبوو ئەمە بکوژرایە ، وبە یەکێکی فەرموو : بگە بە خالد وپێی ڕابگەیەنە : کە ئافرەت وکرێکار نەکوژێت .

---

١٤٥. رواه أبوداود (٢٦٦٩) ، وابن ماجه(٢٨٤٢) ، وصححه الألباني في (الصحيحة)(٧٠١).

وديسان دەفەرمویت : (( لا تقتلوا شيخاً فانياً ، ولا طفلاً صغيراً،ولا امرأة ))[١٤٦].

واته : پیاوی پیر ومندالی بچووك وئافرەت مەكوژن ، بەلاّم خودای بالاّدەست ڕێگای بەكوشتنی كەسانێك داوه ، كه دەبنه ڕێگر لەچاك بوونی خەلّك ، وەك دەفەرمویت : ﴿وَٱلْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ ٱلْقَتْلِ ﴿٢١٧﴾﴾(البَقَرَةِ) .

واته : هاوەلّ بڕیاردان وقەلاّچۆكردنی موسلّمانان لە كوشتن گەورەتره .

كوشتن ئەگەرچی شەڕ وئاشوب نانەوەیه ، بەلاّم لە ئاشوبی ئەو بێبڕوایانه باشتره كه موسلّمانان قەلاّچۆدەكەن ، ئەگەر كەسێك ڕێگری لە موسلّمانان نەكات لە بەجێهێنانی ئەركە ئاینیەكانیان ، ئەوكات بێبڕواییەكەی تەنها زیانی بۆ خودی خۆی دەبێت ، لەبەر ئەوە شەرعناسان دەلّێن : ئەو كەسەی بانگەواز بۆ شتێكی داهێنراوی (البدعة) پێچەوانەی قورئان وسوننەت دەكات سەرزەنشت كردنی توندتر وجیاوازتره لەو كەسەی بێدەنگە وبانگەوازی بۆ ناكات .

ولە فەرموودەیەكدا هاتووه : (( أن الخطيئة إذا أخفيت لم تضر إلا صاحبها ولكن إذا ظهرت فلم تنكر ضرت العامة ))[١٤٧].

واته : تاوانكردن ئەگەر شارایەوه تەنها زیان بەخاوەنەكەی دەگەیەنێت ، بەلاّم ئەگەر ئاشكرابوو وبەرهەلّستی نەكرا زیان بەهەمووان دەگەیەنێت .

لەبەر ئەوە شەریعەت كوشتنی بێ بڕواكانی پێویست كردووه ، بەلاّم پێویستی نەكردووه هەریەكەیان دەستی ڕۆیشت بەسەریدا بكوژرێت ، بەلّكو ئەگەر یەكێكیان لە

---

١٤٦. رواه أبوداود (٢٦١٤) ، وضعفه الألباني في (ضعيف الجامع)(١٣٤٦).

١٤٧. رواه الطبراني ، وقال الألباني في (ضعيف الجامع)(٤٨٠) : (موضوع).

جەنگدا یان جگە لە جەنگیش گیرا ، وەك ئەوەی لە کەشتیەکدا ئاو بیهێنێت ، یان ڕێگا ون بکات ، یان بەفێڵێك بگیرێت ، ئەو کاتە دەسەڵاتداری موسڵمانان چی بە باش بزانێت بەو شێوەیە ڕەفتاری لەگەڵدا دەکات ، لە کوشتنی یان کردنی بەکۆیلە یان ئازادکردنی یان گۆڕینەوە بەپارە یان ئازادکردنی لە جیاتی کەسێك لای زۆربەی زانایان ، وقورئان وسوننەتیش بەڵگەن لەسەر ئەوە ، ئەگەرچی هەندێك زانا وا دەبینن کە حوکمی ئازادکردن وگۆڕینەوە هەڵگیراوە (منسوخ) ونەماوە .

بەڵام خاوەن کتێبەکان (جولەکە وگاور) وئاگرپەرستان لەگەڵیاندا شەڕ دەکرێت ، تا موسڵمان دەبن یان باج دەدەن بە دەستی خۆیان بەسەرشۆڕی ورِسوایی ورِەزامەندیان.

بێجگە لەوان زانایان ناکۆکن لە وەرگرتنی باج لێیان ، بەڵام زۆربەیان دەڵێن : لە نەتەوەی عەرەب باج وەرناگیرێت[١٤٨] ، بەڵکو هەر نەتەوەیەك پێشتر موسڵمان بوو ، پاشان لە ئەنجامدانی هەندێك لە ئەرکە ئاشکرا وگەورەکانی ئیسلام پاشگەز بوونەوە ، ئەوکاتە پێویستە شەڕیان لەگەڵدا بکرێت ، موسڵمانان کۆڕان لەسەر ئەوە ، بۆ ئەوەی تەنها ئاین ئاینی خودا بێت ، وەك چۆن ئەبوبەکری صدیق رضي الله عنه وهەموو هاوەڵان رضي الله عنهم لە دژی ئەو کەسانە جەنگان کە زەکاتی ماڵەکانیان نەدەدا "لە سەرەتادا هەندێك لە هاوەڵان لەشەڕکردن لە دژیان ڕاوەستان" دواتر هەموویان ڕایان هاتە سەر ئەوەی کە لە دژیان بجەنگن ، عومەری کوڕی خەتاب بە ئەبوبەکری گوت رضي الله عنهما :
((کیف تقاتل الناس وقد قال رسول الله صلى الله عليه وسلم : أمرت أن أقاتل الناس حتى يشهدوا أن لا إله إلا الله وأن محمدا رسول الله ، فإذا قالوها ، فقد عصموا مني دماءهم وأموالهم إلا بحقها

١٤٨. ابن عثیمین دەڵێت : مەبەستی شێخ الإسلام ئەوەیە لەگەڵیاندا جەنگ بەرپا دەکرێت بۆ ئەوەی تەنها خودا بپەرسترێت ، ئەگەرچی ئەوانەی لەگەڵیاندا دەجەنگین بێباوەڕبن یان موسڵمان وەك جەنگی خەوارجەکان.

وحسابهم على الله ، فقال له أبو بكر : فإن الزكاة من حقها ، والله لو منعوني عناقاً كانوا يؤدونها إلى رسول الله ﷺ لقاتلتهم على منعهم قال عمر : فما هو إلا أن رأيت الله قد شرح صدر أبي بكر للقتال ، فعلمت أنه الحق ))[149].

واته : چۆن لەگەڵ خەڵكدا دەجەنگیت لە كاتێكدا پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی : فەرمانتان پێدەكەم كە لەگەڵ خەڵكدا بجەنگن ، تا گەواهی دەدەن هیچ پەرستراوێك جگە لە خودا شیاوی پەرستن نییە ومحمد ﷺ نێردراوی خودایە ، ئەگەر دانیان بەوەدا نا ، ئەوا خوێن وماڵیان پارێزراو دەبێت مەگەر لەبەر مافی گەواهی دانەكە نەبێت ، ئەبو بەكر فەرمووی : زەكات لە مافەكانی گەواهیدانە ، سوێند بەخودا ئەگەر گیسكێك نەدەن بەمن كە بەپێغەمبەری خودایان دەدا ﷺ ، لەسەر ئەوە لەگەڵیاندا دەجەنگم ، عومەر دەڵێت : هەستم كرد خودا دڵی ئەبوبەكری ڕێنمایی كردبوو بۆ جەنگان لەگەڵیان ، ئیتر زانیم ئەوە ڕەوایە .

ولە چەندان ڕیوایەتی صەحیحدا گێڕدراوەتەوە كە فەرمانی بەكوشتنی خەوارجەكان كردووە ، لە هەردوو صەحیحەكەدا لە عەلی كوڕی ئەبو تالیبەوە رضي الله عنه دەڵێت : گوێم لە پێغەمبەری خودا بوو ﷺ دەیفەرموو : (( سيخرج قوم في آخر الزمان حداث الأسنان ، سفهاء الأحلام يقولون من قول خير البرية ، لا يجاوز إيمانهم حناجرهم ، يمرقون من الدين كما يمرق السهم من الرمية ، فأينما لقيتموهم فاقتلوهم ، فإن في قتلهم أجراً لمن قتلهم يوم القيامة ))[150] وفي رواية لمسلم عن علي رضي الله عنه قال : سمعت رسول الله ﷺ يقول : (( يخرج قوم من أمتي يقرءون القرآن ليس قراءتكم إلى قراءتهم بشيء ، ولا صلاتكم إلى صلاتهم بشيء ، يقرءون القرآن يحسبون أنه لهم وهو عليهم ، لا تجاوز

---

١٤٩. رواه البخاري(١٣٩٩ ، ١٤٠٠) ، ومسلم(٢٠).

١٥٠. رواه البخاري(٣٦١١) ، ومسلم(١٠٦٦).

قراءتهم تراقيهم ، يمرقون من الإسلام كما يمرق السهم من الرمية ، لو يعلم الجيش الذين يصيبونهم ما قضى لهم على لسان نبيهم لنكلوا عن العمل ))[١٥١].

واته : لە كۆتایی ژیاندا كۆمەڵێك پەیدا دەبن ، هەرزە وكەم تەمەنن ، وژیرنین ، باوەڕەكەیان لە گەروویان تێناپەڕێت ، لە ئاین دەردەچن وەك چۆن تیر لە كەوانەكەی دەردەچێت ، لە هەركوێیەك پێیان گەیشتن بیانكوژن ، چونكە هەركەسێك لەوانە بكوژێت پاداشتی دەست دەكەوێت لە قیامەتدا .

ولە ڕیواتی موسلم دا عەلی رضي الله عنه دەڵێت : گوێم لە پێغەمبەری خودا ﷺ بوو دەیفەرموو : كۆمەڵێك لە ئوممەتەكەی من دەردەچن قورئان دەخوێنن ، لەگەڵ قورئان خوێندنەكەی ئێوەدا بەراورد بكرێت ئەوەی ئێوە هیچ نییە لە چاو ئەوەی ئەوان ، وئەگەر نوێژیان لەگەڵ نوێژی ئێوە بەراورد بكرێت ئەوەی  ئێوە هیچ نییە لە چاو ئەوەی ئەوان ، قورئان دەخوێنن وا دەزانن بەڵگەیە بۆ ئەوان بەلاَم بەڵگەیە لەسەریان ، قورئان خوێندنەكەیان لە گەروویان تێناپەڕێت لە ئیسلام دەردەچن وەك چۆن تیر لەكەوانەكەی دەردەچێت ، ئەگەر ئەو سوپایەی كە لە دژیان دەجەنگێت بزانن چیان بۆ بڕیار دراوە لەسەر زاری پێغەمبەرەكەیان ﷺ وازیان لە ئیش وكار دەهێنا  وخۆیان تەرخان دەكرد بۆ جەنگان لە دژی ئەو لە ئاین دەرچووانە .

وئەبوسەعیدیش رضي الله عنه ئەم فەرموودەی لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ گێڕاوەتەوە كە فەرموویەتی : (( يقتلون أهل الإسلام ، ويدعون أهل الأوثان ، لئن أدركتهم لأقتلنهم قتل عاد ))[١٥٢] ، وفي رواية لمسلم : (( تكون أمتي فرقتين فتخرج من بينهما مارقة ، يلي قتلهم أولى الطائفتين بالحق ))[١٥٣].

---

١٥١. رواه مسلم(١٠٦٦).

١٥٢. رواه البخاري(٣٣٤٤) ، ومسلم(١٠٦٤).

١٥٣. رواه مسلم(١٠٦٦).

واته : لەگەڵ گەلی موسڵماندا دەجەنگن ، وواز لەگەلی بتپەرست دەهێنن ، ئەگەر پێیان گەیشتم وەکو گەلی عاد لەناویان دەبەم .

ولە ڕیوایەتی موسلم دا : ئومەتەکەم دەبێتە دوو کۆمەڵەوە لە نێوانیاندا کەسانێکی لە ڕێگا دەرچوو پەیدا دەبن ، ئەو کۆمەڵەی لەگەڵ ئەم لە ڕێگا دەرچووانەدا دەجەنگێت لەسەر حەق وڕاستیە .

ئەو کەسانەی فەرمانڕەوای موسڵمانان عەلی ﷺ کوشتیانی کاتێك جیاوازی کەوتە نێوان خەڵکی شام وعێراقەوە وبە(الحرورية) ناودەبران ، پێغەمبەری خودا ﷺ ڕوونی کردەوە کە هەردوو کۆمەڵە جیاوازەکە لە ئومەتی ئەون ، وعەلی ﷺ وهاوەڵانی لەسەر حەقن ، وهانی داون تەنها لەگەڵ ئەو توندڕەوە وڕۆچووانەدا بجەنگن کە لە ئیسلام دەرچوون ، ولە کۆمەڵی موسڵمانان جیاواز بوون ، ومالْ وخوێنی موسڵمانانی جگە لە خۆیان حەڵاڵ کردبوو ، وبە قورئان وسوننەت وکۆڕاش جێگیر بووە ، هەرکەس لە شەریعەتی ئیسلام دەربچێت دەکوژرێت ، ئەگەر هەردوو گەواهیەکەش بدات (الشهادتين) .

شەرعناسان ناکۆکن لە کۆمەڵێك کە وازبهێنن لە سوننەتێکی هەمیشەیی وەك دوو ڕکات نوێژی پێش نوێژی بەیانی ، ئایا دروستە بکوژرێت ؟ دوو بۆچوونیان هەیە : ئەگەر واز لە ئەرکە پێویستەکان(واجبات) بهێنن وحەرامە ئاشکرا باوەکان ئەنجام بدەن ، لەسەری دەکوژرێن بەکۆڕا ، هەتا نوێژە فەرزەکان ئەنجام دەدەن وزەکاتی ماڵەکانیان دەردەکەن ، وڕۆژووی ڕەمەزان دەگرن ، وحەجی ماڵی خودا دەکەن ، وواز لە حەرام دەهێنن وەك خواستنی خوشك وخواردنی پیسی ودەست درێژی کردنە سەرماڵ وحاڵی موسڵمانان ... هتد .

جەنگان لەگەڵ ئەوانە پێویستە موسڵمانان دەست پێشخەربن تیایدا ، دوای ئەوەی بانگەوازی پێغەمبەری خودایان ﷺ پیٚ ڕادەگەیەنرێت کە لەسەر چی لەگەڵیاندا شەڕدەکرێت ، ئەگەر ئەوان دەست پێشخەر بوون ، ئەوکاتە جەنگان لەگەڵیان وکوشتنیان پێویستتر دەبێت وەك پێشتر باسمان کرد لە باسی ئەوانەی زەکات نادەن یان ستەم دەکەن یان چەتە وڕێگرن .

وباشترین تێکۆشان ئەوەیە لە دژی بێبڕواکان بێت ئەوانەی کە لە هەندێك لە شەریعەت ڕێگا دەگرن ، وەك ئەو کەسانەی زەکات نادەن ، وخەوارجەکان وهاوشێوەکانیان ، جیهاد لەدژی ئەوانە پێویستە موسڵمانان تیایدا دەست پێشخەربن بۆ نەهێشتنی ئەو لەڕێگا دەرچووانە ، ئەگەر موسڵمانان دەست پێشخەر بوون ئەوکاتە دەبێتە (فەرزی کیفایة) ئەگەر هەندێك پێی هەستن لەسەر ئەوانی تر دەکەوێت ، وپاداشت دەستی ئەوانە دەکەوێت کە پێی هەستاون ، وخودا دەفەرموێت : ﴿لَّا يَسْتَوِى ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُو۟لِى ٱلضَّرَرِ ﴿٩٥﴾﴾(النِّسَاءِ) .

واتە : وەك یەك ویەکسان نین ئەوانەی لە ماڵی خۆیان دانیشتوون لە باوەڕداران جگە لەو کەسانەی بەهانەیان هەیە ،وتێکۆشەران وموجاهیدەکانی ڕێگای خودا بە سەر وماڵیان.

بەڵام ئەگەر دوژمن هێرشی کردە سەر موسڵمانان ، ئەوکاتە بەرەنگاری کردنیان پێویست دەبێت لەسەر هەمووان وەك خودا دەفەرموێت : ﴿وَإِنِ ٱسْتَنصَرُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ فَعَلَيْكُمُ ٱلنَّصْرُ إِلَّا عَلَىٰ قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَٰقٌ ﴿٧٢﴾﴾(الأنفَال) .

واتە : ئەگەر داوایان لێکردن سەریان بخەن ویارمەتیان بدەن لەبەر ئاینەکەیان پێویستە لەسەرتان یارمەتیان بدەن ، مەگەر ئەو داوایە لەدژی کۆمەڵێك بێت کە بەڵێن وپەیمان هەبێت لە نێوانتاندا .

وهەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی کردووە بە سەرخستنی موسڵمانان ، وجیاوازی نییە ئەگەر ئەو داواکاریە لە لایەن کەسێکی بە کرێگیراو بۆ جەنگ بێت یان نا ، وەك یەکە ، ولەسەر هەریەکێك بەگوێرەی توانا پێویستە لە نەفس ومالّی زۆر یان کەم ، بە سواری یان بە پیادە ، وەك چۆن موسڵمانان کاتێك دوژمنان سالّی خەندەق ویستیان هێرش بێننە سەر مەدینە ، خودا ڕوخسەتی کەسی نەدا ، وەك ڕێگای بە هەندێك داوە بە جیهاد نەکردن بۆ ئەو کاتانە کە موسڵمانان تیایدا دەست پێشخەرن ، خودای پەروەردگار موسڵمانانی لەم بارەشدا کردووەتە دوو بەشەوە : ئەوانەی دانیشتوون وئەوانەی بۆ تێکۆشان دەرچوون ، وسەرزەنشتی ئەوانەی کردووە کە داوای ڕوخسەت لە پێغەمبەری خودا ﷺ دەکەن بۆ ئەوەی بۆ جیهادکردن دەرنەچن : ﴿يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ وَمَا هِيَ بِعَوْرَةٍ إِن يُرِيدُونَ إِلَّا فِرَارًا ﴿١٣﴾﴾(الأحزاب).

واتە : دەڵێن : دەترسین لە ماڵەکانمان وهیچ پەرژینێکی نیە لە دوژمنان بیپارێزێت ، بەڵام وانییە ، بەڵکو دەیانەوێت پشت هەڵکەن وهەڵبێن .

ئەوە بەرگری کردنە لە ئایین وناموس ونەفسیش ، ئەوە شەڕی ناچارییە ، بەڵام شەڕی نەسەپێنراو بۆ بەرز ڕاگرتنی ئاین وترساندنی دوژمنانە وەك جەنگی تەبوك وهاوشێوەکانی ، ئەمە جۆرێکە لە سزادان بۆ ئەو نەتەوانەی ڕێگرن لە ئاینی خودا ، بەڵام ئەوانەی کە ڕێگرنین وەك دانیشتوانی وڵاتانی موسڵمان وهاوشێوەکانی پێویستە پابەند بکرێن بە ئەنجامدانی پێنج پایەکەی ئیسلام وفەرمانەکانی تری ، وەك بەجێگەیاندنی ڕاسپاردە ونەشکاندنی پەیمان لە کڕین وفرۆشتن وپرسەکانی تریش .

هەرکەسێك نوێژ نەکات پیاو بێت یان ژن فەرمانی پێدەکرێت بە نوێژکردن ، ئەگەر نەیکرد سزادەدرێت بەکۆڕای زانایان ، ئینجا دوای ئەوە زۆربەیان دەڵێن : دەبێت

داوای پەشیمان بوونەوە وتەوبەکردنی لێبکرێت ئەگەر تەوبەی نەکرد ونوێژی نەکرد دەکوژرێت ، وئایا دەکوژرێت وەك بێباوەڕێکی لە ئاین دەرچوو (مرتد) یان بە موسڵمانێکی تاوانبار ؟ دوو بۆچوونی باو هەیە لە مەزهەبی ئەحمەد وئەوانی تر ، ئەوەی لە زۆربەی پێشینان (السلف) گێڕدراوەتەوە ئەوەیە : پێی بێباوەڕ دەبێت ، ئەمە لە کاتێکدا دانی پێدابنێ کە نوێژ پێویستە لەسەری بەڵام هەرکەسێك نکوڵی پێویستی (واجب) بوونی نوێژ بکات بێباوەڕە بە کۆڕا ، وپێویستە لەسەر کەسوکاری منداڵ فەرمانیان پێبکەن بە نوێژکردن ئەگەر تەمەنیان گەیشتە حەوت ساڵان ، ولە تەمەنی دەساڵیدا ئەگەر ئەنجامیان نەدا پێویستە لێیان بدرێت لەسەر نوێژ ، وەك پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی کردووە ودەفەرموێت : (( مروهم بالصلاة لسبع ، واضربوهم عليها لعشر ، وفرقوا بينهم في المضاجع ))[١٥٤].

واتە : فەرمانیان پێبکەن بە نوێژکردن لە تەمەنی حەوت ساڵیدا ، ولە دە ساڵیدا لێیان بدەن لەسەری ، وکوڕ وکچ لەو تەمەنەدا جێگەی خەویان جیا بکەنەوە .

وهەروەها هەموو ئەو شتانە کە پێویستی نوێژە وەك خۆپاك ڕاگرتن وپێداویستیەکانی تریش ، وبۆ تەواو ڕاپەڕاندنی ئەو کارانەش پێویستە چاودێری مزگەوتی موسڵمانان وپێش نوێژ ووتارخوێنەکانی بکرێت ، وفەرمانیان پێبکرێت کە وەك پێغەمبەری خودا ﷺ نوێژ بۆ خەڵکی بکەن چونکە فەرموویەتی : (( صلوا كما رأيتموني أصلي ))[١٥٥].

واتە : نوێژ بکەن وەك چۆن منتان بینی نوێژ دەکەم .

---

١٥٤. رواه أبوداود(٤٩٥) ، وصححه الألباني في (الإرواء)(٢٩٨).

١٥٥. رواه البخاري(٦٣١).

وجارێك لـه لایەكی مینبەرەكەیەوە نوێژی بە هاوەڵانی كرد و پێی فەرموون : (( إنما فعلت هذا لتأتموا بي ولتعلموا صلاتي ))[156].

واتە : لەبەر ئەوە وام كرد كە چاوم لێبكەن وشێوازی نوێژەكەم فێربن .

ولەسەر پێشەوای خەڵك لە نوێژ وكاروباری تریشدا پێویستە سەیری حاڵی خەڵكەكە بكات ، هیچ شتێك پشت گوێ نەخات كە نەكردنی ببێتە مایەی لە دەست دانی تەواوی (كمال) ئاینی خەڵكی ، وپێویستە لەسەر هەموو پێش نوێژێك نوێژێكی تەواو ورێك وپێك بۆ خەڵكی بكات ، وبەڵكو پێویستە لەسەر هەموو پێش نوێژێك(إمام) نوێژێكی تەواویان بۆ ئەنجام بدات ، ونابێت نوێژەكەی وەك نوێژی كەسێك بێت كە بە تەنها نوێژ ئەنجام دەدات لەبەر عوزرێك نەبێت ، وهەروەها لە حەجدا ، ولەسەركردایەتی جەنگدا ، زانراوە كە بریكار وكۆیلە لە كڕین وفرۆشتندا ، پێویستە لەسەریان بەو شێوەیە ڕەفتار بكەن كە بۆ سەرمایەی خاوەن ئیشەكەیان شیاوبێت ؟ ئەو لە ماڵی تایبەتی خۆیدا بە باشترین شێوە كرداری لەگەڵدا دەكات چەندە بتوانێت خۆی لەگەڵدا ماندوو دەكات ، كاروباری ئاین پێویست ترە ، شەرعناسانیش باسی ئەمەیان كردووە .

وهەرچ كاتێك كاربەدەستان گرنگیان بە ئاینی خەڵك دا ، ئەوكاتە ئاین ودونیای بەرپرسان وخەڵكیش باش دەبێت ، ئەگەرنا هەموو ئیش وكارەكانیان تێك دەچێت وبەڕێوە ناچێت ، وناوكرۆكی هەموو ئەوانە خزمەت گوزاری خەڵكیە بە نییەتێكی ساف وپاك ، ومەبەست تەنها ڕەزامەندی پەروەردگارە ، وتەنها پشت بە ئەو دەبەسترێت ، چونكە ئەنجامدانی كار تەنها لەبەر ڕەزامەندی پەروەردگار وپشت

---

156. رواه البخاري(917) ، ومسلم(544).

پێبەستنیەتی ، کە گەنجینە وسەرچاوەی باشی هەمووانە ، وەك فەرمانمان پێدەکات لە نوێژەکانماندا بلێین : ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ۝٥﴾(الفَاتِحَة) .

واتە : تەنها تۆ دەپەرستین وتەنها بە تۆ پشت دەبەستین .

چونکە وتراوە ئەو دوو وشەیە کۆکەرەوەی مانای هەموو ئەو کتێبانەیە کە لە ئاسمان دابەزیون ، وگێڕدراوەتەوە لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ ، جارێك لە یەکێك لە جەنگەکاندا فەرمووی : (( يا مالك يوم الدين ، إياك نعبد ، وإياك نستعين ))[157].

واتە : ئەی پادشای ڕۆژی دوایی ، تەنها تۆ دەپەرستین ،وتەنها پشت بە تۆ دەبەستین.

بەوەش سەری دوژمنانی پێ شۆڕ بوو ، وخودا لە زۆر شوێنی قورئاندا ئەوەی باسکردووە وەك دەفەرمویێت : ﴿فَٱعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ ۝١٢٣﴾ (هُود) .

واتە : بیپەرستن وپشت بە ئەو ببەستن ،

ودەفەرموێت : ﴿عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ۝٨٨﴾(هُود) .

واتە : پشت بە خودا دەبەستم وبۆ لای ئەو دەگەڕێمەوە .

وپێغەمبەری خودا ﷺ کاتێك قوربانی بکردایە دەیفەرموو : ((اللهم منك ولك))[158].

واتە : ئەی پەروەردگار ئەمە تۆ پێمانت بەخشیوە ، ولە بەرتۆ دەیکەم بە قوربانی .

---

١٥٧. رواه الطبراني في المعجم الأوسط(٨١٦٣) ، وضعفه الألباني في (الضعيفة)(٥١٠٦).

١٥٨. رواه أبوداود(٢٧٩٥) ، وابن ماجه (٣١٢١) ، وضعفه الألباني في (ضعيف أبي داود).

وگەورەترین پاڵپشت ویارمەتیدەر بۆ کاربەدەستان وخەڵك سیٚ شتە :

یەکەم : ئیش لەبەر خودا کردن ، وپشت پیٚبەستنی لە پاڕانەوە وپەرستشەکانی تریش ، وبنچینەی ئەوانەش پاریٚزگاری کردنە لە نویٚژەکان بە دڵ ولاشە .

دووەم : چاکەکردن لەگەڵ خەڵك وسوود پیٚگەیاندنیان بە ماڵ پیٚ بەخیشنیان کە زەکات دان دەگریٚتەوە .

سیٚیەم : ئارامگرتن لەسەر نەشیاو وناشایستەکانی خەڵك لە هەڵسوکەوت وڕەفتاریان.

لەبەر ئەوەشە خودای باڵادەست زۆر جار نویٚژ وئارامگرتن پیٚکەوە باس دەکات ، وەك دەفەرمویٚت : ﴿وَٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ ٤٥﴾(البَقَرَة) .

واتە : پشت ببەستن بە ئارامگرتن و نویٚژکردن .

وديسان دەفەرمویٚت : ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيۡلِۚ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ذَٰلِكَ ذِكۡرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ١١٤ وَٱصۡبِرۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١١٥﴾(هُود) .

واتە : نویٚژ بکە لە سەرەتای ڕۆژ وکۆتاییەکەی کە نویٚژی بەیانی ونیوەڕۆ وعەسر دەگریٚتەوە ، ولە شەویشدا نویٚژ بکە کە نویٚژی شەوان وخەوتنان دەگریٚتەوە ، چونکە چاکەکردن کە ئەنجام دانی نویٚژە فەرزەکانە دەبیٚتە هۆی سڕینەوەی تاوانەکان ، ئەوە بیرخستنەوەیە بۆ ئەو کەسانەی یادی خودا دەکەن ، وئارام بگرە چونکە خودا پاداشتی کردەوەی چاکەکاران بە فیڕۆ نادات .

وئەو فەرموودەی خودا کە دەفەرمویّت : ﴿فَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ قَبۡلَ طُلُوعِ ٱلشَّمۡسِ وَقَبۡلَ غُرُوبِهَاۖ ١٣٠﴾(طه).

واتە : ئارام بگرە لەسەر ئەوەی بێباوەڕان بە دۆزنت دادەنێن ، ویادی پەروەردگارت بکە پێش خۆرهەڵهاتن "نوێژی بەیانی" وپێش خۆر ئاوا بوون "نوێژی عەسر" .

وە هەروەها لە سورەتی (ق)دا دەفەرمویّت : ﴿فَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ قَبۡلَ طُلُوعِ ٱلشَّمۡسِ وَقَبۡلَ ٱلۡغُرُوبِ ٣٩﴾(قٓ) .

واتە : ئارامبگرە لەسەر ئەوەی پێت دەیلێن ، ویادی پەروەردگارت بکە پێش خۆرهەڵهاتن "نوێژی بەیانی" وپێش خۆر ئاوا بوون "نوێژی عەسر".

ودەفەرمویّت : ﴿وَلَقَدۡ نَعۡلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدۡرُكَ بِمَا يَقُولُونَ ٩٧ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ ٩٨﴾(الحِجۡر) .

واتە : ئێمە دەزانین ئەوەی بێبڕواکان پێت دەڵێن دڵتەنگ وغەمگینت دەکات ، بەڵام تۆ لەسەر ستایش وپەرستشی پەروەردگارت بەردەوام بە ولە کڕنوشبەران بە بۆ خودا.

باسکردنی نوێژ وزەکات پێکەوە لە قورئاندا زۆر زۆرە ، بە ئەنجامدانی نوێژ وزەکاتدان وئارامگرتن لەسەر ناشایستەکانی خەڵك ، حاڵی کاربەدەستان وخەڵکیش باش دەبێت وبەڕێوە دەچێت ، ئەگەر مرۆڤ بزانێت هەریەکە لەو زاراوە گشتگیرانە چی دەگەیەنێت لە نوێژکردن ویادی خودا وپاڕانەوە وخوێندنی قورئان ونیەت پاکی بۆ خودا وپشت بەستن بە پەروەردگار ، وزەکاتدان وچاکەکردن لەگەڵ خەڵك بە ماڵ بەخشین وچاکەکردن لەگەڵیان ، وهەروەها یارمەتیدانی ستەم لێکراوان وبەهاناوە

چوونی کەسانی بێدەرامەت وبێدەسەڵات ، ودەرکردنی پێداویستی نەداران ودەستکورتان ، لە هەردوو صەحیحەکەدا هاتووە لە پێغەمبەری خودا ﷺ: ((کل معروف صدقة))[159].

واتە : هەموو خێر وچاکەیەك وەك بەخشینە .

ئەوەش هەموو چاکەکارییەك دەگرێتەوە ، ئەگەر بزەپێکەنینێك یان قسەیەکی باش وخۆشیش بێت ، دیسان لە هەردوو صەحیحەکەدا هاتووە لە عەدی کوڕی حاتەمەوە رضي الله عنه دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی : (( ما منكم من أحد إلا سيكلمه ربه ليس بينه وبينه حاجب ولا ترجمان ، فينظر أيمن منه فلا يرى إلا شيئاً قدمه ، وينظر أشأم منه فلا يرى إلا شيئا قدمه ، فينظر أمامه ، فتستقبله النار ، فمن استطاع منكم أن يتقي النار ولو بشق تمرة فليفعل ، فإن لم يجد فبكلمة طيبة ))[160].

واتە : هەریەك لە ئێوە خودا گفتوگۆی لەگەڵدا دەکات بەبێ ئەوەی لە نێوانی پەروەردگار وئەو بەندەیە پەردەیەك یان وەرگێڕێك هەبێت ، سەیری لای ڕاستی خۆی دەکات هیچ نابینێت لەو کردەوانە زیاتر کەپێش خۆی خستووە ، وسەیری لای چەپی خۆی دەکات دیسان هیچ نابینێت لەو کردەوانە زیاتر کەپێش خۆی خستووە ، سەیری پێشی خۆی دەکات ئاگر بە ڕوویەتی ، هەریەکە لە ئێوە ئەگەر توانی خۆی لە ئاگر بپارێزێت ئەگەر بە لەتە خورمایەکیش بێت با خۆی بپارێزێت ، ئەگەر ئەوەشی دەست نەکەوت با بە قسەیەکی باش خۆی بپارێزێت .

---

159. رواه البخاري(٦٠٢١) ، ومسلم(١٠٠٥).

160. رواه البخاري(٦٥٣٩) ، ومسلم(١٠١٦).

ولـه سونەنەكاندا هاتووە لـە پێغەمبەری خوداوە ﷺ : (( لا تحقرن من المعروف شيئا ، ولو أن تلقى أخاك ووجهك إليه منبسط ، ولو أن تفرغ من دلوك في إناء المستقي))[١٦١].

واتە : هیچ لـە چاكە بەكەم مەزانە ، ئەگەر بەوەش بێت كە بگەیتە براكەت ڕووت خۆش بێت ، وئەگەر بەو ئاوەش بێت كە هەڵی دەگۆزیت وڕۆی دەكەیتە دەفری ئەو كەسەی داوای ئەو ئاوەت لـێدەكات .

ودیسان لـە سونەنەكاندا هاتووە لـە پێغەمبەری خوداوە ﷺ فەرموویەتی : ((إن أثقل ما يوضع في الميزان الخلق الحسن ))[١٦٢].

واتە : قورسترین كردارێك كە دەخرێتە سەر تەرازوو ڕەوشتی جوانە.

وگێڕدراوەتەوە كە بە ئوم سەلـەمەی فەرمووە : (( يا أم سلمة ذهب حسن الخلق بخير الدنيا والآخرة ))[١٦٣].

واتە : ئەی ئوم سەلـەمە ڕەوشت جوانی خێری دونیا ودوارِۆژیشی بردووە.

وقبوڵكردنی خراپەی خەڵك وخواردنەوە ودەرنەبڕینی توڕەیی ولـێبوردن لـە خەڵك وگوێڕایەڵی نەكردنی حەزوئارەزوو لـە ئارامگرتنە ، وخۆ بەگەورە نەزانین ، وخراپ وبەكارنەهێنانی سامان ، هەموو ئەوانە لـە كردەوە باشەكانن ، خودای پەروەردگار دەفەرموێت : ﴿وَلَئِنْ أَذَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِنَّا رَحْمَةً ثُمَّ نَزَعْنَٰهَا مِنْهُ إِنَّهُۥ لَيَـُٔوسٌ كَفُورٌ ﴿٩﴾ وَلَئِنْ أَذَقْنَٰهُ نَعْمَآءَ بَعْدَ ضَرَّآءَ مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ ذَهَبَ ٱلسَّيِّـَٔاتُ عَنِّىٓ ۚ إِنَّهُۥ لَفَرِحٌ فَخُورٌ ﴿١٠﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿١١﴾﴾(هُود) .

---

١٦١. رواه بهذا اللفظ ابن حبان في صحيحه (٥٢٢) ، وصححه الألباني في (صحيح الجامع)(٩٨) ، ورواه الترمذي(١٩٧٠) بلفظ مقارب ، وحسنه الألباني في صحيح الجامع(٤٥٥٧).

١٦٢. رواه أبوداود (٤٧٩٩) ، وصححه الألباني في (صحيح الجامع)(٥٧٢١).

١٦٣. رواه الطبراني في المعجم الأوسط (٣١٤١) ، وقال الألباني في (ضعيف الترغيب)(٢٢٣٠) : منكر.

واته : ئەگەر ئێمە خەڵکی تووشی خێرێك بکەین ، دواتر لێی وەرگرینەوە بێ ئومێد دەبێت وکوفری ناز ونیعمەتی پەروەردگاری دەکات ، وئەگەر تووشی خێر وچاکەمان کرد دوای ناڕەحەتیەك دەڵێت : لە نالەباری ژیان ڕزگارم بوو ، خۆی بەزل دەزانێت وفیزدەکات بەسەر خەڵکدا ، تەنها ئەو کەسانە نەبێت کە ئارام دەگرن وکردەوەی چاك دەکەن ئەوانە لێخۆش بوون وپاداشتی گەورەیان بۆ هەیە .

وبە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەفەرموێت : ﴿خُذِ ٱلۡعَفۡوَ وَأۡمُرۡ بِٱلۡعُرۡفِ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡجَٰهِلِينَ ١٩٩﴾(الآعۡرَاف) .

واته : لێبوردە بەو فەرمان بەچاکە بکە وبێباك بە پشت بکە لەوەی نەفامەکان دەیلێن وئەنجام دەدەن .

ودەفەرموێت : ﴿وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ ١٣٣ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوۡ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ لِذُنُوبِهِمۡ وَمَن يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمۡ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ١٣٥﴾(آلِ عِمۡرَان) .

واته : پەلە بکەن بۆ بەدەستهێنانی لێخۆش بوون وپۆشینی تاوانەکانتان لە لایەن پەروەردگارتانەوە وبۆ بەدەستهێنانی بەهەشتێك کە پانتاییەکەی بە قەد پانتایی ئاسمانەکان وزەوییە وئامادە کراوە بۆ ئەو کەسانەی پارێزکار ولە خودا ترسن ، وئەوانەی ئەگەر کردەوەیەکی ناشیرین ئەنجام بدەن یان ستەم لە نەفسی خۆیان بکەن یادی خودا دەکەنەوە وداوای لێ خۆشبوون وپۆشینی تاوانەکانیان دەکەن ، وکێ هەیە لە تاوان خۆشبێت وبیپۆشێت جگە لە خودا ﷻ ، وپێداگر وبەردەوام نابن لەسەر ئەوەی کە ئەنجامیانداوە وزانیویانە هەڵە وتاوانە .

وده‌فه‌رموێت : ﴿وَلَا تَسْتَوِى ٱلْحَسَنَةُ وَلَا ٱلسَّيِّئَةُ ۚ ٱدْفَعْ بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِى بَيْنَكَ وَبَيْنَهُۥ عَدَٰوَةٌ كَأَنَّهُۥ وَلِىٌّ حَمِيمٌ ﴿٣٤﴾ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٣٥﴾ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ ۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٦﴾﴾(فُصِّلَت) .

واته : چاكه وخراپه هه‌رگیز وه‌ك یه‌ك نابن هه‌رچی كرده‌وه‌ی خراپ هه‌یه به‌كرده‌وه‌ی باش وه‌ڵام بده‌ره‌وه وادابنێ ئه‌و كه‌سه‌ی خراپه‌كه‌ت به‌رامبه‌رده‌كات دۆستێكی زۆر خۆشه‌ویسته ، ئه‌و سیفه‌ته جوانه ته‌نها ئارامگران ده‌توانن پێی هه‌ستن ئه‌وانه خاوه‌ن به‌ختێكی گه‌وره‌ن وئه‌گه‌ر شه‌یتان گومانێكی خسته دڵته‌وه بۆ ئه‌وه‌ی كاری باش ئه‌نجام نه‌دیت وكاری خراپ ئه‌نجام بده‌یت په‌نا بگره به‌خودا چونكه ئه‌و بیسه‌ر وزانایه .

وده‌فه‌رموێت : ﴿وَجَزَٰٓؤُا۟ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا ۖ فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٠﴾﴾(الشُّورَىٰ) .

واته : پاداشتی كرده‌وه‌ی خراپ وه‌ڵام دانه‌وه‌یه‌تی به‌كرده‌وه‌یه‌كی هاوشێوه‌ی خۆی ، وهه‌ركه‌سێك لێبورده‌بێت وئاشته‌وایی بكات ئه‌وه پاداشتی لای خودایه ، خودا سته‌م كارانی خۆش ناوێت .

وحه‌سه‌نی به‌صری رَحِمَهُ اللَّهُ ده‌ڵێت : له ڕۆژی دواییدا ، بانگكه‌رێك له عه‌رشه‌وه بانگ ده‌كات ، هه‌ركه‌سێك پاداشتی لای په‌روه‌ردگاره باهه‌ستێته سه‌رپێ ، ته‌نها ئه‌و كه‌سانه هه‌ڵده‌ستن كه لێبورده وچاكساز بوون .

دڵ پاكی وچاكه‌كردن له‌گه‌ڵ خه‌ڵك به‌مانای ئه‌وه نییه ڕێگا بدرێت خه‌ڵك هه‌رچی ئاره‌زووی داوای لێده‌كات وابكات وهه‌رچی یاساغی لێده‌كات وانه‌كات ، خودا له‌و

بارەیەوە دەفەرمویێت : ﴿وَلَوِ ٱتَّبَعَ ٱلْحَقُّ أَهْوَآءَهُمْ لَفَسَدَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ ۚ ﴿٧١﴾﴾(المُؤْمِنُون) .

واتە : ئەگەر خودا بە ویست وئارەزووی ئەوانی کردبا هەموو ئاسمانەکان وزەوی وهەموو ئەو دروستکراوانەشی تیایدان تێك دەچوون .

وخودا بە هاوەڵان دەفەرمویێت : ﴿وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ ٱللَّهِ ۚ لَوْ يُطِيعُكُمْ فِى كَثِيرٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ لَعَنِتُّمْ ﴿٧﴾﴾(الحُجُرَات) .

واتە : بزانن کە پێغەمبەری خودا ﷺ لە نێوانتاندایە ئەگەر گوێڕایەڵی ئێوە بکات تووشی نارەحەتی دەبن لە زۆربەی ئیش وکارەکانتان .

بەڵکو چاکەکردن بە مانای ئەنجامدانی ئەو کارانەیە لەگەڵیان کە سوودی دونیا ودوارۆژی تیایە بۆیان ، ئەگەرچی کەسانێکیش هەبن ئەوەیان پێناخۆش بێت ، بەڵام پێویستە بەزەیی ونەرمونیانی بەکاربهێنرێت لەو کارانە کە پێیان ناخۆشە .

لە هەردوو صەحیحەکەدا هاتووە لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ فەرموویەتی : (( ما كان الرفق في شيء إلا زانه ، ولا كان العنف في شيء إلا شانه ))[١٦٤].

واتە : نەرمونیانی لە هەر ئیش وکارێکدا بێت جوانی دەکات ، وتوندوتیژیش لەهەر ئیش وکارێکدا بێت تێکی دەدات .

ودیسان دەفەرمویێت : (( إن الله رفيق يحب الرفق ، ويعطي على الرفق ما لا يعطي على العنف ))[١٦٥].

واتە : خودا نەرمونیان وبەخشندەیە بەرامبەر بەندەکانی ونەرمونیانی خۆش دەوێت ، وئەو پاداشتەی لەسەر نەرمونیانی دەیداتە بەندەکانی لەسەر توندوتیژی نایدات .

---

١٦٤. رواه مسلم(٢٥٩٤).

١٦٥. رواه البخاري (٦٩٢٧) ، ومسلم(٢٥٩٣).

وعومەری کوڕی عبدالعزیز دەیفەرموو : من حەز ناکەم ڕاستی ڕەق وتاڵ بۆ خەڵکی باس بکەم دەترسم لێی دووره پەرێزبن ، ئارام دەگرم هەتا خۆشیەکی دونیا دێتە پێش لەگەڵ ئەوەدا باسی دەکەم ، ئەگەر لە یەکێکیان دووره پەرێزبن حەز لەویتریان دەکەن ، وهەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ ئەگەر کەسێك بهاتایە وداوای شتێکی لێبکردایە ئەوەی بۆ دابین دەکرد یان بەقسەی خۆش وئاسان بەرێی دەکرد ، وجارێك خزمێکی داوای لێکرد بیکات بەکاربەدەستی ماڵی خێر وزەکات ولەوەش بەشی بدات ، فەرمووی : (( إن الصدقة لا تحل لمحمد ولا لآل محمد ))[١٦٦].

واتە : ماڵی خێر وزەکات بۆ محمد وکەس وخزمی حەڵاڵ نییە ، لەوە بەشی نەدان بەڵام لەو ماڵەی کە لە شەڕدەگیرا بەشی دەدان .

وعەلی وزەید وجەعفەر رضي الله عنهم لەسەر کچەکەی حەمزەی مامی هەریەکەیان داوای دەکرد ، بەڵام کچەکەی دایە پوری کچەکە ، وبەهیچ کەس لەوانی نەدا ، دواتر دڵی هەریەکەیانی بە قسەیەکی خۆش ڕازی کرد ، بە عەلی فەرموو : (( أنت مني وأنا منك ، وقال لجعفر : أشبهت خلقي وخلقي ، وقال لزيد : أنت أخونا ومولانا ))[١٦٧].

واتە : تۆ لە منی ومنیش لەتۆم ، وبە جەعفەری فەرموو : لە ئاکار وڕەوشت وڕەوواڵەتیشدا لە من دەچی ، وبە زەیدی فەرموو : تۆ برا وئازادکراوی ئێمەی .

پێویستە کاربەدەست لە بەخشین وبەڕێوەبردنی ئیش وکاردا بەو شێوەیە بێت ، چونکە خەڵك بەردەوام داوای بەخشینی بێ بەرامبەر دەکەن لە کاربەدەستان لە ماڵ وکرێ دەست وشتی لاوەکی ، وداوای کارئاسانی ولێبوردن دەکەن لە سنورەکان

---

١٦٦. رواه مسلم(١٠٧٢).

١٦٧. رواه البخاري(٢٦٩٩).

وسزاكان ، پێویسته لە ڕوویەكی ترەوە جێگەی ئەو داواكاریە نارەوایانەیان بۆ پڕ بكرێتەوە نەك لەسەر حیسابی ماف وسنورەكان ، ویان بەقسەی خۆش بەڕێ بكرێن وتوند وتیژی بەكارنەبرێت لەگەڵیاندا ، چونكە دەست بە ڕووەنانی داواكاران دڵیان دەڕەنجێنێت ، بەتایبەت ئەوانەی كە پێویستیان بە دڵنەوایی كردن هەیە ، خودای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَأَمَّا ٱلسَّآئِلَ فَلَا تَنۡهَرۡ ١٠﴾(الضُّحَىٰ) .

واتە : كەسێك كە هات داوای لێكردیت دەست بەڕوویەوە مەنێ .

ودیسان دەفەرموێت : ﴿وَءَاتِ ذَا ٱلۡقُرۡبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلۡمِسۡكِينَ وَٱبۡنَ ٱلسَّبِيلِ وَلَا تُبَذِّرۡ تَبۡذِيرًا ٢٦﴾ هەتاكو ئەوەی كە دەفەرموێت :﴿وَإِمَّا تُعۡرِضَنَّ عَنۡهُمُ ٱبۡتِغَآءَ رَحۡمَةٍ مِّن رَّبِّكَ تَرۡجُوهَا فَقُل لَّهُمۡ قَوۡلًا مَّيۡسُورًا ٢٨﴾(الإِسْرَاء) .

واتە : مافی خزم وكەس كار ودەستكورت ورێبواران بدە لە ماڵی خێر وزەكات ، وبەشێوازێكی نەشیاو ماڵ وسامانت خەرج مەكە وبە فیڕۆی مەدە ، هەتاكو ئەوەی كە دەفەرموێت : ئەگەر بوارنەبوو یارمەتیان بدەیت چاوەڕوانی ڕەحم وبەزەیی خودات كرد بۆ ئەوەی بتوانیت یارمەتیان بدەیت ، ئەوكات نەرمونیان بە لەگەڵیان وبەقسەی خۆش بەڕێیان بكە .

وئەگەر حوكمێك درا بەسەر كەسێكدا ئەوە پێی نارەحەت دەبێت ، ئەگەر دڵی درایەوە بە وتە یان بەكردەوە ئەوە ناوكرۆكی سیاسەتی شەرعییە ، وهاوشێوەی ئەوەیە كە پزیشك دەیدات بە نەخۆشەكانی ، كە دەرمانی تاڵ وژاڵیان دەداتێ بەڵام نەخۆشەكان بە پەرۆشەوە قبوڵی دەكەن چونكە واگومان دەبەن كە لە بەرژەوەندیانە ،

وخودا بە موسا عليه السلام دەفەرمویێت کاتێك ناردی بۆلای فیرعەون : ﴿فَقُولَا لَهُۥ قَوۡلٗا لَّيِّنٗا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوۡ يَخۡشَىٰ ٤٤﴾(طه) .

واتە : بەنەرم ونیانی قسەی لەگەڵدا بکەن بەڵکو بیربکاتەوە یان لەخودا بترسێت .

وپێغەمبەری خودا ﷺ بە موعاذی کوڕی جبل وئەبو موسای ئەشعەری رضي الله عنهما فەرموو : "کاتێك ناردیانی بۆ یەمەن" : (( یسرا ولا تعسرا ، وبشرا ولا تنفرا ، وتطاوعا ولا تختلفا ))[168] .

واتە : ئاسان کاری بۆ خەڵك بکەن وشت لەسەر خەڵك گران مەکەن ، ومژدە بە خەڵك بدەن وڕاویان مەنێن ودووریان مەخەنەوە ، وتەبا وهاوکاری یەکتربن وناکۆك وناتەبا مەبن .

جارێك دەشتەکییەك میزی کردە ناو مزگەوتی پێغەمبەری خودا ﷺ هاوەڵان بۆی هەستان پێغەمبەری خودا فەرمووی : (( لا تزرموه "أي : لا تقطعوا عليه بوله" ، ثم أمر بدلو من ماء فصب عليه ، وقال النبي ﷺ : إنما بعثتم ميسرين ولم تبعثوا معسرين ))[169] .

واتە : میزەکەی پێمەبڕن ، دواتر فەرمانی کرد دۆلکەیەك ئاویان هێنا وکردی بەسەریدا ، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی : ئێوە نێردراون بۆ ئەوەی ئاسانکاری بۆ خەڵك بکەن ، نەنێردراون بۆ گرانکردن ودژوارکردنی ئیش وکار لەسەریان ، ئەم سیاسەتەش هەموو کەسێك پێویستی پێیەتی بۆ بەڕێوەبردنی ئیش وکارەکانی لەماڵەوە ودەوروبەریشی ، چونکە دەروونی مرۆڤ ڕاستیەکان وەرناگرێت مەگەر بەوە نەبێت کە پێویستی پێیەتی ، نابینی کە جلوبەرگ لەبەرکردن وخواردن وخواردنەوە پێویستە

---

١٦٨. رواه البخاري(٣٠٣٨) ، و مسلم(١٧٣٣).

١٦٩. رواه البخاري(٢٢٠) ، ومسلم(٢٨٤).

لەسەر مرۆڤ ؟ هەتا ئەگەر پێویستی کرد مردارەوە بوو بخوات پێویستە بیخوات لەلای زۆربەی زانایان ، ئەگەر لێی نەخوارد تا دەمرێت ئەوا دەچێتە ئاگرەوە ، چونکە جۆرەکانی خودا پەرستی بەو شێوەیە نەبێت بە ئەنجام ناگات ، وهەرشتێك کارێکی پێویستی پێ تەواو بێت ئەویش پێویست (واجب) دەبێت ، لەبەر ئەوەشە خەرجی مرۆڤ لەسەر خۆی ومالْ ومندالْی لە پێشترە لەسەر کەسانی تر ، لە سونەنەکاندا هاتووە لە ئەبوهرەیرەوە ﷺ دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی : (( تصدقوا فقال : رجل يا رسول الله : عندي دينار فقال تصدق به على نفسك ، قال : عندي آخر ، قال : تصدق به على زوجتك ، قال : عندي آخر ، قال تصدق به على ولدك ، قال : عندي آخر ، قال تصدق به على خادمك ، قال : عندي آخر ، قال : أنت أبصر به ))[١٧٠].

واتە : ببەخشن وخێر وچاکە بکەن ، پیاوێك وتی : ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ دینارێکم هەیە ، فەرمووی : بۆ خۆتی خەرج بکە ، وتی : دینارێکی ترم هەیە ، فەرمووی : بۆ خێزانەکەتی خەرج بکە ، وتی: دینارێکی ترم هەیە ، فەرمووی : بۆ منداڵەکەتی خەرج بکە ، وتی یەکێکی ترم هەیە ، فەرمووی ، بۆ خزمەتکارەکەتی خەرج بکە ، وتی یەکێکی ترم هەیە ، فەرمووی : خۆت باشتری لێدەزانیت .

ولە صەحیحی موسلم دا هاتووە لە ئەبوهرەیرەوە ﷺ ڕیوایەتی کردووە دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : (( دينار أنفقته في سبيل الله ، ودينار أنفقته في رقبة ، ودينار تصدقت به على مسكين ، ودينار أنفقته على أهلك ، أعظمها أجراً الذي أنفقته على أهلك))[١٧١].

١٧٠. رواه أبوداود(١٦٩١) ، والنسائي(٢٥٣٥) ، وحسنه الألباني في (الإرواء)(٨٩٥).

١٧١. رواه مسلم(٩٩٥).

واته : دینارێك كه دەیبەخشیت لـه پێناوی خودا ، ودینارێك كه دەیبەخشیت بۆ ئازادكردنی بەندەیەك ، ودینارێك كه دەیبەخشیت به دەستكورتێك ، ودینارێك كه دەیبەخشیت به ماڵ ومنداڵت ، باشترینیان ئەو دینارەیه كه بەخشیوته به ماڵ ومنداڵت.

ودیسان لـه صەحیحی موسلمدا لـه ئەبوئومامەوە رضي الله عنه ڕیوایەتی كردووە دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی : (( يا ابن آدم إنك إن تبذل الفضل خير لك ، وان تمسكه شر لك ، ولا تلام على كفاف وابدأ بمن تعول ، واليد العليا خير من اليد السفلى))[172].

واته : ئەی نەوەی ئادەم لـەوەی خودا پێیداویت ولـه خۆت زیاترە ببەخشیت خێرترە بۆت ، وئەگەر بیگریتەوە خراپ وشەڕە بۆت ، ولـەسەر ئەوەی پێویستی خۆتە نەیبەخشیت لۆمە ناكرێیت ، ولـەوانەوە دەست پێبكه كه خەرجییان لـەسەرت پێویستە ، ودەستی بەخشندە وبالآ باشترە لـه دەستێك كه لـه خوارەوە بێت ودەست پان بكاتەوە .

ئەمەش ڕاڤەی ئەو ئایەتەیە كه پەروەردگار دەفەرموێت : ﴿وَيَسۡـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَۖ قُلِ ٱلۡعَفۡوَۗ ٢١٩﴾(البَقَرَة) .

واته : پرسیارت لـێدەكەن كەچی ببەخشن پێیان بلـێ : ئەوەی لـه خۆتان زیاترە ببەخشن.

چونكه خەرجی پیاو بۆ ماڵ ومنداڵی فەرزی عەینە ، به پێچەوانەی ئەوەی كه لـه ڕێگای خودا وبۆ دەستكورت ونەداران دەبەخشرێت ، چونكه ئەوانە لـه بنەڕەتدا یان فەرزی كیفایەن ، یان سوننەتن ، ئەگەرچی كەسی تر پێی هەڵنەستێت پێویست دەبێت ، چونكه ناندان به كەسێكی برسی پێویستە ، لـەبەر ئەوە لـه فەرموودەیەكدا هاتووە : ((لو صدق السائل لما أفلح من رده))[173].

---

١٧٢. رواه مسلم(١٠٣٦).

١٧٣. رواه ابن عبدالبر في (التمهيد)(٥/٢٩٦ــ٢٩٧) وقال : هذا حديث منكر لا أصل له ، والصغاني في(الموضوعات)(٨٨) ، والطاهر الفتني في (تذكرة الموضوعات)(٦١) ، وقال الامام أحمد : لا أصل له .

واتە : ئەگەر ئەو کەسەی داوا دەکات ڕاست بکات سەرفراز نابێت ئەوەی دەست بەڕوویەوە دەنێت ، ووتراوە ئەگەر زانرا ڕاست دەکات پێویستە نانی بدرێتێ .

وئەبو حاتمی البستی لە صەحیحەکەیدا ڕیوایەتی فەرموودەیەکی درێژی کردووە لە ئەبوهرەیرەوە ﷺ لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ کە تێیدا جۆرەکانی زانست ودانایی تێدایە ، وهەر لەو فەرموودەیەدا باسی داناییەکانی ئالی داود ﷺ دەکات : (( حق على العاقل أن تكون له أربع ساعات : ساعة يناجي فيها ربه ، وساعة يحاسب فيها نفسه ، وساعة يخلو فيها بأصحابه الذين يخبرونه بعيوبه ويحدثونه عن ذات نفسه ، وساعة يخلو فيها بلذته فيما يحل ويجمل ، فإن في هذه الساعة عونا على تلك الساعات ))[١٧٤].

واتە : پێویستە لەسەر مرۆڤی ژیر چوار کاتی هەبێت : کاتێك بۆ پاڕانەوە وگفتوگۆکردن وڕاز ونیازکردن لەگەڵ پەروەردگاری ، وکاتێك بۆ لێپرسینەوەی نەفسی ، وکاتێك لەگەڵ هاوەڵ ودۆستەکانی بۆ ئەوەی ئاگاداری بکەنەوە لە کەم وکورتیەکانی وباسی خۆی بۆ بکەن ، وکاتێك بۆ ڕابواردنی لەوەی بۆی حەڵاڵ وڕەوایە ، چونکە ئەم کاتەی دوایی یارمەتی دەرە بۆ بە ئەنجام گەیاندنی کاتەکانی تری .

ڕوونی کردەوە کە ڕابواردن وخۆشگوزەرانی حەڵاڵ پێویستە بۆ بەردەوامی ئیش وکارەکانی تر .

لەبەر ئەوە شەرعناسان باسی ئەوە دەکەن کە دادپەروەری دەبێتە مایەی چاکسازی ودروست بوونە کەسێتی مرۆڤ بە بەکارهێنانی ئەوەی کە جوان وڕازاوەیە ، ووازهێنان لەوەی کە پیس وناشیرینە ، وئەبو الدرداء ﷺ دەڵێت : (من دەروونم بە شتێك لە یاری ئاسوودە دەکەم ، بۆ ئەوەی بتوانم بەکارە ڕەوا وڕاستەکان هەستم) .

١٧٤. رواه ابن حبان في صحيحه (٣٦١) مطولاً ، وقال الألباني في (ضعيف الرغيب)(١٣٥٢) : ضعيف جداً.

وخودای پەروەردگار خۆشی ورِابواردنەکانی دونیای دروست کردووە بۆ ئەوەی بەرژەوەندی مرۆڤەکانی پێتەواو بکات ، بەوەش ئەوەی سودی بۆیان هەیە پێی هەڵدەستن ، وەك چۆن تورەبوونی دروست کردووە بۆ ئەوەی هەرچی زیانی هەیە بۆیان لە خۆیانی دوور بخەنەوە ، وهەندێك خۆشی ورِابواردنی دونیای قەدەغەکردووە چونکە زیانی هەیە بۆیان ، ولۆمەی ئەوانەی کردووە کە پێی هەڵدەستن ، وئەوەی کە پشت بە شتە حەڵاڵە جوانەکان دەبەستێت بۆ راپەڕاندنی کاری جوان ودروست ئەوە بەرژەوەندییەکی بەرز وباشە ، لەبەر ئەوە لە فەرموودەیەکی صەحیحدا هاتووە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی : (( في بضع أحدكم صدقة ، قالوا يا رسول الله : أيأتي أحدنا شهوته ويكون له فيها أجرٌ ؟ قال : أرأيتم لو وضعها في حرام أما يكون عليه وزر ؟ قالوا : بلى ، قال: فلم تحتسبون بالحرام ولا تحتسبون بالحلال ؟ ))[175].

واتە : هەریەك لە ئێوە لەگەڵ خێزانەکەی رابوێرێت خێری دەست دەکەوێت ، وتیان : ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ یەکێك لە ئێمە بۆ خوی رابوێرێت چۆن خێری دەست دەکەوێت ؟! فەرمووی : ئەگەر ئەو رابواردنەی لە حەرامدا بێت خراپەی لەسەر نییە ؟ ، وتیان : بەڵێ ، فەرمووی : بۆچی لە حەرامەکەدا تاوانباری دەکەن ، بەڵام لە حەڵاڵەکەدا چاوەڕوانی پاداشت ناکەن ؟ .

ولە هەردوو صەحیحەکەدا هاتووە لە سەعدی کوڕی ئەبووەقاصەوە رضي الله عنه ریوایەتیان کردووە دەڵێت : پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم : (( إنك لن تنفق نفقة تبتغي بها وجه الله إلا ازددت بها درجة ورفعة ، حتى اللقمة تضعها في امرأتك ))[176].

---

١٧٥. رواه مسلم(١٠٠٦).

١٧٦. رواه البخاري(١٢٩٥) ، ومسلم(١٦٢٨).

واته : تۆ هەر چییەك ببەخشیت مەبەستت پێی خودا بێت بەوە پلەیەك بەدەست دەهێنیت وپێی بەرز دەبیتەوە ، هەتا ئەو پاروەش کە دەرخواردی خێزانەکەتی دەدەیت .

وئەسەرێکی زۆرمان لەو بارەیەوە هەیە .

باوەڕدار ئەگەر مەبەست ونییەتی پاك بێت ئەوا بەسەر هەموو کردەوەکانیدا دەشکێتەوە ، وهەموو کارێکی حەلاڵی بە کاری باش بۆ دەنوسرێت لەبەر پاکی دڵ ونییەتی ، ودووڕوو لەبەر خراپی دڵ ونییەتی سزادەدرێت لەسەر ئەو پەرستشانەی کە بۆ ڕووپامایی ئەنجامی دەدات ، چونکە لە فەرموودەیەکی صەحیحدا لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ ڕیوایەت کراوە فەرموویەتی : (( ألا إن في الجسد مضغة إذا صلحت صلح لها سائر الجسد ، واذا فسدت فسد لها سائر الجسد ، ألا وهي القلب ))[177].

واتە : لە لاشەی مرۆڤدا پارچە گۆشتێك هەیە ئەگەر باش بێت هەموو لاشە باش دەبێت ، وئەگەر خراپ بێت هەموو لاشە خراپ دەبێت ئەویش دڵە .

وەك چۆن خودا سزاکانی لە شەریعەتدا داناوە بۆ ڕاپەڕاندنی کارە پێویست کراوەکان ودوورکەوتنەوە لە کارە حەرام کراوەکان ، هەروەها هەموو ئەو کارانەی کە یارمەتی دەری کاری باشن وهۆی دوورکەوتنەوەن لە کاری خراپ دیسان کارێکی شەرعییە ، بۆیە پێویستە ڕێگای گوێڕایەڵی خودا وچاکەکاری ئاسانکاری بۆ بکرێت ویارمەتی بدرێت وهانی خەڵك بدرێت بە هەموو شێوەیەك کە لە توانادا هەیە ، وەك ماڵ بەخشین بە منداڵ وخزم وکەس ، یان بەو خەڵکانەی کە لەژێر دەسەڵاتیدان بۆ ئەوەی هاندەریان بێت بۆ کاری باش ، لەبەر ئەوەشە پێشبڕکێی ئەسپ سواری وحوشتر سواری وشمشێربازی ڕێگای پێدراوە ، ودەتوانرێت پارەی لەسەر وەربگیرێت لەبەر ئەوە

177. رواه البخاري(٥٢) ، و مسلم(١٥٩٩).

هاندەری خۆکۆکردنەوە وخۆئامادەکردنە بۆ جیهاد لە پێناوی خودا ، هەتا پێغەمبەری خودا ﷺ وخەلیفە ڕاشدینەکانیشی پێشبڕکێیان لە نێوان ئەسپ سواراندا سازداوە ، وئەو دیاریانە کە دەدرا بە پێشبڕکێکاران لە (بیت المال) دەریان دەکرد ، وهەروەها ئەو کەسانەش کە دڵنەوایی دەکران ، ڕیوایەت کراوە : ((أن الرجل كان يسلم أول النهار رغبة في الدنيا فلا يجيء آخر النهار إلا والإسلام أحب إليه مما طلعت عليه الشمس))[178].

واتە : مرۆڤی وا هەیە لە سەرەتای ڕۆژدا موسڵمان دەبێت بەمەستی ماڵی دونیا کۆتای ئەو ڕۆژە نایەت ئیسلام خۆشەویستر دەبێت لەلای لەوەی خۆر بە سەریدا هەڵهاتووە .

وهەروەها خراپە وتاوانکاری پێویستە ڕێگای لێبگیرێت وبیانو نەدرێت بەدەست کەسانی تاوانکار وتێك دەرەوە ، وئەو کارە دەبێت خەڵکی لیٚ بپارێزرێت ، بۆ نموونە : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی : ((لا يخلون رجل بامرأة ، فإن ثالثهما الشيطان))[179].

واتە : نابێت پیاوێك وژنێك بە تەنها پێکەوە بمێننەوە ، چونکە بێگومان شەیتان دەبێت بە سێیەمیانە .

ودەفەرموێت : (( لا يحل لامرأة تؤمن بالله واليوم الآخر أن تسافر مسيرة يومين إلا ومعها زوج أو ذو محرم ))[180].

واتە : حەڵاڵ نییە بۆ ئافرەتێك کە باوەڕی بە خودا وڕۆژی دوایی هەبێت ، سەفەر بکات دووری دوو ڕۆژ ڕێگە مەگەر پیاوەکەی یان مەحرەمێکی لەگەڵدا بێت .

---

١٧٨. رواه مسلم(٢٣١٢).

١٧٩. رواه الترمذي(٢١٦٥) ، وصححه الألباني في (صحيح الجامع)(٢٥٦٤).

١٨٠. رواه البخاري(١١٩٧) ، ومسلم(٨٢٧).

پێغەمبەری خودا ﷺ یاساغی بەتەنها مانەوە وسەفەرکردنی ئافرەتی کرد لەگەڵ بێگانە ، چونکە ڕێخۆشکارە بۆ کاری خراپ ، ولە (الشعبی) گێڕدراوەتەوە دەڵێت : شاندێکی هۆزی عبدالقیس هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ کوڕێکی زۆر جوانیان لەگەڵدا بوو لە پشتی خۆیەوە داینا وفەرمووی : (( إنما كانت خطيئة داود النظر ))[181].

واتە : هەڵەی داود ﷺ سەیرکردن بوو .

وعومەری کوڕی خەتاب ﷺ شەوێك بە مەدینەدا دەگەڕا بۆ چاودێری کردن گوێی لە ئافرەتێك بوو گۆرانی دەوت بە چەند دێڕە شیعرێك دەیوت :

هل من سبيل إلى خمر فأشربها       أو من سبيل إلى نصر بن حجاج

واتە : ئایە بوار هەیە بۆ ئەوەی مەی بنۆشم،یان بوار هەیە بگەم بە نەصری کوڕی حەجاج.

عومەر ﷺ (نصری کوڕی حجاج)ی بانگی کرد بینی کوڕێکی گەنجی جوانە ، سەری تاشی بەڵام جوانتر بوو ، دووری خستەوە بۆ شاری بەصرە بۆ ئەوەی ئافرەتان گیرۆدە نەکات .

ودیسان لێوەی دەگێڕنەوە پێیان ڕاگەیاند پیاوێك منداڵی جوان لای دادەنیشن یاساغی ئەوەی کرد لەگەڵیدا دابنیشن ، ئەگەر منداڵی وا هەبوو گومانی ئەوەی لێ بکرێت پیاوان یان ئافرەتان توشی فیتنە بکەن ، پێویستە بەخێوکەرانی ئەو منداڵە ڕێگا نەدەن زۆر دەربکەوێت وخۆی برازێنێتەوە ، بە تایبەت پێویستە ڕێگای نەدەن بچێتە

---

181. ذكره الحافظ ابن حجر في (تلخيص الحبير)(١٤٨/٣) وعزاه لابن شاهين في (الأفراد) ، وقال الألباني في (الضعيفة)(٣١٣): موضوع.

گەرماوەکان خۆی بشوات ، وهەروەها نابێت ڕێگای پێ بدرێت لە کۆڕ وکۆبوونەوەی گۆرانی وقسەی پڕوپوچ دا ئامادەبێت ، ئەو جۆرەکارانە پێویستە سەرزەنشتی خاوەنەکانی بکرێت .

وهەروەها هەرکەسێك کە تاوانی لێدەرکەوت نابێت ڕێگای پێبدرێت لەگەڵ منداڵی جوان ولوسکەدا تێکەڵاو بێت ، شەرعناسان کۆڕان لەسەر ئەوەی ئەگەر گەواهیدەرێك گەواهیدا لای فەرمانڕەوایەك(حاکم) ، ولەو گەواهیدەرەوە باوبوو کە لەسەر تاوانێکی خراپ بەردەوامە ئەوکات دروست نییە گەواهییەکەی وەربگیرێت ، ودروستە بەهۆی ئەو کارەیەوە بەخراپ (جرح) باس بکرێت ، ئەگەرچی نەشیبینی بێت ، ولە پێغەمبەری خوداوە ﷺ جێگیر بووە کە : (( أنه مر عليه بجنازة فأثنوا عليها خيراً ، فقال : وجبت وجبت ، ثم مر عليه بجنازة فأثنوا عليها شراً ، فقال : وجبت وجبت ، فسألوه عن ذلك فقال : هذه الجنازة أثنيتم عليها خيراً فقلت وجبت لها الجنة ، وهذه الجنازة أثنيتم عليها شراً فقلت وجبت لها النار . أنتم شهداء الله في الأرض ))[١٨٢].

واتە : تەرمێکیان بەلایدا تێپەڕاند ئەوانەی لە دەوروبەری بوون بەباشی باسیان کرد ، فەرمووی : (پێویست بوو ، پێویست بوو) ، دوای ساتێك تەرمێکی تریان بەلایدا تێپەڕاند بەخراپی باسیان کرد فەرمووی : (پێویست بوو ، پێویست بوو) ، لەو بارەیەوە پرسیاریان لێکرد فەرمووی : ئەو تەرمەی کە بەباشی باستانکرد بەهەشتی بۆ دەستەبەر بوو ، وئەویتریان کە بە خراپی باستانکرد دۆزەخی بۆ دەستەبەر بوو ، ئێوە گەواهی دەری خودان لەسەر زەوی .

---

١٨٢. رواه البخاري(١٣٦٧) ، ومسلم(٩٤٩).

لەگەڵ ئەوەشدا ئافرەتێك هەبوو لەو سەردەمەدا تاوانی بە ئاشكرا دەكرد فەرمووی :
(( لو كنت راجماً أحداً بغير بينة لرجمت هذه ))[١٨٣].

واتە : ئەگەر كەسێكم بەبێ بەڵگە بەردباران بكردایە ئەم ئافرەتەم بەردباران دەكرد .

سنورەكان بەبێ بەڵگە ئەنجام نادرێن ، بەڵام وریاییدان لە گەواهی كەسێك وئەمانەتی وهاوشێوەكانی پێویست بە بینین ناكات ، بەڵكو هەر كە باوبوو كە كەسێكی تاوانبارە گەواهی وەرناگیرێت ، وهەندێك جار لەسەر هاوەڵەكانی دەپێورێت وەك ئیبن مەسعود رضي الله عنه دەڵێت : (اعتبروا الناس بأخدانهم) .

واتە : خەڵك بە هۆی هاوەڵەكانیانەوە بناسەوە .

وعومەری كوڕی خەتاب رضي الله عنه دەفەرموێت : (احترسوا من الناس بسوء الظن) .

واتە : خۆتان بپارێزن لە خەڵك بەگومانی خراپ .

لەگەڵ ئەوەی كە دروست نییە سزادانی موسڵمان لەسەر گومانی خراپ .

---

١٨٣. رواه ابن ماجه ، وصححه الألباني في (صحيح الجامع)(٥٢٧١).

## بەشی مافە تایبەتەکان

یەکێك لەو مافانەی کە پەیوەندی بەتاکەوە هەیە بریتییە لە خوێن ، خودا دەفەرموێت : ﴿قُلۡ تَعَالَوۡاْ أَتۡلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمۡ عَلَيۡكُمۡۖ أَلَّا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗاۖ وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَوۡلَٰدَكُم مِّنۡ إِمۡلَٰقٖ نَّحۡنُ نَرۡزُقُكُمۡ وَإِيَّاهُمۡۖ وَلَا تَقۡرَبُواْ ٱلۡفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنۡهَا وَمَا بَطَنَۖ وَلَا تَقۡتُلُواْ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ١٥١ وَلَا تَقۡرَبُواْ مَالَ ٱلۡيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ حَتَّىٰ يَبۡلُغَ أَشُدَّهُۥۚ وَأَوۡفُواْ ٱلۡكَيۡلَ وَٱلۡمِيزَانَ بِٱلۡقِسۡطِۖ لَا نُكَلِّفُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۖ وَإِذَا قُلۡتُمۡ فَٱعۡدِلُواْ وَلَوۡ كَانَ ذَا قُرۡبَىٰۖ وَبِعَهۡدِ ٱللَّهِ أَوۡفُواْۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ١٥٢ وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ١٥٣﴾(الآنعَام).

واتە : بەبێبڕواکان بڵێ : وەرن باپێتان ڕابگەیەنم کە پەروەردگارتان چی لێ حەرام کردوون ، بە هیچ شێوەیەك هاوەڵ بۆ خودا بڕیار مەدەن ولەگەڵ دایك وباوکتاندا باشبن ومنداڵەکانتان مەکوژن لەبەر ئەوەی کە هەژارن ، ئێمە ڕۆزی ئێوە وئەوانیش دەدەین ، ونزیك تاوانی گەورە مەکەونەوە چ ئەوانەی بەئاشکران یان ئەوانەشی پەنهانن ، وهیچ کەس مەکوژن چونکە خودا حەرامی کردووە مەگەر کەسێك شایانی کوشتن بێت ، پەروەردگار بەوە ئامۆژگاریتان دەکات بۆ ئەوەی لە خودا بترسن ، ونزیکی ماڵی هەتیو مەکەونەوە مەگەر بە شێوازێك بەرژەوەندی هەتیوەکەی تێدا بێت هەتا ئەو هەتیوە دەگاتە تەمەنی پێگەیشتن وژیری ، وکێشانەو پێوانەتان با دادپەروەرانە بێت ، داوای شتێك ناکەین لە توانادا نەبێت ، وئەگەر قسەتان کرد دادپەروەربن ئەگەرچی بڕیار لە

دژی کەسێکی خزم وناسیاویشتان بوو ، بەوە ئامۆژگاری کراون بۆ ئەوەی بێتەوە یادتان ، ئەمە ڕێگای ڕاستی منە شوێنی بکەون ، وشوێنی ڕێچکەکان مەکەون کە لە ڕێگای من هەڵەتان دەکات ، بەوە ئامۆژگاریتان دەکات لەبەر ئەوەی لە خوداترسبن .

ودەفەرموێت : ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلَّا خَطَـًٔا ۚ ﴿٩٢﴾﴾ هەتا ئەوەی کە دەفەرمویت :﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَـٰلِدًا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا ﴿٩٣﴾﴾(النِّسَاء) .

واتە : باوەڕدار بۆی نییە باوەڕدار بکوژێت مەگەر بەهەڵە ، هەرکەسێك باوەڕدارێك بە ئەنقەست بکوژێت سزای دۆزەخە وبەهەتا هەتایی تیایدا دەمێنێتەوە وخودا لێی توڕە دەبێت ونەفرەتی لێکردووە وسزای زۆر سەختی بۆ ئامادە کردووە .

ودەفەرموێت : ﴿مِنْ أَجْلِ ذَٰلِكَ كَتَبْنَا عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَنَّهُۥ مَن قَتَلَ نَفْسًۢا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِى ٱلْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَآ أَحْيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعًا ۚ وَلَقَدْ جَآءَتْهُمْ رُسُلُنَا بِٱلْبَيِّنَـٰتِ ثُمَّ إِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم بَعْدَ ذَٰلِكَ فِى ٱلْأَرْضِ لَمُسْرِفُونَ ﴿٣٢﴾﴾(المَائِدَة) .

واتە : لەبەر ئەوەی کوڕەکەی ئادەم براکەی خۆی بەناڕەوا کوشت پێویستمان کرد لەسەر نەوەکانی ئیسرائیل کە هەر کەسێك کەسێکی تر بە ناڕەوا بکوژێت یان بشێوی بنێتەوە لەسەر زەوی وەك ئەوە وایە کە هەموو خەڵکی کوشتبێت ، وهەرکەسێك ببێتە مایەی ڕزگاربوونی کەسێك لە مردن وفەرمان بکات بە نەکوشتنی وەك ئەوە وایە هەموو خەڵکی ڕزگارکردبێت .

لە هەردوو صەحیحەکەدا لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ ڕیوایەتیان کردووە فەرموویەتی : (( أول ما يقضى بين الناس يوم القيامة في الدماء ))[184] .

واتە : یەکەم شت لە ڕۆژی قیامەتدا لێپرسینەوەی خەڵکی لەسەر دەکرێت خوێنە .

---

١٨٤. رواه البخاري(٦٥٣٣) ، و مسلم(١٦٨٧).

## كــــوشتن ســـــێ جــــۆره

یەكەمیان : بە ئەنقەست ، مەبەستی بكوژەكە كوشتنی كەسێكی بێتاوان بێت ، گەرچی ئەو كوشتنە بە شمشێر بێت یان بەهەر شتێكی تری وەك چەكوش یان كوتەك ، یان بە شتی تری وەك سوتاندن یان خنكاندنی لە ئاودا ، یان فڕێدانی لە شوێنێكی بەرزەوە ، یان خنكاندنی بە دەست ، یان داپۆشینی دەم وچاوی هەتا مردن ، یان ژەهر پێدانی یان هەر كردەوەیەكی تری هاوشێوەی ئەو كارە ناڕەوایانە ، ئەگەر كەسێك یەكێك لەو كارانە ئەنجام بدات پێویستە تۆڵەی لێ بسێندرێتەوە وبكوژرێت ، ئەویش بەوەی بدرێتە دەست كەسوكاری كوژراوەكە ، ئەگەر ویستیان دەیكوژن یان بیانەوێت لێی خۆش دەبن ، یان دەتوانن پارەی لە بری ئەو خوێنە لێ وەربگرن ، وبۆیان نییە كەسی تر بكوژن كەسە بكوژەكە نەبێت ، خودا دەفەرموێت : ﴿وَلَا تَقۡتُلُواْ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّۗ وَمَن قُتِلَ مَظۡلُومٗا فَقَدۡ جَعَلۡنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلۡطَٰنٗا فَلَا يُسۡرِف فِّي ٱلۡقَتۡلِۖ إِنَّهُۥ كَانَ مَنصُورٗا ٣٣﴾(الإِسۡرَاء) .

واتە : هیچ نەفسێك كە خودا حەرامی كردووە مەیكوژن مەگەر ئەو كوشتنە ڕەوا بێت ، وهەر كەسێك بەستەم بكوژرێت فەرمانمان داوەتە دەست كەس وكارەكەی بەڵام پێویستە زیادەڕەوی نەكەن لە كوشتن وەك ئەوەی تەرمی بكوژەكە بشێوێنن یان كەسێكی تر لە بری بكوژن ، كەسوكاری كوژراوەكە مافیان هەیە بەسەر بكوژەكەدا بەپێی شەرع .

لە تەفسیردا وتراوە : نابێت كەسی تر لە بری بكوژەكە بكوژرێتەوە .

ولە ئەبوشریحی خزاعییەوە ﵁ ڕیوایەت كراوە دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی : (( من أصيب بدم أو خبل ــ الخبل الجراح ــ فهو بالخيار بين إحدى ثلاث :

فإن أراد الرابعة فخذوا على يديه : أن يقتل ، أو يعفو ، أو يأخذ الدية ؛ فمن فعل شيئا من ذلك فعاد فإن له جهنم خالداً فيها أبداً ))[185].

واته : ئەوەی کەسێکی لیٚ کوژرا یان بریندارکرا ، ئەوە سەرپشکە لە نێوان سیٚ شتدا ، ئەگەر چوارەمی ویست دەستی بگرن ، یان بکوژەکە بکوژن ، یان لێی ببورن ، یان پارەی خوێنی لیٚ وەربگرن ، ئەگەر کەسێك یەکێك لەو سیٚ کارەی ئەنجامدا وپاشان پاشگەز بوویەوە ئەوە بەهەمیشەیی لە دۆزەخدا دەمێنێتەوە .

هەرکەسێك دوای لێبوردن بکوژەکەی کوشت ، ئەوە تاوانی لەو کەسە گەورەترە کە یەکەم جار خوێنەکەی ڕشتووە ، هەتا هەندێك لە زانایان دەڵێن : پێویستە ئەو کەسە بکوژرێت وەك حەددێك ، ونابێت لەوەدا بدرێتە دەستی کەسوکاری کوژراوەکە ، خودا دەفەرمویٚت : ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِصَاصُ فِي ٱلۡقَتۡلَىۖ ٱلۡحُرُّ بِٱلۡحُرِّ وَٱلۡعَبۡدُ بِٱلۡعَبۡدِ وَٱلۡأُنثَىٰ بِٱلۡأُنثَىٰۚ فَمَنۡ عُفِيَ لَهُۥ مِنۡ أَخِيهِ شَيۡءٞ فَٱتِّبَاعُۢ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَأَدَآءٌ إِلَيۡهِ بِإِحۡسَٰنٖۗ ذَٰلِكَ تَخۡفِيفٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَرَحۡمَةٞۗ فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ بَعۡدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١٧٨﴾ وَلَكُمۡ فِي ٱلۡقِصَاصِ حَيَوٰةٞ يَـٰٓأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿١٧٩﴾﴾(البَقَرَة) .

واتە : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە تۆڵەکردنەوەی دادگەرانە لە بکوژان پێویست کراوە لەسەرتان ، کەسێکی ئازاد لە بری کەسێکی ئازاد دەکوژرێتەوە ، کۆیلە لە بری کۆیلە ، وئافرەت لە بری ئافرەت ، ئەگەر کەسوکاری کوژراوەکە لە بکوژەکە خۆشبوون ونەیان کوشتەوە ، ئەوا با میراتگرەکانی کوژراوەکە بە چاکە ڕەفتار لەگەڵ

١٨٥. رواه ابوداود(٤٤٩٦) ، وابن ماجه(٢٦٢٣) ، وضعفه الألباني في (ضعيف الجامع) (٥٤٣٣).

بکوژەکەدا بکەن ولـە مافی خۆیان زیاتر داوا نەکەن ، وبکوژەکەش بە ڕێك وپێکی وبێ دواخستن مافی کوژراوەکە بداتە میراتگرەکانی ، ئەو لـێخۆشبوون ونەکوشتنەوەی بکوژەکە ووەرگرتنی خوێنباییە ئاسانکاری وڕەحم وبەزەییە لـە پەروەردگارتانەوە ، هەرکەس دوای ڕازی بوون بە خوێنبایی ولێخۆشبوونی بکوژەکە دەستدرێژی بکات وبیکوژێتەوە ئەوا سزایەکی بەئێش وئازاری بۆ هەیە ، وتۆڵەکردنەوە مایەی ژیانە بۆتان ئەی ئەو کەسانەی بیرمەند وژیرن ، وبۆ ئەوەی پارێزکاربن وسنوری خودا نەبەزێنن وخەڵك نەکوژن .

زانایان دەڵێن : دڵی کەسوکاری کوژراوەکە دەکولێت ، هەتا بکوژەکە وکەسوکاریشی دەکوژن ، لـەوانەشە بەکوشتنی بکوژەکە قایل نەبن ، بەڵکو زۆرێك لـە هاوەڵ وکەسوکاری بکوژەکە دەکوژن وەك سەرۆك هۆز ودەم سپی عەشیرەتەکەی ، بەوەش بکوژەکە لـە سەرەتا دا ستەمی کرد بەکوشتنی کەسێك ، بەڵام ئەوانی تر ستەمی گەورەتریان ئەنجامدا بەتێك دانی چەند خێزانێك ، وهەندێك جار بکوژەکە بە گەورەتر دەزانن لـەو کەسەی کە کوشتوویەتی بە هۆی پلـەوپایەیەوە بە شایانی ئەوەی نازانن کە لـە بری ئەو کەسە بکوژرێت ، ئەوە دەبێتە مایەی ئەوەی کە کەسوکاری کوژراوەکە هەوڵی تۆڵە سەندنەوە بدەن وهەرکەسیان بەردەست بکەوێت بیکوژن لـە خزم ونزیکەکانی کەسە بکوژەکە ، ولـەوانەشە خۆیان بدەنە پاڵ تاقم وتایفەیەك وئەوانی تریش هەروەها ، بەوەش بشێوی وئاژاوەی گەورە پەیدا دەبێت ، هەموو ئەوانەش سەرئەنجامی دەرچوونە لـە بنەمای دادپەروەرانە کە تۆڵە کردنەوەیە بە کوشتنی بکوژەکە ، خودای باڵادەست لـەسەری پێویست کردووین کە هەر کەسێك کەسێك بکوژێت تەنها ئەو کەسە لـە بری بکوژرێتەوە ، بەیەکسانی ودادپەروەرانە بەبێ جیاوازی لـە نێوان پلـەوپایەی بکوژەکە وکوژراوەکە ، وخودا هەواڵی داوە کە ئەو کردارە مایەی پاراستن

وتێك نەچوونی ژیانە ، چونكە خوێنی جگە لە بكوژەكە لە هەردوولا دەپارێزێت .

وهەروەها بكوژ ئەگەر زانی كەسێكی بێتاوان بكوژێت لە بریدا دەكوژرێتەوە كەس ناكوژێت ، لە عەلی كوڕی ئەبو تالب ﷺ وعەمری كوڕی شوعەیب لە باوكیەوە ئەویش لە باپیریەوە ﷺ لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ دەگێڕنەوە : (( المؤمنون تتكافأ دماؤهم ، وهم يد على من سواهم ، ويسعى بذمتهم أدناهم ، ألا لا يقتل مسلم بكافر ، ولا ذو عهد في عهده))[186].

واتە : باوەڕداران خوێنیان یەكسانە ، وهەموویان یەك دەستن دژی دوژمنەكانیان ، وئەگەر خوارترین موسڵمان كەسێكی دالّدەدا هەموویان دەبێت پێوەی پابەندبن ، ووریابن موسڵمان لە بری بێبڕوا ناكوژرێت ، وخاوەن بەڵێن (ذو عهد) لە ماوەی بەڵێنەكەیدا ناكوژرێت لە بری بێبڕوا .

پێغەمبەری خودا ﷺ بڕیاری داوە كە خوێنی موسڵمانان وەك یەك ویەكسانە ، هیچ عەرەبێك نییەتی بەسەر گەلانی ترەوە ، وهەروەها هیچ هاشمی و قورەیشیەك هیچیان لە موسڵمانانی تر زیاتر نییە ، وهیچ ئازادێك (الحر) نییەتی بەسەر كۆیلەیەكی ئازادكراودا، وهەروەها هیچ زانا وكاربەدەستێك جیاوازیان نییە لە نەخوێندەوار وفەرمان پێكراوێك.

موسڵمانان هەموو لەسەر ئەوە یەكدەنگن ، بەپێچەوانەی سەردەمی نەفامی وفەرمانڕەواكانی جولەكەكان ، لە نزیك شاری پێغەمبەری خودا ﷺ دوو تاقم جولەكە هەبوون : قريظة والنضير ، نەضیرییەكان خوێنیان بە بایەخ تربوو لە قریظەییەكان ، بۆ حەددی شەروالّپیسی كە ئەوان بەردباران كردنی شەروالّپیسیان گۆڕیبوو بە ڕوخسار ڕەش كردن ، سكالاّیان هێنا بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ ،

---

١٨٦. رواه ابوداود(٢٧٥١) ، وابن ماجه(٢٦٨٥) ، وحسنه الألباني في (صحيح الجامع) (٦٧١٢).

وگوتیان : ئەگەر بڕیاری بە ڕوخسار ڕەشکردنی دا دەبێتە بەڵگە بۆتان ، ئەگەرنا ئێوە وازتان هێناوە لە فەرمانی تەورات خودا ئەم ئایەتانەی دابەزاند : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ لَا يَحۡزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡكُفۡرِ مِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَلَمۡ تُؤۡمِن قُلُوبُهُمۡۛ ﴿٤١﴾﴾ هەتاکو : ﴿فَإِن جَآءُوكَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُمۡ أَوۡ أَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡۖ وَإِن تُعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ فَلَن يَضُرُّوكَ شَيۡـٔٗاۖ وَإِنۡ حَكَمۡتَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِٱلۡقِسۡطِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ ﴿٤٢﴾﴾ هەتاکو ئەوەی کە دەفەرموێت : ﴿وَكَيۡفَ يُحَكِّمُونَكَ وَعِندَهُمُ ٱلتَّوۡرَىٰةُ فِيهَا حُكۡمُ ٱللَّهِ ثُمَّ يَتَوَلَّوۡنَ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَۚ وَمَآ أُوْلَٰٓئِكَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٤٣﴾﴾ هەتاکو : ﴿فَلَا تَخۡشَوُاْ ٱلنَّاسَ وَٱخۡشَوۡنِ وَلَا تَشۡتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنٗا قَلِيلٗاۚ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾ وَكَتَبۡنَا عَلَيۡهِمۡ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفۡسَ بِٱلنَّفۡسِ وَٱلۡعَيۡنَ بِٱلۡعَيۡنِ وَٱلۡأَنفَ بِٱلۡأَنفِ وَٱلۡأُذُنَ بِٱلۡأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلۡجُرُوحَ قِصَاصٞۚ ﴿٤٥﴾﴾(المَائِدَة).

واتە : ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ خەمبار ودڵتەنگت نەکەن ئەو کەسانەی بە پەلەن بۆ هەڵبژاردنی بێباوەڕی ، ئەوانەی بە زارەکی وتیان : باوەڕمان هێناوە ، بەڵام لە دڵەوە باوەڕیان نەهێنا بوو ، وهەروەها هەندێك لە جولەکەکان کە زۆر گوێ بۆ درۆ ودەلەسەی دەم سپییەکانیان دەگرن وگوێ بۆ کۆمەڵە کەسانێك دەگرن کە نەهاتوون بۆ لای تۆ لەبەر خۆبەگەورە زانینیان ، مانا ومەبەستی فەرموودەی خودا لە تەوراتدا دەگۆڕن وتێکی دەدەن ولێکدانەوەی هەڵەی بۆ دەکەن ، دەڵێن : ئەگەر محمد حوکمی لێدانی جەڵدەی بۆ دانان لە بری ڕەجم کردن وەری بگرن ، وئەگەر حوکمێکی تری بۆدانان وریابن ، ئەگەر کەسێك خودا بیەوێت تووشی گومڕایی بکات تۆ هیچت لای خودا پێناکرێت بۆی ، ئەوانە کەسانێکن خودا نەیویست دڵەکانیان پاك بکاتەوە ، لە دونیادا ڕیسوا وسەرشۆڕن ، ولە دواڕۆژیشدا سزایەکی زۆر گەورە وسەختیان بۆ هەیە.

ئەگەر هاتن بۆ لات حوكم بكە لە نێوانیان یان پشتگوێیان بخە ولایان لێ مەكەرەوە ، ئەگەر پشتگوێیان بخەیت ولایان لێنەكەیتەوە هیچ زیانت پێناگەیەنن ، وئەگەر حوكمت كرد لە نێوانیان دادگەرانە حوكم بكە ، بێگومان خودا دادگەرانی خۆش دەوێت .

چۆن تۆ دەكەن بە دادوەر لە نێوانیاندا ؟!، ورِازی دەبن بەو حوكمەی بۆیان دەدەیت ، لە كاتێكدا تەوراتیان لەبەر دەستدایە كە حوكمی خودای تێدایە ، پاشان دوای ئەوەی حوكمت كرد لە نێوانیان پشت هەڵدەكەن ، ئەوانە باوەڕدارنین .

لە خەڵك مەترسن ولە من بترسن ، وئایەتەكانی من بە شتێكی كەم لە دونیا مەگۆڕنەوە ، وهەركەسێك حوكم نەكات بەوەی خودا دایبەزاندووە ئەوانە بێباوەڕن .

لە تەوراتدا پێویستمان كرد بوو لەسەریان ، كەسێك بە ئەنقەست وناڕەوا كەسێكی تر بكوژێت دەكوژرێتەوە ، وچاو لە بری چاو كوێر دەكرێت ، لووت لە بری لووت دەبڕدرێت ، وگوێ لە بری گوێ ، وددان لە بری ددان دەشكێندرێت یان دەكێشرێت ، وبرینەكانیش هەریەكە بە گوێرەی خۆی تۆڵەیان بۆ دەكرێتەوە .

خودای پەروەردگار ڕوونی كردەوە كە هەمووان یەكسانن ، وفەزڵی كەسێكی بەسەر ئەوانی تردا نەدا ، وەك ئەوەی كە جولەكەكان وایان دەكرد هەتا دەفەرموێت : ﴿وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَمُهَيۡمِنًا عَلَيۡهِۖ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُۖ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلۡحَقِّۚ لِكُلّٖ جَعَلۡنَا مِنكُمۡ شِرۡعَةٗ وَمِنۡهَاجٗاۚ ٤٨﴾ هەتاكو ئەوەی كە دەفەرموێت : ﴿أَفَحُكۡمَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ يَبۡغُونَۚ وَمَنۡ أَحۡسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكۡمٗا لِّقَوۡمٖ يُوقِنُونَ ٥٠﴾(المَائِدَةِ).

واته : وئێمە کتێبمان بۆ دابەزاندووی کە ڕاست ورەوایە وسەلمێنەر وپشت ڕاستکەرەوەی کتێبەکانی پێش خۆیەتی وحاکم وبالآیە بەسەریاندا وشەریعەتەکانی نەسخ کردوونەتەوە ، حوکم بکە لە نێوانیان بەوەی خودا بۆی دابەزاندوویت ، وشوێن حەز وئارەزووەکانیان مەکەوە دوای ئەوەی بەڵگەی ڕاستیت بۆ هات ، بۆ هەموو ئوممەتێك شەریعەت ومەنهەجی تایبەتمان دابەزاندووە .

ئایا حوکمی نەفامییان دەوێت ؟! ، کێ حوکمی لە خودا ﷻ جوانترە ، بۆ کەسانێك کە دڵنیان وباوەڕی تەواویان هەیە .

هۆی سەرەکی شوێن حەز وئارەزووکەوتن لە شار ولادێکان ، ستەمکردن ووازهێنانە لە دادپەروەری ، چونکە ئەگەر دوو کۆمەڵ بشێوی وخوێنێك کەوتە نێوانیان وکۆمەڵێکیان خۆی بەپایە بەرزتر بزانێت ومافی بەرامبەرەکەی نەدات ، ئەوانی تریش لە بەرامبەردا داوای زیاتر لە مافی خۆیان دەکەن ، بۆیە پێویستە لە خوێن ومالْ وناکۆکیەکانی نێوان خەڵك دادپەروەری ڕەچاو بکرێت کە خودا فەرمانی پێکردووە لە قورئاندا ، ولا نەکرێتەوە بە لای زۆربەی ئەو شتانەی کە لە سەردەمی نەفامیدا خەڵکی لەسەری بوون ، وئەگەر چاکە خوازێك ویستی چاکە وناوبژی بکات ئەویش پێویستە لەسەری دادپەروەر بێت وەك خودا دەفەرموێت : ﴿وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱقۡتَتَلُواْ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَاۖ فَإِنۢ بَغَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا عَلَى ٱلۡأُخۡرَىٰ فَقَٰتِلُواْ ٱلَّتِي تَبۡغِي حَتَّىٰ تَفِيٓءَ إِلَىٰٓ أَمۡرِ ٱللَّهِۚ فَإِن فَآءَتۡ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَا بِٱلۡعَدۡلِ وَأَقۡسِطُوٓاْۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ ۝٩ إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ إِخۡوَةٞ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَ أَخَوَيۡكُمۡۚ ۝١٠﴾(الحُجُرَات) .

واتە : ئەگەر دوو کۆمەڵ لە باوەڕداران بە شەڕهاتن ، ئاشتەوایی بکەن لە نێوانیان ، ئەگەر کۆمەڵێکیان ستەمکار بوو ملکەچ نەبوو بۆ ڕاستی ، ئەوە لە دژی بجەنگن هەتا

ملکەچ دەبێت بۆ فەرمانی خودا ، ئەگەر بە فەرمانی خودا ڕازی بوون ئاشتیان بکەنەوە ودادپەروەربن ، چونکە خودا دادپەروەرانی خۆش دەوێت ، باوەڕداران برای یەکن لەگەڵ یەکدا کۆك وتەبابن .

وپێویستە داوا لە کەسوکاری کوژراوەکە بکرێت کە لە بەرامبەرەکانی خۆشبن چونکە واباشە بۆیان ، وەك خودا دەفەرموێت : ﴿وَٱلْجُرُوحَ قِصَاصٌۚ فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَّهُۥۚ ﴿٤٥﴾﴾(المَائِدَةِ).

واتە : تۆڵەی بریندارکردن بریندارکردنە ، ئەگەر لە تاوان بارەکە خۆشبن دەبێتە کەفارەتی تاوانەکەی .

ئەنەسی کوڕی مالك ﷺ دەڵێت : (( ما رفع إلى رسول الله ﷺ أمر فيه قصاص إلا أمر فيه بالعفو ))[187].

واتە : هیچ سکاڵایەك بەرز نەکراوەتەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ کە داوای تۆڵەکردنەوەی تێدا بووبێت ، ئیلا فەرمانی بە لێبوردن کردووە .

ومسلم لە صەحیحەکەیدا لە ئەبو هرەیرەوە ﵁ ڕیوایەتی کردووە دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەی : (( ما نقصت صدقة من مال ، وما زاد الله عبداً بعفو إلا عزاً ، وما تواضع أحد لله إلا رفعه الله ))[188].

واتە : هیچ کات خێر وچاکە لەماڵ کەم ناکاتەوە ، وخودا بەندە بە هۆی لێبوردنەوە بەرێز دەکات ، وهەرکەسێك لەبەر خودا بێ فیز وخاکی بێت خودا پایەی بەرز دەکات.

---

١٨٧. رواه أبوداود(٤٤٩٧) ، والنسائي(٤٧٨٤) ، وابن ماجه(٢٦٩٢) ، وصححه الألباني في (صحيح أبي داود).

١٨٨. رواه مسلم(٢٥٨٨).

ئەو هاوتاییەی کە باسمان کرد : بۆ موسڵمانێکی ئازادە بەرامبەر بە موسڵمانێکی تری ئازاد ، بەڵام ئەوانەی لـە ئەستۆدان (ذمي) جمهوری زانایان لـەسەر ئەوەن کە هاوتای موسڵمان نین ، وهەیانە دەڵێت هاوتایەتی ، وهەروەها کێشەش لـەسەر ئەوە هەیە کە ئازاد بە کۆیلە دەکوژرێت یان نا ؟ .

جۆری دووەم : کوشتنی بە هەڵەی هاوشێوەی ئەنقەستە : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی : (( ألا إن في قتل الخطأ شبه العمد ما كان في السوط والعصا مائة من الإبل ، منها أربعون خلفة في بطونها أولادها ))[١٨٩].

واتە : هەندێك کوشتن هەیە هاوشێوەی ئەنقەستە ، ئەوەی کەبە قامچی وگۆچان دەکوژرێت خوێنەکەی سەد حوشترە چلیان دەبێت سك پڕبن (بێچوو لـە سکیاندابێت).

بە هاوشێوەی ئەنقەست ناوی برد ، چونکە مەبەستی لـێدانی بووە ، کە بەو شێوە لـێدانە مرۆڤ زۆرجار نامرێت ، کەواتە : بەئەنقەست لـێیداوە بەڵام مەبەستی کوشتنی نەبووە .

جۆری سێیەم : هەڵەی پەتی ئەو کوشتنانەی کە لـەم باسەدا جیێان دەبێتەوە ، وەك ئەوەی بهاوێتە نێچیرێك یان نیشانێك ، بەڵام مرۆڤێك بپێکێت بەبێ زانین وبێ مەبەست ، ئەم جۆرە کوشتنە تۆڵـەکردنەوەی نییە ، بەڵام دییە(خوێنبایی) وکەفارەتی هەیە ، ولـەسەر ئەم پرسانە باسی زۆر هەیە لـە کتێبی زانایان .

---

١٨٩. رواه أبوداود(٤٤٩٧) ، والنسائي(٤٧٩١) ، وابن ماجه(٢٦٢٧) ، وصححه الألباني في (صحيح الجامع)(٢٦٣٨).

## بەشی تۆڵە کردنەوە لە بریندارکردن

تۆڵەکردنەوە لە بریندارکردندا سەلماوە بە قورئان وسوننەت وکۆڕای زانایان بە مەرجی یەکسانی ، ئەگەر لەپی دەستی ڕاستی بڕا ، بۆی هەیە وەك ئەو دەستی ببڕێت ، وئەگەر ددانی هەڵکێشا دەتوانێت ددانی وا لیٚ بکات ، وئەگەر سەری یان ڕوخساری بریندارکرد تا ئێسکەکەی دەرکەوت دەتوانێت وای لیٚ بکات ، بەڵام ئەگەر نەتوانرا یەکسانی ڕەچاو بکرێت وەك ئەوەی کە ئێسکێکی ناوەوەی بشکێنێت یان برینێکی نادیار بکات ، ئەوکاتە نابێت تۆڵە بکرێتەوە ، بەڵکو پێویستە دییەی دیاری کراو بدرێت یان بە ئەندازەی ئەو زیانەی لێیکەوتووە بۆی قەرەبوو بکرێتەوە .

بەڵام تۆڵە کردنەوە لە لێدانی دەست وگۆچان وقامچی وهاوشێوەی ئەوانە وەك ئەوەی زللە یان مستەکۆڵەی لێبدات ، کۆمەڵێك لە زانایان دەڵێن : تۆڵەکردنەوەی نییە ، بەڵکو سەرزەنشت دەکرێت ، چونکە لەو حاڵەتەدا ناتوانرێت یەکسانی ڕەچاو بکرێت لە کاتی تۆڵەکردنەوەدا .

وئەوەی لە خەلیفە ڕاشدییەکان وهاوەڵان وتابعیەکان گێڕدراوەتەوە : دەتوانرێت لەو جۆرە ستەمانەشدا تۆڵە بکرێتەوە ، بە دەق لە ئەحمەد وشەرعناسەکانەوە هاتووە ، وسوننەتی پێغەمبەری خوداش ﷺ بەوە هاتووە ، ئەوەش پەسەندترە ، ئەبوفیراس دەڵێت : عومەری کوڕی خەتاب رضي الله عنه وتاری دەخوێند باسی فەرموودەیەکی دەکرد تیایدا فەرمووی : (( ألا إني والله ما أرسل عمالي إليكم ليضربوا أبشاركم ، ولا ليأخذوا أموالكم ، ولكن أرسلهم إليكم ليعلموكم دينكم وسنة نبيكم . فمن فعل به سوى ذلك : فليرفعه إلي ؛ فوالذي نفسي بيده إذا لأقصنه منه ، فوثب عمرو بن العاص ، فقال يا أمير

المؤمنين : إن كان رجل من المسلمين أمر على رعية فأدب رعيته ، أئنك لتقصه منه ؟ قال : إي والذي نفس محمد بيده إذا لأقصنه منه ، وقد رأيت رسول الله ﷺ يقص من نفسه ، ألا لا تضربوا المسلمين فتذلوهم ، ولا تمنعوهم حقوقهم فتكفروهم ))[190].

واته : سوێند بە خودا من کاربەدەستەکانم ڕەوانە ناکەم بۆ ئێوە بۆ ئەوەی لە ڕوومەتتان بدەن ، ونە بۆ ئەوەی ماڵ وسامانتان بەتاڵان بەرن ، بەڵکو ڕەوانەم کردوون بۆ ئەوەی فێری ئاینی خودا وسوننەتی پێغەمبەرەکەیتان ﷺ بکەن ، هەریەکە لەوان کارێکی جگە لەوەی کرد سکاڵای لێبکەن ، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە تۆڵەی لێدەکەمەوە ، عەمری کوڕی العاص رضي الله عنه هەستایە سەرپێ ، وتی : ئەی فەرمانڕەوای باوەڕداران ئەگەر کەسێك کرا بە کاربەدەست بەسەر کۆمەڵێك موسڵمانەوە لە هەندێکیانیدا بەمەبەستی فێرکردن وتەمێ کردن تۆ هەر تۆڵەی لێدەکەیتەوە ؟ فەرمووی : سوێند بەو کەسەی گیانی محمدی ﷺ بەدەستە تۆڵەی لێدەکەمەوە ، چونکە من پێغەمبەری خودام ﷺ بینیی تۆڵەی لە نەفسی خۆشی دەکردەوە !؟ تکا دەکەم لە موسڵمانان مەدەن وزەبوونیان مەکەن ، ومافەکانیان پێشیل مەکەن بۆ ئەوەی لە ئاین هەڵنەگەڕێنەوە وبێباوەڕ نەبنەوە .

ئەوە لە کاتێکدایە کە کاربەدەست لە خەڵك بدات لێدانێکی ناڕەوا ، بەڵام لێدانی ڕێگا پێدراو ، تۆڵەکردنەوەی تێدا نییە بەکۆڕای زانایان ، چونکە ئەو لێدانە یا پێویستە ، یا سوننەتە یان دروستە .

---

١٩٠.رواه أبوداود(٤٥٣٧) ، والنسائي(٤٧٧٧) ، وضعفه الألباني في (ضعيف سنن النسائي)(٣٣٠).

## بەشی تۆڵە کردنەوە لە ڕوشانی ناموس وکەرامەت

تۆڵـە کردنەوە لـە ڕوشانی کەرامەت دروستە ، وەك ئەوەی کابرایەك نەفرەت بکات لـە یەکێك یان نزای لێبکات ، دەتوانێت وای پێ بلێتەوە ، وهەروەها ئەگەر جنێوی پێدا بە جنێوێك درۆی تێدا نەبێت ، بەڵام لێبوردن باشترە ، خودا دەفەرموێت : ﴿وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا ۖ فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٠﴾ وَلَمَنِ ٱنتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَا عَلَيْهِم مِّن سَبِيلٍ ﴿٤١﴾﴾(الشُّورَىٰ) .

واتە : پاداشتی خراپە ، خراپەیەکی وەك خۆیەتی ، ئەوەی لێبوردەبێت وئاشتەوایی بکات پاداشتی لای خودایە ، بە ڕاستی خودا ستەمکارانی خۆش ناوێت ، وئەوەی ستەمی لێکراوە تۆڵـەی خۆی کردەوە ئەوانە هیچیان لـەسەر نییە .

وپێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((المستبان :ما قالا فعلى البادئ منهما ما لم يعتد المظلوم))[١٩١].

واتە : دوو کەس کە دەبێتە شەڕە جنێویان : هەرچی بلێن تاوانەکەی لـە ئەستۆی ئەوەیانە کە دەست پێشخەر بووە ، بە مەرجێك ئەگەر ستەم لێکراوەکە لـەوە خراپتر نەڵێت کە ئەوی تر وتویەتی .

وئەو جنێوەی کە درۆی تیادا نییە وەك ئەوەی باسی ئەو خراپانە بکات کە تیایدایە ، یان بە سەگ وگوێدرێژ وهاوشێوەکانیان ناوی ببات ، بەڵام ئەوەی شتێکی هەڵبەستراو بداتە پاڵی ئەگەر بە بێباوەڕ ولـە ڕێگا دەرچوو وتاوانباری دابنێت دروست نییە ئەم بە

١٩١. رواه مسلم(٢٥٨٧).

بێباوەڕ ولە ڕێگا دەرچوو وتاوانباری دابنێت بە نارەوا ، وئەگەر نەفرەتی کرد لە باوك وعەشیرەتی یان خەڵکی ولاتەکەی ، دروست نییە ئەم بە خراپ ناوی ئەوانە بهێنێت ، چونکە ئەوان ستەمیان لە ئەم نەکردووە ، خودا دەفەرموێت : ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُونُوا۟ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلْقِسْطِ ۖ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُوا۟ ۚ ٱعْدِلُوا۟ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ۖ ﴿٨﴾﴾(المَائِدَة) .

واتە : ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ئێوە بە فەرمانەکانی خودا هەستن وگەواهی دادپەروەرانە بدەن ، با ڕق وکینەتان لەکەسانێك واتان لێ نەکات دادپەروەر نەبن ، دادپەروەربن چونکە ئەوە لە خودا ترسانەوە نزیکترە .

خودا فەرمان دەکات بە موسڵمانان کە ڕق بوونیان لە بێباوەڕان نەبێتە ڕێگری ئەوەی دادپەروەربن ودەفەرموێت : ﴿ٱعْدِلُوا۟ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ۖ ﴿٨﴾﴾(المَائِدَة) ، ئەگەر ستەم کردن لە کەرامەتیان حەرام بێت ، بە هۆی ئەوەی دەروونی پێ بشکێتەوە ، کەواتە : تۆڵەشیان لێدەکرێتەوە ئەگەر ستەمێکی وایانکرد ، وەك ئەو کەسەی نزای کردبێت لە کەسێك دروستە بەو نزایە نزای لێبکرێت کە لە بەرامبەرەکەی کردووە ، بەڵام ئەگەر سنورێکی خودای بەزاند وەك ئەوەی درۆیەك بکات دروست نییە بەرامبەری ئاوها کارێك بکات ، زۆربەی شەرعناسان دەڵێن : ئەگەر کەسێك بکوژرێت بە سوتاندن یان بە خنکاندن لە ئاودا یان خنکاندنی بەدەست ، هەر بەو شێوەیەش تۆڵە لە بکوژەکە دەکرێتەوە ، بەمەرجێك ئەو کارەی کە ئەنجامدراوە لە خودی خۆیدا حەرام نەبێت وەك مەی پێخواردنەوەی ونێربازی کردن لەگەڵی ، وهەندێکیان دەڵێن : هەموو ئەو کارانە تۆڵەی تەنها کوشتنییەتی بە شمشێر ، بەڵام بۆچوونی یەکەم لە قورئان وسوننەت و دادیشەوە نزیکترە .

# بەشی درۆ بۆ هەڵبەستن وهاوشێوەی

ئەگەر درۆ بۆ هەڵبەستن تۆڵە کردنەوەی تیادا نەبێت ، بەڵام سزادەدرێت ، وەك حەددی بوهتان بۆکردن ئەوە لە قورئان وسوننەت وکۆڕای زاناياندا سەلماوە ، خودا دەفەرموێت : ﴿وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةً وَلَا تَقۡبَلُواْ لَهُمۡ شَهَٰدَةً أَبَدًاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ٤ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ وَأَصۡلَحُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٥﴾(النُّور) .

واتە : ئەوانەی بوهتان بۆ ئافرەتێکی داوێن پاك دەکەن وچوار گەواهیدەر ناهێنن ، هەشتا جەلدەیان لێدەن وئیدی هەرگیز گەواهیان وەرمەگرن ، ئەوانە کەسانێکی لەڕێ دەرچوو وتاوانبارن ، تەنها کەسانێك نەبێت لەوان کە پەشیمان دەبنەوە وکاری باش دەکەن خودا لێبوردە ومیهرەبانە .

ئەگەر ئافرەتێکی ئازاد تاوانبارکرا بە شەروالّ پیسی یان نێربازی ئەو کەسە حەددی بوهتانی لێدەدرێت کە هەشتا جەلدەیە ، وئەگەر شتی تری دایە پالّ سزادەدرێت وسەرزەنشت دەکرێت .

ئەم حەددە بەسەر ئەو کەسەدا دەسەپێت کە بوهتانەکەی کردووە ، بە مەرجێك کەسە ستەم لێکراوەکە داوای ئەوە بکات ، وئەگەر لێی خۆش بوو لەسەری دەکەوێت لای زۆربەی زانایان ، چونکە ئەوەی ستەمی لێکراوە ئادەمیزادە وەك تۆڵەکردنەوە وپێ بژاردنی پارە وایە ، ووتراوە : لەسەری ناکەوێت لەبەر مافی خودا لەبەر ئەوەی ناتوانرێت بچوێنرێت بە حەددەکانی تر ، وپێویستە ئەو سزایە جێبەجێ بکرێت ئەگەر

ئافرەتە تاوانبارکراوەکە موسڵمانێکی ئازادی داوێن پاك بێت ، بەڵام ئەگەر کەسە بوهتان بۆکراوەکە بەکەسێکی خراپەکار ناوبانگی دەرکردبێت ئەو کەسەی بوهتانەکەی بۆ دەکات حەددی لێنادرێت ، وهەروەها ئەگەر بێباوەڕ بێت یان کۆیلە بێت ، بەڵام کەسە بوهتان کارەکە سەرزەنشت دەکرێت ، بەڵام بۆ مێرد دروستە ژنەکەی تاوانبار بکات ئەگەر شەروالّپیسی کرد ، ئەگەر لەو کارە سکپڕ نەبوو بێت ، وئەگەر سکپڕ بوو کە منداڵەکەی بوو ، دەتوانێت تاوانباری بکات ومنداڵەکەش نەگرێتە ئەستۆ ، بۆ ئەوەی کەسێك نەگرێتە خۆی کە لە ئەو نەبێت ، وئەگەر تاوانبارکرا بەشەروالّ پیسی یان ئەوەیە دانی پیادا دەنێت یان دەبێت (ملاعنة) بکرێت وەك چۆن باسی لە قورئان وسوننەتدا هاتووە ، وئەگەر کەسە بوهتان کارەکە کۆیلە بوو نیوەی ئەو حەددەی لەسەر پێویست دەبێت کە لەسەر ئازادێك پێویستە ، وهەروەها لە جەلدەی شەروالّپیسی وخواردنەوەی مەیشدا ، چونکە خودا لە مافی کەنیزەکەکاندا دەفەرموێت : ﴿فَإِنۡ أَتَيۡنَ بِفَٰحِشَةٖ فَعَلَيۡهِنَّ نِصۡفُ مَا عَلَى ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ مِنَ ٱلۡعَذَابِۚ ٢٥﴾(النِّسَاء) .

واتە : ئەگەر شەروالّپیسیان کرد ئەوا نیوەی ئافرەتە ئازادەکان سزادەدرێن .

بەڵام ئەگەر سزاکەی کوشتن ودەست بڕین بێت ئەوا ئەو سزایانەیان بەسەردا دەسەپێت.

## بەشی مافەکانی ژن ومێردایەتی

ولە پێشێل کردنی مافی ژن ومێردایەتی دەبێت حوکم بکرێت لە نێوانیان بەوەی خودای بالادەست فەرمانی پێکردووە ، بە ڕاگرتنی ئافرەت بە باشی یان دەستبەردار بوونی بە باشی ، پێویستە لەسەر هەریەکە لە ژن وپیاو مافی بەرامبەرەکانیان بە باشی بەجێ بهێنن ، بە ڕەزامەندی وسنگێکی فراوانەوە ، ژن مافی هەیە لەسەر پیاوەکەی لە ماڵ ومارەی وبژێوی بەشێوەیەکی ئاسایی ، ومافیشی هەیە لە لاشەیدا لە باش ژیان لەگەڵی وبەجێهێنانی ئارەزووەکانی ، بە جۆرێك ئەگەر پشتی لێکرد ولەگەڵیدا جووت نەبوو دەتوانێت داوای جیابوونەوەی لێبکات بەکۆڕای موسڵمانان ، وئەگەر توانای یان ئارەزووی جووت بوونی نەدەکرد دیسان دەتوانێت لێی جیا ببێتەوە ، وجووت بوونی پیاو لەگەڵ خێزانەکەی پێویستە لای زۆربەی زانایان .

ووتراوە : نابێت بهێڵرێتەوە بۆ حەزی سروشتی ، بەڵام ئەوەی ڕاستیە وسەلماوە بە قورئان وسوننەت وبنچینەکانیش (الأصول) ئەوەیە کە پێویستە (واجب) ، پێغەمبەری خودا ﷺ کاتێك بینی عبداللەی کوڕی عەمر رضي الله عنهما زۆر ڕۆژوو ونوێژ دەکات پێی فەرموو : (( إن لزوجك عليك حقاً ))[192].

واتە : خێزانەکەت مافی بەسەرتەوە هەیە .

---

١٩٢. رواه البخاري(٦٥٣٣) ، ومسلم(١٦٨٧).

دواتر وتراوە : پێویستە لەسەری بەلایەنی کەمەوە چوار مانگ یەکجار لەگەڵیدا جووت بێت ، ووتراوە : پێویستە لەگەڵیدا جووت بێت بە گوێرەی توانای پیاو وپێداویستی ئافرەتەکە ، وەك چۆن بژێوی لەسەری پێویستە،ئەمەش لە ڕاستیەوە نزیکە.

ومافی پیاو لەسەر خێزانی ئەوەیە هەرکاتێك ویستی لەگەڵیدا جووت بێت ئافرەتەکە لاری نەبێت ، بە مەرجێك زیانی تەندروستی نەبێت بۆی ، یان لە بەجێهێنانی ئەرکێکی شەرعی دوای نەخات ، پێویستە لەسەری داواکانی بەجێ بهێنێت ، ونابێت لە ماڵ دەربچێت بەبێ پرسی پیاوەکەی لەبەر پێداویستییەکی شەرعی نەبێت ، وشەرعناسەکان ناکۆکن لەسەر ئەوەی ئایا ڕاپەڕاندنی ئیش وکاری ماڵ وەك پاك وخاوێنی ناوماڵ وگسك دان وچێشت لێنان ... هتد ، پێویستە لەسەر ئافرەت یان نا ؟ وتراوە پێویست نییە لە سەری ، ووتراویشە ئاسانکاری بۆ بکرێت .

# بەشی ماڵ وسامان

لە ماڵ وساماندا پێویستە حوکم لە نێوان خەڵك بەدادوەرانە بکرێت وەك خودا وپێغەمبەرەکەی ﷺ فەرمانیان پێکردووە ، بۆ نموونە پێویستە میراتی بەو شێوەیە دابەش بکرێت لە نێوان میراتگرەکان کە قورئان وسوننەت فەرمانیان پێکردووە ، ئەگەرچی موسڵمانان لە هەندێك لەو شتانە ناکۆکن ، وهەروەها لە کڕین وفرۆشتن وبەکرێدان ولە بری دانان وپێکەوە کارکردن وبەخشین ومالّی وەقف ووەسیەت ... هتد ، وهەموو ئەو کردەوانەی کە وابەستەیە بە گرێبەست وپارە وەرگرتن ، داد تیایدا مایەی خۆش گوزەرانی دونیا ودوارۆژیشە ، نە دونیا ونە دوارۆژیش بەوە نەبێت بەدەست نایەت ، ڕەچاوکردنی دادپەروەری لە هەموو ئەو شتانەی کە بە ژیری مرۆڤ دەرکی پێدەکرێت پێویستە ، وەك پێدانی نرخ لەبری ئەو شتەی کە وەردەگیرێت وبەپێچەوانەشەوە ، وحەرام بوونی دزی کردن لە کێشانە وپێوانە ، وپێویستی ڕاستگۆی وباسکردنی باشە وخراپەی کاڵا ، وهەروەها حەرامی درۆ کردن وناپاکی کردن وفرتوفێڵ ، وپێویستە ئەو کەسەی قەرزارە بەوەفا بێت وسوپاس گوزاربێت .

وهەندێك کڕین وفرۆشتن حوکمی پەنهانە ولای هەمووان ڕوون نییە ، شەریعەتەکان یان شەریعەتی ئیسلامی پێی هاتووە ، هەرچی کڕین وفرۆشتن وبازرگانییەك قورئان وسوننەت یاساغیان کردبێت لەبەر بەدیهاتنی داد وقەدەغەکردنی ستەمە بە ورد ودرشت وەك : خواردنی مالّی خەڵك بە ناڕەوا ، وسوو ، پێغەمبەری خودا ﷺ یاساغی کردووە لە فرۆشتنێك فێڵ وتەڵەکەی تێدا بێت وەك فرۆشتنی بێچوو لە سکی دایکی ، وفرۆشتنی باڵندە لە هەوا ، وماسی لە ئاودا ، وفرۆشتن بۆ کاتێکی دیاری کراو ، وهێشتنەوەی شیر لە گوانی ئاژەڵ وفرۆشتنی بە نرخی ئەوەی کە ئەم ئاژەڵە هەر

بەو شێوەیە شیرداره ، وفرۆشتنی خانووی دارِوخاوی بەرِوکەش نۆژەنکراو بەنرخی خانوی باش وتازه ، وفرۆشتن بەدەست لێدان (لمس) ، وفرۆشتن به هاوێشتنی شتێك به جۆرێك كه ئەو شته كەوته سەر هەرشتێك پێویسته ئەو شته بكرِیت ، وفرۆشتنی خورمای وشك به (رطب) ، وتریٚ به مێوژ ، وگەنم به گەنمێك لە گوڵەكەیدابێت ، وفرۆشتنی دەغڵودان پێش پێگەیشتنی ، وگرانكردنی كاڵا بەبیٚ ئەوەی مەبەستی كرِینی بێت ، وهەموو ئەو كرِین وفرۆشتنانەی كه جۆرێك لە فێڵ ودەست برِینی تیادایه وەك ئەوەی بڵێت : بەروبوومی ئەو پارچه زەویەت پیٚ دەفرۆشم ، هاوشێوەی ئەو جۆره كرِین وفرۆشتنانه موسڵمانان تیایدا ناكۆكن لەبەر ئەوەی حوكمەكانی شاراوەیه ولە یەك چوونن ، هەندێك ئەو گرێبەست وكرِین وفرۆشتنانه به رِەوا ودروست دەزانێت ، وهەندێكی تر بەستەم وبەتاڵی دەزانێت ، خودای پەروەردگار دەفەرموێت : ﴿أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ٥٩﴾(النِّسَاء) .

واته : گوێرِایەڵی خودا وگوێرِایەڵی پێغەمبەر ﷺ وكاربەدەستانبن ، ئەگەر لەشتێك ناكۆكی كەوته نێوانتان بیگەرِێننەوه بۆ لای خودا وپێغەمبەر ﷺ ، ئەگەر ئێوه باوەرِتان به خودا ورِۆژی دوایی هەیه ، چونكه ئەوه باشترین ودادپەروەرانەترین چارەسەره .

وله بنچینەدا هیچ كرِین وفرۆشتنێك لەسەر خەڵك حەرام نییه مەگەر ئەوانەی نەبێت كه دەقی قورئان وسوننەت هەبێت لەسەر حەرام كردنی ، وەك چۆن هیچ پەرستشێك كه مەبەست نزیك بوونەوه بێت لە خودا دروست نییه هەتا بەڵگەی لە قورئان یان لە سوننەت لەسەر نەبێت ، چونكه تەنها ئەوه ئاینه كه خودا فەرمانی پێكردبێت ، وتەنها ئەوەش حەرامه كه خودا حەرامی كردبێت ، به پێچەوانەی ئەوانەی كه خودا به خراپ باسی كردوون كه لە خۆیانەوه هەندێك شتیان حەرام كردووه كه

خودا فەرمانی بە حەرام بوونی نەکردووە ، وهاوتایان بۆ خودا بڕیارداوە کە خودا بەوە فەرمانی پێنەکردوون ، وشەریعەت وبەرنامەیان بۆ خەڵك دارِشتووە کە خودا ڕێگای بە کارێکی لەو شێوە نەداوە ، پەروەردگار یارمەتیمان بدە بۆ ئەوەی چ شتێکت حەلاڵ کردووە ئەوە بە حەلاڵ بزانین وچ شتێکت حەرام کردووە هەر ئەوە بەحەرام بزانین ، وئاین وپەرستشمان بەو شێوەیە بێت کە تۆ پێی ڕازیت .

کاربەدەست ناتوانێت کاری بە پرس وڕاویژ نەبێت ، چونکە خودا فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کردووە بە پەرس وڕاویژ ، خودا دەفەرموێت : ﴿فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِۖ فَإِذَا عَزَمۡتَ فَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَوَكِّلِينَ ١٥٩﴾(آلِ عِمۡرَان) .

واتە : لێبوردەبە لەگەڵیان وداوای لێخۆش بوونیان بۆ بکە ، ولە ئیش وکارەکانت پرس وڕاویژیان پێبکە ، ئەگەر سوربوویت لەسەر کارێك دوای ڕاویژکاریی پشت بە خودا ببەستە ، خودا ئەو کەسانەی خۆش دەوێت کە پشتی پێدەبەستن .

وئەبو هرەیرە رضي الله عنه دەڵێت : ((لم يكن أحد أكثر مشاورة لأصحابه من رسول الله ﷺ))[193].

واتە : هیچ کەسێك هێندەی پێغەمبەری خودا ﷺ پرس وڕاویژی بە هاوەڵانی نەکردووە .

ووتراوە : خودا فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کردووە بۆ ئەوەی دڵی هاوەڵانی ڕابگرێت ، وئەوانەی دوای ئەو دێن چاوی لێبکەن ، وبۆ ئەوەی ڕایان وەربگرێت لەو ئیش وکارانەی کە سروشی پێنەهاتووە لە کاروباری جەنگ وئیش وکارە لاوەکیەکان ، کە وابوو کەسانی تر زیاتر پێویستیان بە ڕاویژکاری هەیە لە پێغەمبەر ﷺ .

193. رواه الترمذي (١٧١٤) ، وضعفه الألباني في (ضعيف الترمذي).

وخودا ستایشی باوەڕداران بەوە دەکات ودەفەرموێت : ﴿وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ٣٦ وَٱلَّذِينَ يَجۡتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡفَوَٰحِشَ وَإِذَا مَا غَضِبُواْ هُمۡ يَغۡفِرُونَ ٣٧ وَٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِرَبِّهِمۡ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ٣٨﴾(الشُّورَىٰ).

واتە : ئەو پاداشتەی خودا لای خۆی ئامادەی کردووە بۆ ئەوانەی باوەڕیان هێناوە وپشت بە پەروەردگاریان دەبەستن ، وئەوانەی لە تاوانە گەورەکان وشەروالْپیسی خۆیان دەپارێزن ولە کاتی توڕەبووندا ڕەوشت بەرز ولیبوردەن ، وئەوانەی کە بەدەم بانگەوازی خوداوە ڕۆشتون ونوێژەکانیان بەجێدەهێنن وئیش وکارەکانیان بە پرس وڕا بەڕێوەدەبەن ولەوەی ڕۆزیمان داون دەبەخشن .

وئەگەر ڕاوێژ پێکراوەکان هەندێکیان شتێکیان وەبیرهێنایەوە کە فەرموودەی خودا یان پێغەمبەرەکەی ﷺ یان کۆڕای موسڵمانانی لەسەر بوو پێویستە هەمووان پابەندی ئەوەبن ، وگوێڕایەڵی کەسی تر ناکرێت لە پێچەوانەی ئەو کارە ، ئەگەرچی کەسێکی گەورە وناوداریش بێت لە دونیا وئایینیشدا ، خودا دەفەرموێت : ﴿أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ ٥٩﴾(النِّسَاء) .

واتە : گوێڕایەڵی خودا وگوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ وکاربەدەستانبن .

وئەگەر کار وفەرمانێك موسڵمانان تێیدا ناکۆك بوون پێویستە لە هەموو بۆچوونە جیاوازەکان ڕایەکی تۆکمە ونزیك لە قورئان وسوننەت هەڵبژێردرێت وکاری پێبکرێت ، وەك خودا دەفەرموێت : ﴿فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ٥٩﴾(النِّسَاء) .

واتە : ئەگەر لەشتێك ناكۆكی كەوتە نێوانتان بیگەڕێننەوە بۆ لای خودا وپێغەمبەر ﷺ ، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بە خودا ورۆژی دوایی هەیە ، چونكە ئەوە باشترین ودادپەروەرانەترین چارەسەرە .

كاربەدەستان دوو بەشن : ئەوانیش فەرمانڕەواكان وزاناكانن ، ئەگەر ئەوان باشبن خەڵك باش دەبێت ، بۆیە پێویستە لەسەر هەریەكە لەوان زۆر وریای كردار وگوفتاریانبن ، وگوێڕایەڵی خودا وپێغەمبەرەكەیبن ﷺ وشوێنی كتێبەكەی خودا بكەون ، ئەگەر لە هەركێشەیەكدا بەڵگەی قورئان وسوننەت زانرا پێویستە گوێڕایەڵی بكرێن ، بەڵام ئەگەر دۆزینەوەی بەڵگە ئاسان نەبوو لەبەر نەبوونی كات یان بێ توانایی كەسەكە ، یان چەند بەڵگەیەكی هەبێت پێی وابێت هەموویان هاوتای یەكن ، بۆی هەیە لاسایی (تقلید) كەسێك بكات كە لە ئاین وزانستی شەرعی ئەو كەسە ڕازی بێت ، ئەمە بەهێزترین بۆچوونە ، ووتراوە : بۆی نییە بە هیچ شێوەیەك لاسایی بكاتەوە ، وبەپێچەوانەی ئەمانەوە وتراوە لە هەموو حاڵەتێكدا بۆی هەیە لاسایی بكاتەوە ، ئەو سێ بۆچوونە لە مەزهەبی ئەحمەد ومەزهەبەكانی تریشدا هاتووە .

وئەو مەرجانەی كە پێویستە لە قازی وكاربەدەستاندا هەبێت پێویستە ڕەچاو بكرێت بەگوێرەی توانا ، وهەروەها هەرچی مەرجی خودا پەرستی ونوێژ وتێكۆشان هەیە هەموو ئەوانە بەگوێرەی توانا دەبێت ڕەچاوبكرێن ، وئەگەر ئەستەم بوو ئەو سیفەتانە دەست بكەون ئەوكات خودا بە گوێرەی توانا داوا دەكات ، لەبەر ئەوە خودا فەرمانی كردووە كەسێك بیەوێت نوێژ بكات پێویستە دەست نوێژ بشوات ، بەڵام كە نەبوو ، یان بەكارهێنانی زیانی هەبوو لەبەر ساردی یان لەبەر برینێك یان هەر هۆیەكی تر ، لەسەر زەمینێكی پاك تەیەموم دەكات ودەست بەدەستەكان وڕوومەتیدا دەهێنێت ،

وپێغەمبەر ﷺ بە عومرانی کوڕی حوصینی فەرموو : (( صل قائماً ، فإن لم تستطع فقاعداً ، فإن لم تستطع فعلى جنب ))[194].

واتە : نوێژ بە پێوە ئەنجام بدە ، ئەگەر نەتتوانی بە دانیشتنەوە ، ئەگەر هەر نەتتوانی بە ڕاکشاوی ئەنجامی بدە .

خودا نوێژی پێویست کردووە بەهەر شێوەیەك ئەنجام بدرێت ، وەك خودا دەفەرموێت : ﴿حَـٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَـٰنِتِينَ ﴿٢٣٨﴾ فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالًا أَوْ رُكْبَانًا ۖ فَإِذَآ أَمِنتُمْ فَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَمَا عَلَّمَكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٣٩﴾﴾(البَقَرَة).

واتە : پارێزگاری لە نوێژە فەرزەکانتان بکەن وبەجوانی لە کاتی خۆیاندا ئەنجامیان بدەن ورەچاوی هەموو مەرج وپێویستیەکانی بکەن وبەردەوامبن لەسەریان بە تایبەت نوێژی ناوەند کە نوێژی عەسرە ، هەستن وسەرکز وملکەچی فەرمانی خودابن ، ئەگەر ترسان بە شێوەیەکی ئاسایی نوێژ ئەنجام بدەن بە پیادە یان بە سواری نوێژەکانتان ئەنجام بدەن ، ئەگەر ترس ڕەویەوە وئاسایشتان بۆ گەڕایەوە نوێژەکانتان ئەنجام بدەن ویادی خودا بکەن بەو شێوەیەی کە فێری کردوون لە کاتێکدا پێشتر نەتاندەزانی .

نوێژی لەسەر کەسێکی ئاسایی وکەسێك کە لە جەنگدایە پێویست کرد ، وهەروەها لەسەر ساغ ونەخۆش ودەوڵەمەند وهەژار ، ونیشتەجێ وگەشتیار ، ولەسەر ئەو کەسەی کە دەترسێت ولە جەنگدایە ، ونەخۆش ئاسانکاری بۆ کراوە وەك چۆن لە قورئان وسوننەتدا هاتووە ، وهەروەها هەموو پێداویستیەکانی ئەو پەرستشەی پێویست کردووە ، وەك خۆشۆردن لە لەش گرانی ودەستنوێژ هەڵگرتن ، وخۆداپۆشین وڕووکردنە قیبلە ، وهەرشتێك کە بەندەکانی نەتوانن لەسەری هەڵگرتوون ، ئەگەر کەشتی کۆمەڵە خەڵکێك پەکی کەوت یان چەتە وڕێگر جلوبەرگەکانی بردن ، دەتوانن بە ڕووتی نوێژ بکەن وئیمامەکەیان لە ناوەڕاستیان دەوەستێت بۆ ئەوەی لە

---

194. رواه البخاري(1117).

دواوە نەیبینن بە گوێرەی توانایان ، وئەگەر قیبلەیان لیٚ تێکچوو هەوڵدەدەن ڕووگەکە بدۆزنەوە ئەگەر ئەستەم بوو چۆن توانیان نوێژ دەکەن ، وەك گێڕدراوەتەوە لە سەردەمی پێغەمبەری خودا ﷺ وایان کردووە ، هەروەهاش فەرمانڕەوایەتی وتێکۆشان وهەموو کاروباری ئاین ، هەموو ئەوانە ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەریان : ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ ١٦﴾(التَّغَابُن).

واتە : لە خودا بترسن بە گوێرەی تواناتان .

وئەو فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی : (( إذا أمرتكم بأمر فأتوا منه ما استطعتم ))[195].

واتە : ئەگەر فەرمانم پێکردن بە فەرمانێك بە گوێرەی توانا پێی هەستن .

وەك چۆن خودا خواردنە پیسەکانی حەرام کردووە دەفەرموێت : ﴿فَمَنِ ٱضۡطُرَّ غَيۡرَ بَاغٖ وَلَا عَادٖ فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِۚ ١٧٣﴾(البَقَرَة).

واتە : ئەوەی ناچار بوو دەتوانێت لەو خواردنە پیسانە بخوات بەبیٚ ڕۆچوون ، هیچی لەسەر نییە وتاوانبار نابێت .

ودەفەرموێت : ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلدِّينِ مِنۡ حَرَجٖۚ ٧٨﴾(الحَجّ).

واتە : خودا لە ئاینی ئیسلام دا ئاسانکاری بۆ کردوون وشتی لە توانا نەبوو داوا ناکات لێتان .

وخودا دەفەرموێت :﴿ مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجۡعَلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ حَرَجٖ ٦﴾(المَائِدَة) .

واتە : خودا نایەوێت تووشی تەنگەژە وسەغڵەتیتان بکات .

کەوابوو شتی لە توانادا نەبوو پێویست نەکراوە ، وئەوەی کە ناچاربێت بە ئەنجامدانی حەرام نەکراوە ، ئەگەر ئەو ناچارییە مرۆڤەکە بەهۆی ستەم وتاوانێکەوە تووشی نەبووبێت.

---

195. رواه البخاري(٧٢٨٨) ، ومسلم(١٣٣٧).

## بەشی پێویستیی هەبوونی کاربەدەست ولێپرسراو

پێویستە بزانرێت کە بەڕێوەبردنی خەڵك لە گەورەترین پێداویستیەکانی (واجبات) ئاینە ، بەڵکو نەئاین ونەدونیاش دەستەبەر نابن بەبێ کاربەڕێوەبەران ، چونکە بەرژەوەندی ئادەمیزاد وئیش وکاریان بەیەك دەڕوات ، ولەو نێوەندەدا پێویستە سەرکردەیەکیان هەبێت ، هەتاکو ئەبوسەعید وئەبوهرەیرە رضي الله عنهما لە پێغەمبەر ﷺ ڕیوایەتیان کردووە فەرموویەتی : (( إذا خرج ثلاثة في سفر فليؤمّروا أحدهم ))[196].

واتە : ئەگەر سێ کەس لە سەفەرێکدا پێکەوە بوون با کەسێکیان بکەنە دەم سپی وکاربەڕێوەبەریان .

وئیمامی ئەحمەد لە موسەندا لە عبداللەی کوڕی عەمری رضي الله عنهما گێڕاوەتەوە : پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی : (( لا يحل لثلاثة يكونون بفلاة من الأرض إلا أمروا عليهم أحدهم ))[197].

واتە : دروست نییە بۆ سێ کەس لە بیابانێکدابن کەسێکیان نەکردبێت بە دەم سپی وبرا گەورەی خۆیان .

پێغەمبەر ﷺ واجبی کرد کەسێك ئەمیر بێت لە کۆبوونەوەیەکی کەمدا لە کارێکی لەناکاو لە سەفەردا ، وەك سەرنج ڕاکێشانێك بۆ هەموو جۆرە کۆبوونەوەیەك ، ولەبەر ئەوەی خودا فەرمان بە چاکە وپاساغی کردن لە خراپەی پێویست کردووە کە ئەوەش

---

١٩٦. رواه أبوداود(٢٦٠٨، ٢٦٠٩) ، وصححه الألباني في (صحيح الجامع)(٥٠٠).

١٩٧. رواه أحمد(٦٦٠٩) ، وضعفه الألباني في (الضعيفة)(٥٨٩).

بەهێز ودەسەڵات نەبێت فەراهەم نابێت ، وهەروەها پێداویستییەکانی ئاین لە تێکۆشان ودادپەروەری وئەنجامدانی حەج ونوێژی هەینی وجەژنەکان وسەرخستنی ستەم لێکراو وئەنجامدانی حەد بەسەر تاوانباراندا هەموو ئەوانە بە هێز ودەسەڵات نەبێت ناتوانرێت جێبەجێ بکرێن ، لەبەر ئەوە ڕیوایەت کراوە : ((إن السلطان ظل الله في الأرض))[١٩٨] .

واتە : کاربەدەست سێبەری خودایە لەسەر زەوی .

ووتراوە : شەست ساڵ حوکمی کاربەدەستێکی ستەمکار باشترە لە شەوێك بە بێ کاربەدەستی وبشێوی ، وبەتاقیکردنەوەش ئەوە سەلماوە .

لەبەر ئەوە پێشینانی وەك فوضەیلی کوڕی عیاض وئەحمەدی کوڕی حەنبەل وکەسانی تریش دەڵێن : ئەگەر دوعایەکی قبووڵکراومان هەبوایە ئەوە بۆ کاربەدەستمان دەکرد ، وپێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی : (( إن الله يرضى لكم ثلاثاً : أن تعبدوه ولا تشركوا به شيئا ، وأن تعتصموا بحبل الله جميعا ولا تفرقوا ، وأن تناصحوا من ولاه الله أمركم))[١٩٩] .

واتە : خودای پەروەردگار بە سێ شت لێتان ڕازی دەبێت : بیپەرستن وهاوەڵی بۆ بڕیار نەدەن ، ودەست بە بەرنامەی خوداوە بگرن وناکۆك وناتەبا مەبن ، وئامۆژگاری کەسانێك بکەن کە خودا دەیکات بە کاربەدەست بەسەرتانەوە .

---

١٩٨. رواه ابن أبي عاصم في السنة(٤٩٢/٢) ، وحسنه الألباني في (ظلال الجنة)(١٠٢٤).

١٩٩. رواه مسلم(١٧١٥).

وفەرموویەتی: (( ثلاث لا يغل عليهن قلب مسلم : إخلاص العمل لله ، ومناصحة ولاة الأمور ، ولزوم جماعة المسلمين ، فإن دعوتهم تحيط من ورائهم ))[٢٠٠].

واتە : سیٚ شت بە هۆیانەوە دڵی موسڵمان لە رِق وکینە پارێزراو دەبێت : ئیش وکارکردن تەنها لەبەر خودا ، وئامۆژگاری کردنی کاربەدەستان ، وپابەندبوون ودەستگرتن بە کۆمەڵی موسڵمانانەوە ، وپاڕانەوە بۆیان چونکە نزاو پاڕانەوە دەبێتە پاڵپشت وپارێزەریان .

ولە صەحیحی موسلمدا لێی گێڕدراوەتەوە کە فەرموویەتی : (( الدين النصيحة ، الدين النصيحة ، الدين النصيحة . قالوا : لمن يا رسول الله ؟ قال : لله ولكتابه ولرسوله ولأئمة المسلمين وعامتهم ))[٢٠١].

واتە : سیٚ جار فەرمووی : ئاین ئامۆژگارییە ، وتیان : بۆ کیٚ ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ؟ فەرمووی : بۆ خودا وقورئان وپێغەمبەر وپێشەوای موسڵمانان وهەمووان .

کەوابوو هەبوونی پێشەوا وقەڵەمڕەو وحاکم وکاربەدەست پێویستییەکی ئاینییە ودەتوانرێت بە هۆیەوە لە خودا نزیك ببێتەوە ، چونکە هەست بە ترسی خودا وچاودێری کردنی سنورەکانی وپابەندبوون بە پەیامەکانی پێغەمبەری پێشەواوە ﷺ لە کاتی کاربەدەستیدا باشترین کارێکە بەهۆیەوە رەزامەندی خودا بەدەست بێت ، بەڵام زۆر کەس بە هۆی پلەوپایەوە دەگۆڕێن وگەندەڵ دەبن چونکە مەبەستیان کورسی وکۆکردنەوەی ماڵ وسامانە ، کەعبی کوڕی مالیك رضي الله عنه لە پێغەمبەری خودا ﷺ

---

٢٠٠. رواه الترمذي (٢٦٥٨) ، وابن ماجه(٢٣٠) ، وصححه الألباني في (صحيح الجامع) (٦٧٦٦).

٢٠١. رواه مسلم(٥٥).

دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی : (( ما ذئبان جائعان أرسلا في زريبة غنم بأفسد لها من حرص المرء على المال و الشرف لدينه ))[٢٠٢].

واتە : دوو گورگی برسی بەربدرێنە گیانی گەلە مەڕێك خراپتر ناکەن لەوەی کە مرۆڤێك عەودالّی کۆکردنەوەی مالّ وسامان بێت وبەدوای ناوبانگ بگەڕێت لە ئاینەکەیدا ، ئەو دوو گورگە ئەوەندە زیان ناگەیەنن بەو گەلە مەڕە وەك ئەو دوو سیفەتە زیان لەو مرۆڤە دەدەن لە ئاینەکەی .

وخودا هەوالّ لەبارەی ئەو کەسانەوە دەدات کە نامەی کردەوەکانیان بەدەستی چەپیان وەردەگرن ودەفەرموێت : ﴿مَآ أَغۡنَىٰ عَنِّي مَالِيَهۡۜ ۝٢٨ هَلَكَ عَنِّي سُلۡطَٰنِيَهۡ ۝٢٩﴾(الحَاقَّة).

واتە : سامانەکەم سوودی پێنەگەیاندم ، وهەروەها پلەوپایەکەم لەدەست چوو لەوەش سوودم وەرنەگرت .

لوتکەی ویستی ئەوانەی وێلّ وعەودالّی پلەوپایەن وەك فیرعەونن ، وئەوانەی کە شەیدای کۆکردنەوەی پارەن وەك قارونن.

وخودا حالّی فیرعەون وقارونی لە قورئاندا باسکردووە و دەفەرموێت : ﴿۞أَوَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ كَانُواْ مِن قَبۡلِهِمۡۚ كَانُواْ هُمۡ أَشَدَّ مِنۡهُمۡ قُوَّةٗ وَءَاثَارٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمۡ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٖ ۝٢١﴾(غَافِر) .
واتە : بۆچی ناچن بەسەر زەویدا بگەڕێن وسەیربکەن وببینن کە سەرئەنجامی ئەوانەی پێش خۆیان چی بووە ، ئەوان زۆر بەهێز وخاوەن کۆشك وتەلار وباخ ودەغلّودان

---

٢٠٢. رواه الترمذي (٢٣٧٦) ، وصححه الألباني في (صحيح الجامع)(٥٦٢٠).

بوون ، خودا بە هۆی تاوانەکانیانەوە لەناوی بردن ، وهیچ شتێك نەبووە پەرژین کە پێش بە سزای خودا بگرێت .

ودەفەرموێت : ﴿تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْـَٔاخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا ۚ وَٱلْعَـٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٨٣﴾﴾(القَصَص) .

واتە : ئەو بەهەشتە ئامادەمان کردووە بۆ ئەو کەسانەی کە نایانەوێت خۆیان بەسەر خەڵکدا زاڵ بکەن وخۆیان بەزل نازانن و تاوانبار وگەندەڵکارنین ، وسەرئەنجام بۆ لە خودا ترسان و پارێزکارانە .

وخەڵك دەبنە چوار بەشەوە :

بەشی یەکەم : ئەوانەی دەیانەوێت خۆیان بەسەر خەڵکدا زاڵ بکەن ، وبشێوی بنێنەوە لەسەر زەویدا ئەویش لەسەر پێچی خودادا خۆی دەبینێتەوە ، ئەوانەش پادشا وسەرۆکە گەندەڵ وخراپەکارەکانن ، وەك فیرعون وحزب ودارودەستەکەی ، ئەوانە پیسترین وخراپترین دروستکراوی خودان ، خودا دەفەرموێت : ﴿إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِى ٱلْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَآئِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَآءَهُمْ وَيَسْتَحْىِۦ نِسَآءَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٤﴾﴾(القَصَص) .

واتە : فیرعەون خۆی بەزل وبالادەست دەزانی ، وخەڵکی پەرت پەرت کردبوو ، وکۆمەڵگەکەی دەچەوساندنەوە ، وکورەکانی سەردەبڕین وئافرەتەکانی دەکردن بە خزمەتکار ، بەڕاستی ئەو کەسێکی تێکدەر وخراپەکار بوو .

وموسلم لە صەحیحەکەیدا لە ئیبن مەسعودی ﵁ گێڕاوەتەوە دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : (( لا يدخل الجنة من في قلبه مثقال ذرة من كبر ،

ولا يدخل النار من في قلبه مثقال ذرة من إيمان ، فقال رجل يا رسول الله : إني أحب أن يكون ثوبي حسناً ، ونعلي حسنا ، أفمن الكبر ذاك ؟ قال : لا : إن الله جميل يحب الجمال ، الكبر بطر الحق وغمط الناس ))[٢٠٣].

واته : ناچێته بەهەشتەوە کەسێك بە قەد گەردیلەیەك فیز وخۆبەزل زانین لە دڵیدا بێت ، وناچێتە ئاگرەوە هەرکەسێك بە قەد گەردیلەیەك باوەڕ لە دڵیدا بێت ، پیاوێك وتی : ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ : من حەز دەکەم جل وبەرگەکەم جوان بێت وسەرپێییەکانم (نەعل) جوان بێت ئایە ئەوە لە فیز ولوت بەرزییە ؟ فەرمووی : نەخێر ، خودا جوانە وجوانیشی خۆش دەوێت ، فیز ولوت بەرزی بریتییە لە نکوڵی ڕاستی وخەڵك بەکەم زانین .

نکوڵی ڕاستی بریتییە لە چاوپۆشین وخۆ لێ گێل کردن ، وبەکەم زانینی خەڵك لە سوکایەتی پێکردن وماف پێشێل کردنیان خۆی دەبینێتەوە ، ئەمەش ئاکاری ئەوانەیە دەیانەوێت خۆسەپێن وبشێوی کاربن .

بەشی دووەم : ئەوانەی بشێوی دەنێنەوە بە بێ ئەوەی لوت بەرز وبەفیزبن وەك دزە تاوانبارەکان ، ئەوانە کەسانی سوك وڕیسوان .

بەشی سێیەم : ئەوانەن کە بەفیزن بەڵام تاوانبار وگەندەڵکارنین ، وەك ئەوانەی لە خوداترسن ودەیانەوێت بە هۆی ئەوەوە لە خەڵك بەرز وبڵندتربن .

---

٢٠٣. رواه مسلم (٩١).

بەشی چوارەم : ئەهلی بەهەشت نەبەفیز ونەتاوانبار ونەگەندەڵكارن ، لەگەڵ ئەوەی كە لە جگە لە خۆیان بەرز وبەڕێزترن ، وەك خودا دەفەرمویّت : ﴿وَلَا تَهِنُوا۟ وَلَا تَحۡزَنُوا۟ وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ١٣٩﴾(آلِ عِمۡرَان) .

واتە : لاواز مەبن وخەم مەخۆن چونكە ئێوە بەرز وبالاّن ئەگەر باوەڕداربن .

ودەفەرمویّت : ﴿فَلَا تَهِنُوا۟ وَتَدۡعُوٓا۟ إِلَى ٱلسَّلۡمِ وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ وَٱللَّهُ مَعَكُمۡ وَلَن يَتِرَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ ٣٥﴾(مُحَمَّد) .

واتە : لاواز مەبن وداوای ئاشتی بكەن لە بێبڕواكان ، ئێوە بەرز وبڵندن ، وخوداتان لەگەڵدایە ولە پاداشتی كردەوەكانتان كەم ناكاتەوە .

ودەفەرمویّت : ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ ٨﴾(المُنَافِقُون) .

واتە : بالاّدەستی وبەهێزی بۆ خودا وبۆ پێغەمبەری خودا ﷺ و باوەڕدارانە.

زۆرن ئەوانەی كە بەفیز وخۆبەزلزانن ، بەلاّم ئەو كارەیان زیاتر سوك وڕیسوایان دەكات ، وكەسانی واش هەیە كە لە ڕیزی بەڕێز وپایە بەرزەكانن وبەفیز وخراپەكاریش نین ، ئەوەش لەبەر ئەوەیە كە ویستی خۆسەپاندن بەسەر خەڵكدا ستەمە ، لەبەر ئەوەی مرۆڤ هەموو یەكسانن ، خەڵكی ڕقیان لە كەسێكە خۆی لەوان بەگەورەتر بزانێت ودژایەتی دەكەن ، وكەسی دادپەروەر نایەوێت كەس ژێر دەستە بكات بە پێچەوانەی كەسە ستەمكارەكان ، لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا پێویستە كەسانێك كاربەدەستبن وئەوانی تر كاربەسەردا دراو ، وەك چۆن لاشە بەبێ سەر ژیانی نابێت ، خودا دەفەرمویّت :

﴿وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ ٱلْأَرْضِ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ ﴿١٦٥﴾﴾(الأَنعَام) .

واته : خودا ئێوەی کردووە بە جێنشین لەسەر زەوی وپلەوپایەی هەندێکتانی بەرزتر کردووەتەوە لەوانی تر ، بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە لەو پلەوپایەی کە پێیداون .

ودەفەرموێت : ﴿نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ لِّيَتَّخِذَ بَعْضُهُم بَعْضًا سُخْرِيًّا ﴿٣٢﴾﴾(الزُّخْرُف) .

واته : ئێمە بژێویمان دابەشکردووە لە ژیانی دونیا ، هەندێکمان بەرزکردووەتەوە بەسەر هەندێکی تردا بۆ ئەوەی ئیشتان بەیەك بڕوات وژیان نەوەستێت .

وشەریعەت هاتووە بۆ ئەوەی کاربەدەستی ومالّ وسامان لە ڕێگای خودادا خەرج بکرێت ، ئەگەر مەبەست لە کورسی وپلە وپایە ومالّ وسامان پەرستش ونزیك بوونەوە بێت لە خودا وسەپاندنی ئاینەکەی ئەوکاتە ئەو دوو شتە دەبنە مایەی چاك بوونی دونیا وبەدەست هاتنی دوا ڕۆژیش ، ئەگەر ئاین لە دەولّەت وکاربەدەستان وژیانی خەلّك جودا کرایەوە ، ژیانی خەلّك تێك دەچێت ، ئەوانەی گوێڕایەلّی خودا دەکەن بەنییەتی چاك وکردەوەی باش لە تاوانباران جیادەکرێنەوە ، ولە صەحیحی موسلمدا لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ ڕیوایەت کراوە فەرموویەتی : (( إن الله لا ينظر إلى صوركم ولا إلى أموالكم وإنما ينظر إلى قلوبكم وأعمالكم ))[٢٠٤].

واته : خودا سەیری ڕەوالّەت ومالّ وسامانتان ناکات بەلّکو سەیری دلّ وکردەوەکانتان دەکات .

---

٢٠٤. رواه مسلم (٢٥٦٤).

وكاتێك ویستی كۆكردنەوەی سەرمایە وناوبانگ وپلەوپایە بەسەر زۆرێك لە كاربەدەستانی موسڵماناندا زاڵ بوو ئەوە بووە هۆی دووركەوتنەوە لە ناوەڕۆكی باوەڕ وئاین لە كاربەدەستیەكەیان ، زۆر خەڵك وا دەبینن كە كاربەدەستی پێچەوانەی ئاین وباوەڕە ، وهەیانە پشت لەوە دەكات كە ئاینی پێ تەواو دەبێت ، وهەیانە پشت لە ئاین دەكات ، زۆرێك لە خەڵك بۆچوونیان وایە كە ئاین پێچەوانەی كاربەدەستییە ، بەوەش ئاین بووەتە جێی بەزەیی وبە سوك سەیركردن ، لە بری ئەوەی جێگەی بەهێزی وسەربەرزی بێت ، ولەبەر ئەوەی ئەهلی هەردوو ئاینەكەی پێشوو بێ توانایی لە هەڵسوكەوتیان هەبوو بەرامبەر پیادەكردنی پەیامەكانی ئاینەكانیان ، وایان گومان برد كە پیادەكردنی تووشی بەڵا ونەهامەتیان دەكات ، بەوەش لە ناوچوون ودوژمنان قۆستیانەوە ولاێ ئەوەیان لێدا كە بەرژەوەندی ژیان لە پیادەكردنی ئەو ئاینانەدا نییە .

ئەو دوو ڕێگایە خراپە "ڕێگای ئەوانەی خۆیان داوەتە پاڵ ئاین ، وبەتەواویش خۆی نەداوەتە دەست پەیام وداواكاریەكانی ، وئەوانەی خۆیان داوەتە پاڵ كاربەدەستان وماڵ وپارە ومەبەستیان پێی پیادەكردنی ئاین نییە" ئەو دوو ڕێگایە یەكەمیان ڕێگای گاورە گومڕاكان ودووەمیشیان ڕێگای جولەكە لە ڕەحمەت بەدەركراوەكانە ، وڕێگای ڕاست ڕێگای ئەو كەسانەیە كە خودا ناز ونیعمەتی بەسەردا ڕشتوون لە پێغەمبەران ﷺ وڕاستگۆیان وشەهیدان وچاكەكاران ، ئەوەش ڕێگای پێغەمبەرەكەمانە محمد ﷺ وڕێگای خەلیفەكانی وهاوەڵانی وئەوەی شوێنیان دەكەون وئەوانەی كە خودا پێیان دەفەرموێت : ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي تَحۡتَهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ١٠٠﴾(التَّوبَة) .

واته : کۆچکەرە پێشینەکان وپشتیوانەکان وئەوانەی شوێنیان کەوتوون خودا لێیان ڕازییە وئەوانیش لە خودا ڕازین وچەندان باخی لە بەهەشتدا بۆ ئامادەکردوون کە ئاو بەژێریاندا دەڕوات بە هەتا هەتایی تیایدا دەمێننەوە ئەوەش بردنەوەی گەورەیە .

پێویستە لەسەر موسڵمان تێبکۆشێت ئەگەر بەرپرسیارێتییەکی پێ سپێردرا بە باشترین شێوە لە پێناوی پیادەکردنی ئاین وبەرژەوەندی موسڵماناندا کاربکات ، بەگوێرەی توانا ودووربکەوێتەوە لەو شتانەی کە خودا قەدەغە ویاساغی کردوون ئەوەشی نەتوانێت هیچی لەسەر نییە ، کاردانە دەستی پیاوچاکان باشترە بۆ ئوممەتی ئیسلامی لە کەسانی تاوانبار وخراپەکار ، وهەرکەسێك نەیتوانی بە هۆی بەرپرسیارێتی وتێکۆشانەوە بەرگری لە ئاین بکات ، پێویستە لەسەری ئەوە بکات کە لە توانایدا هەیە ، وەك ئامۆژگاری کردن ونزا وپاڕانەوە وچاك ویستنیان ، چونکە ئاین بە قورئان وسوننەت سەردەکەوێت.

کەواتە : لەسەر هەموو کەسێك پێویستە بەگوێرەی توانای تێبکۆشێت بۆ سەرخستنی ئاینەکەی بە پشت بەستن بە خودا وبە گەرخستنی دونیا لە خزمەتی ئایندا وەك موعاذی کوڕی جبل رضي الله عنه دەڵێت : ئەی ئادەمیزاد تۆ ئەندازەیەك پێویستت بە دونیا هەیە ، بەڵام پێویستیت بە دواڕۆژ زیاترە ، ئەگەر کۆششت بۆ دواڕۆژ زیاتر بوو دونیاشت دەست دەکەوێت ، بەڵام بە پێچەوانەوە دواڕۆژت لە دەست دەچێت ودونیاشت هەردەم لە مەترسیدایە ، بەڵگەی ئەوەش ئەو فەرموودەیە کە پێغەمبەری خودا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت : ((من أصبح والآخرة أكبر همه جمع الله له شمله ، وجعل غناه في قلبه ، وأتته الدنيا وهي راغمة ومن أصبح والدنيا أكبر همه فرق الله عليه ضيعته ، وجعل فقره بين عينيه ، ولم يأته من الدنيا إلا ما كتب له))[٢٠٥].

---

٢٠٥. رواه الترمذي (٢٤٦٥) ، وصححه الألباني في (صحيح الجامع) (٦٥١٠) .

واتە : ئەوەی ڕۆژی کردەوە ودوارۆژ گەورەترین خەمی بوو خودا کار ئاسانی بۆ دەکات ، دەوڵەمەندی دەخاتە نێو دڵیەوە ، ودونیای بەملکەچی بۆ دێت ، وئەوەی ڕۆژ بکاتەوە گەورەترین خەمی کۆکردنەوەی دونیا بێت خودا شپرزەی دەکات وهەژاری لە نێوچاوانی دەنووسێت ، ولەوەش زیاتری دەست ناکەوێت لە دونیا کە بۆی دیاری کراوە.

وبنچینەی ئەوانە لەو فەرموودەی خودادایە : ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ۝٥٦ مَآ أُرِيدُ مِنْهُم مِّن رِّزْقٍ وَمَآ أُرِيدُ أَن يُطْعِمُونِ ۝٥٧ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلْقُوَّةِ ٱلْمَتِينُ ۝٥٨﴾(الذَّارِيَات) .

واتە : جن وئادەمیزادم دروست نەکردووە بۆ پەرستش نەبێت ، ڕۆزیم لێ ناوێن ونامەوێت نان بدەن ، خودا ڕۆزی دەرە وخاوەن هێز وتوانایە.

داواکارین لە خودای بالادەست کە ئێمە وهەموو برا موسڵمانەکانمان یارمەتی بدات بۆ ئەوەی کە پێی خۆشە لە گوفتار وکردار ، چونکە کەس هیچی بەدەست نییە خودای بەرز وبالا نەبێت ، وسوپاس وستایش بۆ خودای دروستکەری هەموو بوونەوەر ، ودرود وسلاوی بێپایان لەسەر محمد وئەهل وهاوەلانی تا ڕۆژی دوایی .

# پێڕست